# دایک

## لە جیهانبینیی شیعری (لەتیف هەڵمەت)دا



لێکۆڵینەوەیەکی
ڕەخنەیی دەروونییە

فازیل شەورۆ
د. هاوژین سلێوە

# دایك

# لە جیهانبینیی شـیعری

# (لەتیف هەڵمەت)دا

فازیل شـەوڕۆ　　　　　　　د. هاوژین سـلێوە

لێکۆڵینەوەیەکی ڕەخنەیی دەروونییە

٢٠١٩

**لە بەرکی نووسەرانی چاپکراوە.**

* ناوی کتێب: دایك لە جیهانبینیی شیعری (لەتیف هەڵمەت)دا.

* نووسەر: فازیل شەورۆ، هاوژین سڵیوە.

* بابەت: ڕخنەی ئەدەبی.

* سکێچی بەرگ: قەرەنی جەمیل.

*دیزاینی بەرگ: ئەنجام ئەنوەر

* چاپخانەی:

* ساڵ: ٢٠١٩

* لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان، ژمارەی سپاردنی ( ) ی ساڵی (٢٠١٩)ی پێدراوە.

**بە ڕۆحـی پـاکی**

**دایکـي شـەهیدان و**

**خاتوو (سـەعدیە)، دایکی لەتیف هەڵمەت**

**پێشـکەشـە.**

## بیرۆکەی ئەم کتێبە

دوای چاپکردنی کتێبی (جگەرە لە جیهانبینیی شیعری شێرکۆ بێکەس)دا، زۆر لەو نووسەر و خوێنەرانەی کتێبەکەیان خوێندبووەوە دەستخۆشیان لێدەکردین و بە خورتی داوایان لێدەکردین کە بەردەوام بین لەسەر ئەو ڕێچکەیە و هەوڵبدەین ئەو ناونیشانانە هەڵبژێرین کە کتێبخانەی کوردی عەوجەیەتی. ئەوان ڕەچاوی ئاوێتەکردنی دوو ئەزموونی ئەدەبی بەپشتبەستن بە بنەما ئەکادیمییەکانی نووسین و لێکۆڵینەوەیان دەکرد و سوود وەرگرتنی ڕاستەوخۆیانە لەسەرچاوەی دەوڵەمەندی (پێنج) زمانیان، بە کلیلی کردنەوەی زۆر گەنجینەی شاراوەی ئەدەبی و مەعریفی دەزانی. ئەوەبوو هەر دوای مانگێك (هاوژین سلێوە) ناونیشانی ئەم کتێبەی هەڵبژارد و هەردووکمان بەرنامەی کار و پڕۆگرامی خۆمان بەجیا نووسی و دواتر دوای قرتاندن و زیادکردن و گۆڕینی ناونیشانی بەند و تەوەرەکان، نەخشەی نووسینی کتێبەکمان دیاری کرد و ناوی خوامان لێهێنا.

کوردی دەڵێ:" کەس نازانێ خێر و شەڕ لەچیدایە." سەفەری (فازیل شەوڕۆ) بۆ کۆماری ئایرلەندای باکوور، دەرگای کتێبخانەکانی ئینگلیزی بە ڕوودا ئاواڵەکرد و سەفەرەکەی (هاوژین سلێوە)ش بۆ ئێران لە نزیکەوە بە کتێبخانە گەورەکانی ئێرانی ئاشناکرد. ئەمانە نوێترین کتێبی سەردەمییان، تایبەت بە بابەتەکە، خستە بەردەست و بۆ ماوەی چەند مانگێك هەر خەریکی دۆزینەوە و کۆکردنەوەی سەرچاوەکان بووین، (هاوژین سلێوە)، هەموو چاپکراوەکانی (لەتیف هەڵمەت)ی خڕکردەوە و بە پەیوەندیی ڕاستەوخۆ لەگەڵ بەڕێزیاندا ـ بەسوپاسەوە، (CD) و ئەو کتێبانەشی وەرگرت کە لەبەر دەستماندا نەبوون. ئەمانە ئاسانکاریی باشییان بۆ کردین و لە شوباتی(٢٠١٧) دەستمان کرد بە نووسین و هەمیشە لەگەڵ یەکتری لەپەیوەندی دابووین و ئاگاداری نووسینی یەکتر بووین و لە مانگی ئایاری (٢٠١٨) لە نووسینی ئەو کتێبە بووینەوە، هەڵبەتە کۆکردنەوەی سەرچاوە و نووسینەکانمان پچڕپچڕبوو، چونکە ئەو هەموو سەرچاوەمان بەیەکجاری لەبەردەست نەبوو، بۆیە گەڕان و پشکنینی زۆری ویست تا زانیاری و سەرچاوەمان دەست کەوت، کارەکەمان بەشێنەیی و لەسەرەخۆ ئەنجامدا. خەمی نووسینی ئەو

کتێبە خەمی هەردووکمان بووەو ڕۆژو شەو لەگەڵمان بووە و بەردەوام خەریکی نووسین و گـۆڕین و مشت وماڵکردن و خوێندنەوە و هەڵەچنی ڕێنووسی و لێکەم کردنەوە و بۆزیادکردنی تەوەرە و باسەکان بووین.

لەڕاستییدا، ئەو ئەزموونە، گەرچی ئەزموونی دووەمان بوو بەیەکـەوە کـاری تێدابکـەین، دەرسی باشی فێرکردین کە سوودی بۆ ئەم تەزرە کارە زۆرە، بۆنموونە فێربووین کە دەبێ چەند بە حورمەتەوە ڕێز لەبیر و ڕای یەکتری بگرین. فێربووین شتێك نییە نـاوی (هەڵـە)، هـەردووکمان وەك ئەوەی دووکەس بین بە یەك دەست و بەیەك قەڵەم بنووسین دەستکاری نووسـینی یـەکترمان دەکرد، ڕووی نەداوە لە تۆمارکردنی هەموو دێڕەکانی ئەم کتێبە یەکێکمان بۆچوون و ڕای جوان و پەسندی ئەوی تری ڕەفزکردبێتەوە. باوەڕبفەرموون، جار بووە بۆ ڕێنووسـی یـەك تاکـە وشـە (شەورۆ) پەیوەندی بە (هاوژین)ەوە کردووە و (هاوژین)یش لە کوردسـتانەوە داوای سەرچـاوەی بابەتێکی دیاری کراوی کردووە، کە لە لای خۆمان بەردەست نەبووە. لـە هەمووشـیان بۆئێمـە گـرنگتر ئـەوەبوو، ڕاسـتەوخۆ، خۆمـان سەرچـاوەکانی: ئینگلیـزی و عـەرەبی و فارسـی و سریانییەکانمان هەڵێنجاو کردوومانن بە کوردی ـ جار بووە، تەرجومەکەمان نیشانی نووسـەر و ئەدیبانی دیکەش داوە تا باشترین کۆپیمان دەستکەوێ. جگەلەمانەش هەردووکمان زۆر زانیاری لەیەکتر فێربووین و دەمێکە گوتویانە:" دوو ئەقڵ لە ئەقلێك باشترە."

نایشارینەوە، ئەوەی نەوتی چرای ئەم نووسینەی ئێمەی خۆشتر و بڵێسەدارتر دەکرد، ئەوە بوو، تا پتر لەسەرچاوەکان ورد دەبووینەوە، ناونیشانی وەکو کتێبەکەی خۆمـان نەدەهاتـە بـەر چـاو، تەنانـەت هـاوژین سـڵیوە لـە کتێبفرۆشـە فارسەکانیشـی دەپرسـی و دەیـانگوت لـە کتێبخانەکانیان ئەو جۆرە ناونیشانەیان نەدیوە، لە ئەدەبی عەرەبیشدا، تەنها لە سەر (دایك) بە گشتی نووسراوە نەمان دی لێکۆلەرێك وەك ئەم کتێبە لێکۆڵینەوەی لەسەر کردبێ. ئەمانـە بـۆ ئەدەبی ئینگلیزی و سریانیش دروستن.

لەپاڵ ئەم خاڵانەی سەرەوە، هاندەرێکی دیکەش ناڕاسـتەوخۆ دەسـتی دەگـرتین، ئـەوەیش ئەوەبوو حەزمان دەکرد، کتێبەکە وەك نەخشە و پڕۆگرامان بـۆ دانـاوە لـە سـەرووی (٩٠٪)ی

بتوانین جێبەجێی بکەین، بۆ ئەوەی، ببێتە سەرچاوەیەکی باش و نووسەرانی دیکە هان بدا بۆ دۆزینەوەی ئەم جۆرە ناونیشانە، ئەمەش لەبەر دوو هۆکار: لەلایەك کتێبخانەی کوردی پێدەوڵەمەند دەبێ و خزمەتێکی بەرچاوی زمان و فەرهەنگیشە، لەلایەکی دیکە سەرچاوەیەکە بۆ خودی شاعیرەکانی خاوەن بابەت، بۆ نموونە، لەتیف هەڵمەت، ئێستا باشتر تێدەگا، کە چەندە لە داهێنانەکانی بەرەو پێش چووە، یان شکستی هێناوە، ئەوە جگە لەوەی هەموو ئەدیب و شاعیران دڵخۆش دەکات، کە قەڵەمی چاوکراوە هەیە موتابەعەیان دەکات و هەوڵدەدات هاوچەرخانە بە پشتبەستن بە زانیاریی و مەعریفە سەردەمییەکان لێیانبکۆڵنەوە و حەقی خۆیان بدەنێ.

چاوەڕوانین قەڵەمە بەتواناکان، کەموکوڕی و ناتەواوی ئەم کتێبە پڕبکەنەوە. لە هەڵەکانیشمان چاوپۆشی نەکەن، تا کار نەکەی هەڵەش ناکەی. هیواداریین توانیبێتمان، بەشێك لە خەونەکەمان، بۆ ئێوە و بۆ خۆشمان، بهێنینە دی.

فازیل شەورۆ — هاوژین سڵیوە

دوبلن — کۆیە

٢٥ / ٥ / ٢٠١٨

# پێشەکی

دایك و جیهانبینی و شیعر، سێکوچکەی گەرمی ئەم لێکۆڵینەوە ئەدەبییەیە، کە هەردوو نووسەری ئەم کتێبە لە گۆشەنیگای ئەدەبی ئاوێتەکراو بە ڕەخنەی دەروونی هاوچەرخی ئاوجۆشکراو بە میتۆد و تیۆری سەردەمییانە پێشکەش بە خوێنەری کوردی دەکەن. هەوڵەکان پتر لەوەدا چڕکراونەتەوە، کە لێکۆڵینەوەکە هەم وەك دەروازەیەکی تازەبابەتی ڕەخنەی کوردی دەربارەی شیعر و جیهانی شاعیر تەماشا بکرێت و هەم وەك پەنجەرەیەکی تازەکراوە بەسەر جیهانی دایك و دایکایەتی لە کەلتوور و فۆلکلۆر و ئەدەبی جیهانی و کوردی هەڵبسەنگێندرێت. گڕ و بڵێسەی چراوکی ئەم لێکۆڵینەوە هەموو شەوق و ڕووناکی خۆی لە شیعر و دایك و دایکایەتییەوە وەرگرتوە و لەتیف هەڵمەتیش بە (شیعرەکانی و دایکی و کەسێتی خۆی) بوون بە ئەستێرەی درەوشاوەی تۆژینەوەکە.

**مەغزای هەڵبژاردنی بابەتەکە:**

تیرێك و دوونیشانە، نیشانەی یەکەم تیشکخستنەسەر کایەیەکی زۆر بایەخدار و مەزن و پیرۆز لە شیعرەکانی لەتیف هەڵمەتدا، بە گەشکردنەوەی پشکۆی ئاگردانە دێرینەکەی ماڵی دایکی لەتیف هەڵمەت و نرخاندن و ڕەخنەگرتن و شیکاری جیهانبینی شاعیر لە بازنەی دایك و دایکایەتیدا.

هەرچی نیشانەی دووەمە: ئاشناکردنی خوێنەرە بە چەمکی دایك لە گۆشەنیگای جیهانبینییە کەلتوورییی و ئەدەبی نەتەوە جیاوازەکانی غەیری کورد بەگشتی. بەو مەرازەی هەم کەسێتییە مەزنەکەی دایك هەڵسەنگێنین و پایە و مەقامی دەستنیشان بکەین، هەم بۆ چێژبەخشین بە خوێنەر، لە ڕێی شیعری جیهانی دەربارەی دایك و دەوڵەمەندکردنی ئەزموونە کەڵەکەبووەکان لەم بوارەدا.

کارکردن لەسەر (توخمێکی An Element) شیعری دەقنووس، کە پێشتر قسە و باسی لەسەر نەکراوە، کە (دایك)ە، مەرام و مەبەستی سەرەکی نووسەرەکانی ئەم کتێبەیە.

## سنووری لێکۆڵینەوەکە:

**یەك:** کۆبەرهەمی شیعریی لەتیف هەڵمەت، کە (٢٤٠٠) لاپەڕەیە. شاعیر زیاتر لە (١٤٢) شیعری لەبارەی دایك و جیهان و فەرهەنگ و خێزانی دایك بەکارهێناوە.
**دوو:** شیکردنەوە و شیتەڵکاری بۆ زاراوە و چەمکی دایك و جیهانبینی دایك بە گشتی.
**سێ:** ڕوماڵکردن و شەنوکەوکردنی کەلتوور و فۆلکلۆر و ئەدەبی جیهانی و کوردی، لەچوارچێوەی دایك و جیهانبیینەکەی. لێرەدا بواری شیعر پشکی شێری بەرکەوتووە.

## ئامانجی لێکۆڵینەوەکە:

دەستنیشانکردنی ڕەهەندەکانی داهێنانی شاعیر لەم بوارەدا و هەڵسەنگاندنی کەسێتی لەتیف هەڵمەت، وەك مرۆڤ و شاعیر لە باوەشی جیهانبینی دایکەوە.

## گیروگرفتی لێکۆڵینەوەکە:

سنوور و بوارەکانی جیهانی دایك هێندە فراوان و بەربڵاوە، کە زەحمەتە نووسەرێك بتوانێ لە یەك کتێبدا کۆیانبکاتەوە سەر یەکتری، ئەمە بو ئێمە زۆر ئەستەم بوو، کە چۆن بتوانین خوێنەر بە زۆربەی زانیارییەکانی ئەو جیهانە ئاشنا بکەین بەبێ ئەوەی تام و چێژی ناوەرۆکی بابەتەکەمان لە دەست بدەین. بە واتایەکی دیکە ژمارەی ئەو سەرچاوانەی سەریان بەسەرداگێراوە گەلێ زۆرترە لەوەی کە لێرەدا تۆمارکراوە، بۆ یەك (کۆتێیشن) چوار پێنج کتێبمان خوێندبێتەوە. جگە لەمەش وەڵاشی ناونیشانەکەمان لە کتێبخانەکاندا بەرچاو نەکەوت، تەنها لە لێکۆڵینەوەیەکی سەرپێی نەبێ کە دەربارەی(دایك لە شیعری عەرەبی) نووسراوە. ئەمەش ئێمەی فێرە ئەزموونێکی نوێتر کرد.
خۆشبەختانە لە سایەی ئەو (CD) یەی کە کۆبەرهەمی شیعری دیوانی لەتیف هەڵمەتی تێدابوو ـ کە بە سوپاسەوە شاعیر پێشکێشی کردین ـ کۆسپێکی گەورەمان لەبەردەم لاچوو، کە لە ڕێی (Find) لە کۆمپیوتەرەوە توانیمان کۆی ئەو شیعرانەی تایبەتن بە دایك دەستەبژێر

بکـەین. بـەڵام لـە کۆمەڵـە شـیعری (شـیعری دژە شـیعر یـا یارییـەکی کـۆن و نـوێ )، کـە (١٧٠)لاپەڕەیە وە کۆمەڵە شیعری (دیـوانی منـداڵان) کـە (٥٤٦) لاپەڕەیـە،دیوانی (ئایەتـە ونبووەکانی سەدەی بیست و یەك یا سوورەتی گەڕانەوە بۆ منداڵی)کە (٢٥٧)لاپەڕەیـە. ناچـار بووین پەڕ بەپەڕیان بخوێنینەوە و دەقە تایبەتمەندەکانی دایك بنووسینەوە.

بۆ وەدەستهێنانی سەرچـاوەش، کـە بەداخـەوە کتێبخانـەی کـوردی بـە بابـەتی دایـك و دایکایەتی لە ئەدەب و شیعردا هەژارە، ئەوەندەی بارودۆخەکە ڕێـی دابـێ، بـە پشتبەسـتن بـە زمانی: کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی و سریانی و فارسی، هەوڵدراوە سوود لە زۆر سەرچـاوەی کوردی و جیهانی وەربگیرێت.

**میتـۆدی لێـکۆڵینەوەکە:**

چونکە بابەتی ئەم لێکۆڵینەوە فرە ڕشتە و بوارە، وەك بواری کۆمەڵناسی و دەروونناسی و فەلسەفی و کەلتووری و ئەدەبی، ئەوە میتۆد و ڕێبازەکانی نووسینی کتێبەکە لـە بازنـەی تاقـە میتۆد دەچێتە دەرەوە و ئەم میتۆدانە بە پێی پێویست پەیڕەوکراون و بـازدان بەسـەریاندا، بـە ئاسانی هەستی پێدەکرێت:

لە بەشی یەکەم و دووەمدا، میتۆدی وەسفی و بـەراوردکاری بـە ئاشـکرا پـەیڕەوکراوە. لـە(سێ)بەشـەکانی دیکەشـدا، میتـۆدی شـیکاری و دەروونشـیکاری، ڕێبـازی سـەرەکی نووسینەکانن. لە چەند بڕگەیەکیشدا، بە پێی پێویست، میتۆدی یـان لێکۆڵینـەوەی ڕۆشـنبیری (Cultural Method or Cultural Study)[1] هـەروەها شـێوازی دەقئاوێزانی(Intertextuality )[2] لێرەو لەوێ بەسەرکراوەنەتەوە.

[1] ) میتۆدی یان لێکۆڵینەوەی ڕۆشنبیری (Cultural Method or Cultural Study) کە میتۆدێکی سەردەمییانەیە، خۆی لە چوارچێوەی یەك بابەتی نووسین قەتیس ناکات، بەڵکو پەل دەهاوێت بۆ بواری مێژووگەرایی نوێ (New Historicism) و مەتیریالزمی کەلتووری(Materialis Cultural) ئەنتۆپۆلۆژیاو و

**بینای لێکۆڵینەوەکە:**

ئەم توێژینەوەیە لە پێشەکی و (پێنج) بەش و ئانجام و سەرچاوەکان و پووختەی باس بە زمانی فارسی و ئینگلیزی پێکهاتووە:

بەشی یەکەم: دایك و دایکایەتی.

بەشی دووەم: دایك لە ئەدەب و کەلتوور و هونەردا.

بەشی سێیەم: دایك لە جیهانبینی شیعری لەتیف هەڵمەتدا.

بەشی چوارەم: شیتەڵکاری دەقە شیعرەکانی دایك لە کۆبەرهەمی لەتیف هەڵمەتدا

بەشی پێنجەم: دایك لە (دیوانی منداڵان)ی لەتیف هەڵمەتدا

هیوادارین، ئەم کتێبە، دەلاقەیەکی نوێی شیعرەکانی لەتیف هەڵمەتی بۆ چێژی ئێوە، ئاوەڵاکردبێت و قەرزێکی بچووکی (دایك)ی دابێتەوە و کونجێکی لە کتێبخانەی کوردی پڕ کردبێتەوە.

---

ڕەخنە و لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، تا دەگاتە سنووری کەلتووری جیهانی (گلۆباڵییەوە)، چونکە ئەم میتۆدە دەستی گەیشتۆتە زۆربەی بوارەکانی ئەدەب و هونەر، هێندەی نەماوە جێگە بە میتۆدی تەقلیدییەکان لەقبکات.http://www.iep.utm.edu/literary/#H9

[2] ) شێوازی دەقئاوێزان (Intertextuality) شێوازی ئەو نووسینەیە، کە ئیستراتیژییەکەی لەسەر خواستنەوەی ئەو دەقانە بونیاتناوە، کە لە بەرهەمی دیکەی هەمان نووسەر یانی نووسەرانی دیکەدا وەرگیراون، وەك بەراوردی ئەدەب، ئەمەیش دەکرێ لە شیعر و ڕومان و ئەدەب و ڕەخنە پەیڕەو بکرێت. ئەمەش چ بە خواستنەوە، چ بە ئاماژەپێکردن بێ بەو دەقانەی کە لە نووسینەکەدا بەکارهاتوون.

http://www.basicknowledge101.com/pdf/literacy/Intertextuality.pdf

# بەشی یەکەم

# (دایك و دایکایەتی)

***"نەتەوەکان بە دایکەوە نەتەوەن."***

*(خەلیل مەتران)*

# تەوەرەی یەکەم

# دایك لە مێژووی مرۆڤایەتیدا

## ١- دایك، وشـە و زاراوە و چەمك

یەکەم کردەی کورپەی لەدایك بوو ئەو دەنگەیە کە لەگەڵ یەکەم گریانیدا دەبیسترێت، سەرەتا ئەو دەنگە تەنیا گوزارشتکردنە لە زیندوویی کورپەکە و لە قەدیمەوە زانراوە، کە ئەو گریانە دڵی دایك خۆش دەکات، نەك هەر لەبەر هەستکردنی بە خەلق بوونی بونەوەرێك لە زاندانی ئەوەوە، بەڵکو لەبەر ئـەوەی زانستییانە سەلمێندراوە، کە نەگریانی کۆرپە پەسندنییە. خاتوو عەتیە حەمە سەعید، دکتۆری پسپۆڕی مندالّبوون ـ یەکەم گریانی کۆرپە بەم شێوەیە ڕاڤەدەکات: "هۆکارەکانی یەکـەم گریـانی کۆرپـە زۆرن، دیارترینیان ئەو ژینگە نوێیەیە کە منداڵ پێشتر پێی ئاشنا نەبووە، ئەو لە جیهانێکی تاریك و گـەرم و تەڕ و هێمن دێتە نێو جیهانێکی ڕۆناك و درەوشاوە و سارد و وشکی پڕ ژاوەژاو. ئەوە جگە لـەوەی لـە ڕووی زانسیتییەوە ئەو گریانە سینگ و گەروو و زار و لوتی ئەو منداڵە لە خوێن و تەڕایی پاکدەکاتەوە و بە ژینگەیەکی نوێی ئاشنای دەکات." ٣ سیەکانی وەك دوو میزڵدان دەکرێنـەوە و کـرداری هەناسـە وەرگرتن و هەناسەدانەوە دروست دەبێت، ئەگەر منداڵەکە نەگریـەت ڕەنگـە ببێتـە هـۆی مردنـی. بـە دووبارە بوونەوی ئەو گریانە و ئاشنا بـوونی گـوێی دایـك بـە دەنگـی گریانـەکانی کۆرپەکـەی. جـۆرە زمانێکی تایبەتی لەنێوان ئەو دووانە دروست دەبێت و هەر دایکەی بە شێوەیەك لە شێوەکان لە زمانی کورپەکەی تێدەکات، واتا دەزانێ کە برسیەتی یان ئازار و ژانێکی هەیە، یا خۆی تەڕکردوە، یان هەست بەتەنیایی دەکات... تاد. دوای ماوەیەك، یەکەم بڕگەی زمان لە لێوی ئەو منداڵە دەبیسترێت و دەبێتە

---

[٣]) گۆڤاری کلتووری کورد ژمارە ٤ ل ٥٥

یەکەم بڕکەی فەرهەنگی زمـانی منداڵەکە.ئـەوەش قۆنـاغێکی هەراشـتری تەمـەنی منداڵـە، چـونکە لەقۆناغی یەکەم تەنها دەگرییێ، لەقۆناغی دووەم لغە لـغ دەکـات و دوای ئـەوە پیـت دەردەبـڕێ، دوای ئەویش وشە، ئینجا ڕشتەی تێکەڵ، دواتر ڕستەی تەواو.

لە زۆربەی هەرە زۆری کۆی زمانەکانی جیهان(کۆن و نوێ)، یەکـەم بڕگـەی بیسـتراو لـە دەنگـی کۆرپە یان (مـە) یە یان (دا) یە. لەبەرچی؟ چونکە ئەو منداڵە، هەم لە ڕووی بایەلۆژییەوە و هـەم لـە ڕووی بەهرە و هونەری ئاخاوتنەوە، توانای ئەوەی نییە دەنگی ئەو بڕگانە دروست بکات کە پێویسـتیان بە هەوایەکی زۆر و هەڵگەڕانەوەی زمان و یاریکردن بە دەم ولێو هەیە. یان ئەو دەنگانـەی لەقوڕگـەوە دروست دەبن، یان ئەوانەی سازگەیان لوت و قوڕگە، بۆ نموونـە هـەرگیز نـەبووە لـە هـیچ نەتەوەیـەك، کۆرپەڵە بەم جۆرە بڕگانەی خوارەوە هاتبێتە گۆ: (صە/ حە/ قە/ عە/ ڕە/ ژە/ کە/ شە)، چونکە بەشێك لەو دەنگانە تەنها بەشەپۆلی ئەوهەوایە دروست نابن کە لەزارەوە دێتە دەرەوە، هەنـدێك لـەو دەنگانـە لەڕێی ددانەوە دروست دەبن کە دیارە منداڵ هێشتا ددانی نەهاتووە، چونکە دروست بوونی ئەودەنگانە وەك ئەو هەوایە وایە کە دەخرێتە کونی شمشاڵێکەوە، ئینجا قامك بزواندنیش ئەو گەمە زمانییەیە کـە بۆدروست کردن و گۆکردنی دەنگەکان ڕۆڵ دەگێڕێت، لەو تەمەنەش دا نە زمان و نە لێـو و نـە دەنگـە ژێکانیش وا بەتەواوەتی نەڕسکاون و منـداڵیش وەك کاغـەزێکی سـپی هێشـتا فەرهـەنگی وشـەی لا دروست نەبووە، بەڵکو گریان و لغە لغ و ڕخە ڕخ و مشە مش و پشمین و کۆخە و مڕچە مڕچ... ئەوانـە لەزاریەوە دەردەچن، هەموو ئەوانەش لە چۆنیەتی دەرپەڕینی ئەو هەوایە و چۆنیەتی لێکدان و بزواندنی زمان و لێوەکانەوە دروست دەبن. دوای کەمێك هەراش بونیشی وردە وردە لـەو فەرهەنگـە خۆڕسـکەی خۆی دەردەچێت و فەرهەنگەکەی دەوڵەمەند تر دەبێت، دەربڕینی دەنگەکانی(دا، ما، با...) لادروسـت دەبێ. جا ئەگەر گوزەرەێك بەناو فەرهەنگەکانی زمانی نەتەوەکانی دونیادا بکەین و بەدوای سەرچاوەی وشەی (دایك) دا بگەڕێین، دوو دیاردەی سەرنجڕاکێش دەبینین:
**یەك:** لە(٧٥٪) ی وشەی دایك لە کـۆی زمانـەکانی دنیـا یـەك یـان دووبڕگـەن و لـە دەنگـی (مــە) داتاشراوان، هەر بۆنموونە، ئەم وشانە بۆ دایك بەکاردێن لە چەند زمانێکدا ـ ئێمـە هـەر بـە ڕینووسـی خۆیان تۆماریان دەکەین:

ma/ mama/ maa/ amma/ mata/ maman/ mamai/ mae/ mn/ ama/ mam/ /eomma/ oma/ ammi/ ummi/ mom/ mommy/ mummy/ mammy/ em

بۆ نموونە لە زمانی ئینگلیزیدا وشەی (mother) لە ئینگلیزی ناوەندی خواستراوەتەوە: (moder)، ئەویش لە ئینگلیزی کۆن وەرگیراوە: (mōdor) کە بە ڕەچەڵەك ئەلمانییە (mōdēr) ئەوەش دەچێتەوە سەر زمانی باپیرەگەورەیبان، کە زمانی هیندۆئەوروپییە: (mehter)، هەرچی لاتینییە وشەی (máte ) ی بۆ دایك بەکارهێناوە.[٤]

**دوو:** بڕگەی (دا) لە دروستکردنی وشەی (دایك) لە لایەن چەندین نەتەوە خواستراوەتەوە، کە سەربە کۆمەڵەی زمانە هیندۆ ئەوروپییە کۆنەکانن. بۆ نموونە لە زمانی فارسی ناوەندا وشەی (dáyak) بەکارهاتووە، کتومت وەك ئەوەی لە زمانی ئەرمەنی کۆندا هەبووە و دواتر ئێرانییەکانیش هەر هەمان وشەیان خواستۆتەوە بووە بە (دایە) کە بە ڕەچەڵەك لە زمانی هیندۆئەوروپییە قەدیمەکان وەرگیراوە، کە ئەسڵی وشەکە (dheh) یە یان (dhyh) یە.لە زمانی فارسی دا وشەی مادەر (مادر) بۆدایك بەکار دێ. کە دەچێتەوە شێوەی هیندۆئەوروپی و زمانی ئینگلیزی کە زاراوەوی (mother) لە زاراوە فارسیەکەشدا دەنگی (م ـ د) هاتووە.

زمانی کوردی لقێکە لە درەختی زمانی هێندۆئەوروپی، ئەوە وشەی (دایك) بۆتە وشەیەکی ڕەسەنی فەرهەنگی کوردی. لە فەرهەنگی هەمبانە بورینەدا ئەو قامتە وشانە لە ڕیزبەندی (دایك) دا تۆمارکراون: (دای: دایك، داڵك/ دایان: تایەن، لەلەی ژن/ دایانی: تایانی/ دایك: داڵك، نۆدا، دێ، جیا، داك/ دایکە: وشەی دواندنی داڵك/ دایکەلێ: وشەی دواندنی دایك بە خۆشەویستی/ دایکەوا: ژنی بابەدەم/ دایە: دایك، تایەن/ دایەن: تایەن، ئەوژنەی شیر ئەدا بە منداڵی خەڵك/ دایەن: دایەن/ داك: دایك، دێ، دیا/ داکۆ: دایکە/ داکانە: دایکی باڵندە).[٥] وشەی (هۆدە ـ ۆدە)ش بۆدایك بەکادێ،

---

[٤] ( Jakobson, R.,Why 'mama' and 'papa'?, Selected Writings, Vol. I: Phonological Studies,١٩٦٢, The Hague: Mouton, pp. ٥٣٨- ٥٤٥.

[٥]) هەژار، فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە ل. ٣١٨، ٣١١، ٣١٢

بەتایبەتی بۆکاتی بانگکردنی لەلایەن منداڵەکانی، کە خۆی دیارە لە (هۆدایە)وە وەرگیراوە. لە فەرهەنگی (ڕێژگە) ی ئەمین گەردیگلانیدا، فەرهەنگێکە تەواوکەری فەرهەنگی هەنبانە بۆرینەیە، بەقەولی خۆی گوتەنی ئەو وشانەی لەو فەرهەنگە نووسراونەتەوە، کە لە هەنبانە بۆرینە نەهاتوون، نزیك لە وشەی دایك و ئەو وشانەی لەخێزانی دایکن ئەوا وشەی (دایك برا)، کە مانای: برایەك کە دایکیان یەکەو باوکیان جیایە.[٦] دایکە گەورە: نەنك- دایکی دایك و دایکی باب. دایانگە شوێنی پەروەردەکردنی منداڵ. لە (فەرهەنگی مەهاباد) ی گیوی موکریانی لەپاڵ وشەی دایك وشەی (دادا)ش بەکار هاتووە[٧]، هەرچەندە لەنێو کوردەواری(دادە) بۆخوشکی گەورە بەکار دێ، لەزمانی فارسیش وشەی (داداش) لەبڕی وشەی (برا)و برا گەورە بەکادێ. هەر لەهەمان فەرهەنگدا وشەی نزیك لە خێزانی دایك لە جیاتی وشەی (چاڵجاڵۆکە) بەرانبەر بە(عنکبوت)ی عەرەبی وشەی: داپیرۆچك، داپیرۆشك- داپیرۆکە، بەکارهاتووە، لە هەندێ شوێنی تر وەك لەناوچەی خۆشناوەتی وشەی (داپیرۆچکە)ش بەکاردێ. پاشگرەکانی (ۆچك، ۆشك، ۆکە، ۆچکە) بۆ بچوککردنەوەیە، وەك چۆن (پیرەژن ـ پیرۆژنۆکە) پشتی کۆماوەیەو بچوك دەبێتەوە، بەو مانایەش چاڵچاڵۆکە شێوەیەکی پیرەژنی پێدراوە، کەشێوەی دەست و جەستەی بۆخوارەوەیە. لە (فەرهەنگی نۆبەرە)ی گیو موکریانی، کە فەرهەنگێکی کوردی و عەرەبییە لەپاڵ وشەی (أمرأە) ئەم وشانە هاتوون: ژن، ئافرەت، پت، ژەنك، پتۆ، پتکۆ، پتکۆ ژنێ، کەنی).[٨] لە (فەرهەنگی شیرینی نوێ) لەبەرانبەر(أُم) ی عەرەبی، ناوی دایك ئەم وشانەهاتوون: ئامە، دالك، دێ [٩]

لە زمانی عەرەبیدا (أُم، ماما) بەکار دەبرێت. لەفەرهەنگی شارا، کە فەرهەنگێکی عەرەبی کوردییە، وشەی (أمت) بەواتای بوویە دایك، ژن کە منداڵی دەبێت. وشەی (أُمهات) بەواتای دایکان

---

[٦]) ئەمین گەردیگلانی، فەرهەنگی رێژگە، کوردی ـ کوردی ـ فارسی، چاپخانەی خانی، دهۆك، ٢٠٠٩، ل ١٢٢

[٧]) گیوی موکریانی، فەرهەنگی مهاباد ـ فەرهەنگێکی قوتابخانەیی کوردی ئارەوییە، چ٢، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٢، ل ٢١١

[٨]) گیو موکریانی، فەرهەنگی نۆبەرە ـ عارەبی ـ کوردی، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٥، ل ٣٩

[٩]) فازل نزامەدین، فەرهەنگی شیرینی نوێ، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل ١٧

هاتووه[10]. له فەرهەنگی (سەرچاوه) ئاماژه بەخێزانی ئەو ناوانه کراوه، که وشەی دایـك وەك پێشـگرو بەشی یەکەمی وشەکه هاتووه و ناوی لێکدراوی دروست کردووه. لەوانه: أُم اربع و أربعین: هـەزارپێ/ اُم البشر: دایکه حەوا/ اُم حباب: گێتی، جیهان/ اُم صبیان: بۆتەکه، ئاڵه، شەوه/ اُم عـامر: کـەمتیار/ اُم القری: شاری مەککه/ أُم قویق: کونده پەپوو/ اُم الکتـاب: قورئـان[11] لـه زمـانی کوردیشـدا لـه جـۆره مارمیلۆکێك دەوترێت: دایکه مارانه ـ داکه مارانه. له زمانی سریانی دا وشەی (هیمـه ـ یمـه) بـەکار دێت. له فەرهەنگی (زهریرا) ی سریانی ناوی دایك بەم شێوانه هاتووه، بۆ زیاتر خسـتنه ڕوو هەمان ئەو وشانەی بەزمانی سریانی و به ئـەلفوبێی سـریانی نووسـیومانه، بەئـەلف و بێـی کـوردیش دەیانووسینەوه (ئمه، یالێتثا، یالدثا)/ (مولـدانیثا، یما).[12] بەڵام بەدەر له فەرهەنگ، ئەوەی ئێستا زۆر له زمانی سریانی دا بەکار دێ (یمه ـ هیمه ـ یۆم)ه. هەرچی فەرهەنگی(Merriam Dictionary) ی ئینگلیزییه بەم شێوەیه وشەی (mother ـ دایـك) ی پێناسەکردوه:

١) مێینه باوان.

٢) سەرچاوه، ئەسڵ، بنچ و بنەوان، وەك: *پێویستی دایکی داهێنانه.*

٣) سۆزیی دایکایەتی، وەك: *دایکم، دەوامەکه!*

٤) مەزنایەتی، *وەك دایکی هەموو زەریاکان.*

تەنانەت وشەی سروشت به ئینگلیزی (nature) سەرچاوەکەی لاتینییـه و بـه مانـای(لـەدایکبوون) بەکارهاتووه[13].

---

[10]) عەبدوڵڵا جەبار، فەرهەنگی شارا، خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما، ٢٧٠٧ کوردی، ل ٩٤ ـ ٩٨

[11]) مجید عبدالله ابراهیم، فەرهەنگی سەرچاوه، ٢٠١٥، ل ١٣٠

[12]) – زهریرا، قاموس عربي– سرياني، تاليف: الاب شليمون ايشو خوشابا، الاب عمانوئيل بيتو يوخنا، مطبعة هاوار، دهوك.٢٠٠، ص ١٢٨

[13]) Merriam Webster dictionary online

وشەی دایك وەك میتافۆر لە هەموو زمانەكاندا ڕستە و دەستەواژەی خۆی هەیە، وەك:

*شەو دایكی هزرە.*

*گوێڕایەڵی دایكی سەركەوتنە.*

*چێژ دایكی فەلسەفەیە.*

*فەلسەفە دایكی هەموو زانستەكانە.*

*سروشت دایكی گەورەی بوونەوەرەكانە.*

لە زۆربەی زمان و كەلتووری نەتەوەكانی دونیادا وشەی (دایك) وەك چەمك لە ئایین و فەلسەفە و زانست و كەلتوور و ئەدەبدا خاوەن پێناسەی جیاوازە.

## ٢- بەكێ دەگوترێت دایـك؟

كورترین پێناسەی دایك: بەو مێینە دەگوترێت كە منداڵ دەنێتەوە و بـەخێوی دەكـات. ئیمـڕۆ چێوەی دایكایەتی گۆڕانكاری بەسەرداهاتووە و ئەم زاراوانەی بۆ بەكار دێت:

- *دایكی وەچەدار* (Birth/ Biological Mother)، بەو دایكە دەگوترێت، كە دوگیـان دەبێـت و منداڵ دەنێتەوە بەخێوی دەكات، واتا منداڵەكە زادەی هێلكەی خۆیەتی.
- *دایـەن* (Nursemaid)، ئەو دایكەیە كە منداڵی كەسانی دیكە بە خێودەكـات جـا یـان لەبـەر ئەوەیە كە دایكی منداڵەكە مردووە، یان شیری نییە، یان لەبەر هەر هۆكارێكی دیكە بێ. ئەو ژنـە شیردەرەی بەكرێ دەگیرێت بە شـیری خـۆی منـداڵی كەسـێكی دیكـە بـۆ ماوەیـەك بـەخێودەكات پێیدەگوترێت (مەمك دایەن).[١٤]

---

[١٤]) حەمید ڕەشاش، پەیوەندی تەلەفۆنی، ٤ / ٥ / ٢٠١٧

○ *زگ بەکرێدەر* (Surrogacy Mother)، ئەو دایکەیە کە کۆرپەڵەیەك لە تۆ و هێلکەی پیاو و ژنێکی دیکەی لە زگی ئەودا دەچێنن تا نۆ مانگی خۆی تەواو بکات، چونکە ژنی خاوەن هێلکە کێشەی لە منالّدانیدا هەیە و ناتوانێ منداڵ بنێتەوە. یان خۆی حەزناکا ئازار و ئەرکی سکپڕی و منالّ بوون بکێشێت.

○ *بەخێوکەر* (Adaptor)، ئەو دایکەیە کە منداڵی کەسێکی دیکە لە ڕێی دادگا دەکاتە هی خۆی و بەخێوی دەکات و منداڵەکە ناوی ئەو دایك و باوکە هەڵدەگرێت.

○ *زڕداك* (Mother – in - Law)، ئەو پیاوەی کە پتر لە ژنێکی هەیە و منداڵەکان دوو یان پتر لە دوو داکیان هەیە: دایکەکە یان دایکەکانی دیکە پێیان دەگوترێت (زڕداك-زڕدایك). یان پیاوێك لە ژنێکی چەند منداڵێکی دەبێ، بەهۆی مردن، یان تەڵاق دان یان بەهەر هۆکارێکی تر ژنی یەکەمی لەلا نامێنێ و ژنی دیکە دەهێنێ و لەویش وەچەو منالّی لێدەکەوێتەوە، ژنی دووەم دەبێتە زڕدایك و منالّەکانیشی دەبنە زڕخوشك و زڕبرا.

○ *برای شیری، خوشکی شیری*: ئاینی ئیسلام جەختی لەسەر ئەوە کردۆتەوە، کە هەر منالێك پێنج جار بەتێری لە شیری مەمکی ژنێکی تر بخوات بەو مەرجەی منداڵەکە تەمەنی لە دوو ساڵ گەورەتر نەبێ، ئەوا ئەو منداڵە لەگەڵ منداڵەکانی دیکەی ئەو ژنە بەپێی ڕەگەزی منالّەکە دەبنە برای شیری، یان خوشکی شیری. پێغەمبەر (د.خ.) دەفەرمووێ:" لا يُحَرِّمُ مِنْ الرِّضَاعَةِ إِلا مَا فَتَقَ الأَمْعَاءَ فِي الثَّدْيِ وَكَانَ قَبْلَ الْفِطَامِ."[15]

### ٣- مێژووی دایك

لەڕاستیدا، قسە کردن لەسەر مێژووی دایك، پتر دەچێتە خانەی ڕمڵ لێدان، بە تایبەتی کە باسی قوناغی پێش زاین و پێش نووسین دەکەین، سەرچاوەکان کە زۆر کەمن لە بازنەی زانستەکانی شوێنەوارناسی و ئەفسانەناسی و ئایینناسیدا قەتیس دەکرێنەوە. ئەفلاتوون دەڵێت:

---

[15] ) صححه الألباني في "الإرواء" (٢١٥٠).

"خراپترین منداڵ ئەوانەن کە کوێڕایەڵی دایك و باوکیان نین"[16] لە دیـدی ئایینـەوە، هـەر سـێ کتێبە ئاسمانییەکان: تەورات و ئینجیل و قورئان، ئاماژە بە چیرۆکی ئادەم و حـەوا دەکـەن کـە چۆن لە بەهەشت، بە لەخشتەبردنی شەیتان، وەدەرنـران و نێردرانـە سـەر زەوی، ئـەوجا دەسـت دەکەن بە وەچە نانەوە. لە قورئان وا هاتووە "وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً قَالُوا أَتَجْعَلُ فِيهَا مَنْ يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّـي أَعْلَـمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ، وَعَلَّمَ آدَمَ الْأَسْمَاءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى الْمَلَائِكَةِ فَقَالَ أَنْبِئُونِي بِأَسْمَاءِ هَؤُلَـاءِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ".[17]

بەڵام لەو نەوە زۆرەی ئادەم و حەوا لە قورئاندا تەنیا ناوی (قابیل و هابیل) هـاتووە. بۆیـە زۆربەی بۆچوونەکان دەربارەی ژمارەی منداڵەکان و وەچەکانیان بە سەرچاوەی باوەڕپێکراو سـاغ نەکراونەتەوە، ئەوەتا (ابي جعفر محمد بن جرير الطبري) (٣) ڕای جیاواز لە کتێبی (تاريخ الأمـم والملوك)دا تۆمار کردووە: (١٢٠) منـداڵ لە کوڕ و کچ، (٤٠) کوڕ و (٤٠) کچ، وە (٢٥) کـوڕ و (٤٠) کچ.[18]

لێ هیچ زانیاریمان دەربارەی گوزەران و پەیوەندیی خێزانی ئـەوان نییـە. لـە قوناغـەکانی دواتردا، بە تایبەتی لە چەرخە بەردینەکاندا، ئەوا وەزیفەی دایك لە پـاڵ بـەخێوکردنی منـداڵ، کۆکردنەوەی بەرهەمی دارودرەخت و ڕاوکردنیشی بـووە. جـا لەگـەڵ بـاڵا دەسـتی ئایینـەکان، هەمیشە باری ئەوان قورستر بووە، بەڵام هەموو سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کـە بەخشـینی خۆشەویستی و ئارامی و دابینکردنی خواردن و خواردنەوە ئەرکی سـەرەکی هـەموو دایکـەکان

---

**١٦** ) گردأوردی: مرضية يعقوبى، پدر در ادبيات ايران و جهان، چاپخانه مهدى، تهران، چاپ اول، ١٣٨٨، ص١٢

[17] ) (البقرة: ٣٠، ٣١)

[18] ) http://alhakawati.net/arabic/civilizations/٧٧a١.pdf

بووه به بێ جیاوازی کەلتووری و ئایینی. مەرج نییە دایکەکان هەموویان بەیەك شێواز و نەریت و ڕەفتار، ئەو ئەرکەیان ئەنجام دابێت.

لەگەڵ دەستکردن بە کشتوکاڵ و نیشتەجی بوونی مرۆڤەکان، دایك پلەو پایەیەکی زۆر باش پەیدا دەکات، چونکە ئیشی کشتوکاڵ پێویستی بە دەستی کارە و دایکش باشترین کارگەی وەبەرهێنانی ئەو دەستی کارەیە. بەوە توانیوویانە دەسەڵاتی خۆیان بەسەر هێزی پیاودا بسەپێن و ڕۆڵی کوێخا و ئاغا ببینن. لە لای میسرییە کۆنەکان دایك وەك سەرچاوەی پیتوبەرەکەت و بەخشین و قەدەغێری سەیرکراوە، پیرۆز ڕاگیراوە تا کراوە بە خوداوەند.[19]

عەیامێکی دوور و درێژ کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بە ناوی دایکەوە بووە، بۆیە ئێستاشی لەگەڵ بێ، پێشگری هەموو ناوێك لە کۆمەڵگای (چینی)دا بۆ خێزان و بنەماڵەکان بە نازناوی دایك دەست پێدەکات جا ئەو نازناوە حەرفێك بێ، یان بڕگەیەك یان وشەیەکی تەواو. لە چەند ولاتێکی تریش هەروایە بۆنموونە لە سوید و نەرویژ ناوی خانەوادەی کەسەکان بەناوی دایکەوەیە بۆنموونە (Abraham Seidenberg)، لەقەبەکی لەدایکەوە وەرگرتووە، بەڵام لە ئەمریکا ناوی هەندێك لەکەسەکان ناوی بچوککراوەو پیتی یەکەمی دایك و ناوی خانەوادەی باوك وەردەگیرێ، بۆ نموونە (Gerald J Taylor) پیتی (J) دەستپێکی ناوی خانەوادەی دایکیەتی کە (Jeckson)ە[20].

ئەم جۆرە لەقەبانەش هەر لەخۆڕا نییە پاشخانێکی مێژوویان هەیە و ماوەنەتەوە، بەڵام دەستەڵاتی مێینە زۆر ناخایەنێ، پیاو بە زەبری هێز و فرت و فێڵ، بەرەکە لە ژێر پێی دایك دەردێنێت و خۆی دەکاتە گزیر و کوێخا." ژنك ئەوکەسە، یاکو ڕۆژەکێ ژ ڕۆژان، خودان تاج و

---

[19](Alexander Borg. Cypriot Arabic: A historical and comparative…,ISBN ٩٧٨-٣-٥١٥-٠٣٩٩٩-٤,p. ١٢٤ (کتێب)

[20])دکتر احسان قبول، زهرا غزالی پور، آموزش خواندن و درك مطلب فارسی، دانشگاه فردوسی، ص٧

تەخت و ب قەدرو بها، یاکو سەرۆکاتیا مالّی دکرو خێزان برێڤەدبر...لێ ئەڤ چەرخێ زێرین بۆ ژنکێ نەچوو سەری، پیاو شیا هەڤساریێ سەرۆکاتیێ ژدەستا بینتەدەر و شوینا وێ بگریت و دێ بخێتە ژێر دەستێ خۆ و سەربەستیا وێ بستینیت، هەتا وەلێکری، کو ژنك خۆ ژبیر کەت و چ ژ خۆ و مافێت خۆ نەزانیت بن دەست بژیت و نێریێ چەوساندنێ بکێشێت". [٢١]

لەگەڵ پەرەسەندنی شارستانییەکان، ئەرك و کاری دایکیش گۆڕانیکاری بەسەر داهات، ئەوەبوو، ئەویش وەك زۆربەی ژنانی هاوڕەگەزی خۆی بووە پیشەوەر لە چنین و ڕستن و دروویـن و نانکردن و مەیسەرکردنی هەموو کار و بارەکانی ئاژەڵداری و کشتوکاڵی، لە وێنە کۆنەکاندا دەبینین چۆن دایکە ڕەوەندەکانی کوردە کۆچەرەکان، لە کەشکۆڵێکی تایبەتدا کە پێی دەگوترێت (توور) منداڵی ساوای خۆیان لە سەرپشتیان لە ناو ئەو کۆڵە شاخ بە شاخ و دێ بە دێ هەڵگرتووە و ئیش و کاری خۆشیان هەرکردووە. کاتێکیش گڕوهۆڕی ماشینە زەبەلاحەکانی کارگەکانی ئەوروپا لە سەدەی (هەژدە) ئەو جیهانەیان گرتەوە، سەرەتای قۆناغێکی قورس و دژوار بۆ دایك لە مێژووی مرۆڤایەتیدا سەری هەڵدا، ئەویش ڕاپێچکردنی ژن بوو بۆ کارگەکان تا وەك کرێکار و خزمەتکار و بەردەست بەکاریان بێنن، چونکە هەم ڕۆژانەکەیان کەمتر بوو لە هی پیاو و هەم چونکە ڕەگەزی مێینە، خۆڕسکانە، جددیتر و هێمنتر و گوێڕایەڵترن لە چاو کرێکاری پیاو. هاتنە دەرەوەی ژن بۆ کار. لێساندنەوەی کۆرپە بوو لە باوەشی گەرمی ئەو دایکانەی کە لەبەر هەژاریی و برسییەتی ناچار بوون ئەو قوربانییدانە قبوڵ بکەن. ڕاستە شۆڕشی پیشەسازی کومەڵێك شتی باشی هێنا پێش، بەڵام بۆ دایك دەستکەوتەکانی زۆر نەبوو.

ئیمڕۆ لە کۆمەڵگا پێشکەوتووەکاندا، زۆر هەوڵ و بەرنامە و پرۆگرام و یاسا لە ئارادایە، تا نەختێك لە ئەرك و کاری دایکایەتی بدەن بە باوك. بەڵام زۆربەی لێکۆڵینەوە ئەکادیمییەکانی زانکۆ ناودارەکان، دووپاتی دەکەنە کە هیچ باوەشێك نییە لە دونیادا بتوانی جێگەی باوەشی دایك بگرێتەوە. ڕەنگ بێ هێندێك خوێنەر پێی سەیر بێت کە دواین لێکۆڵینەوە دەبارەی دایك

---

[٢١]) حجی جعفر، هندەك ڤەکۆلین ل دۆر فۆلکلۆرێ کوردی، چاپخانەی شەهاب، هەولێر، ٢٠١٣، ل ٣٢

لە مێژوودا، ئەوەمان پێدەسەلمێنێ کە دایکی جاران بۆ بەخێوکردنی منداڵەکانیان لە دایکانی ئەم سەردەمە باشتر و سەرکەوتووتر و دڵخۆشتر بوون. ئەوەتا مامۆستای دانیمارکی (ئارلینە هاریس Arlene Harrisd) لە (Arhus University) لە توێژینەوەیەکیدا لەگەڵ (٥٠٠٠)دایکی بەشداربوو، دەگاتە ئەو ئاکامەی کە "دایکانی زەمانی زوو، بە پێچەوانەی دایکەکانی ئەم سەردەمی ڕۆژئاوا، باشتر منداڵیان بەخێوکردووە و حەکیمانە دەرد و نەخۆشییەکانیان دەستنیشان کردوون، هەوڵیانداوە چارەسەریان بکەن، ئەوە جگە لەو کات و سۆز و مەحەبەت و لایەلایە و باوەشی گەرم و کە بە منداڵەکانیان بەخشیووە، کە هەموو ئەوانە وێنەی دایکی نموونەیی لە بیروهزر و زەینی منداڵ دەنەخشێنن و تا مردن پێی سەرسام دەبن. ئەو زانایە، دایکانی ئەم سەردەمە بە دایکی تووڕە و هەڵچوو و خەمۆکی ناودەبات"[٢٢]. کە ئەوانیش قوربانی ئەو گۆڕانکارییانەن کە سەردەمی عەولەمە و تەکنەلۆژیای نوێ دایهێناوە. کە قوربانیدەر و زەرەرمەندی هەرگەورە دوای دیکەکان، هەم منداڵەکان و هەم کۆمەڵگای مرۆڤایەتییە کە حەیف و مەخابن، ڕۆژ بە ڕۆژ پتر لەبەریەك هەڵدەوشێتەوە و لێك دەترازێ. تەکنەلۆژیا هەموشتێکی لە قاوغی سروشتی خۆی وەدەرنا، لە زۆر ڕووەوە تەکنەلۆژیا مرۆڤی حەساندۆتەوە، لێ لەبەرامبەریشدا بە سەرئێشە و خەم و دەیان نەخۆشی دەروونی و جەستەییەوە گرفتار و سەرگەردانی کردوون، ئەوا جگەلەوەی کە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی نێوان ئەندامانی خێزانی شەپرەدار کردووە.

کە سەر بە مێژووی کوردەواریشدا دادەگرین، دەبینین کە کۆمەڵگای کوردەواری لەسەر بنەمای خێڵ و ئێلاتی ڕەوەند و گوندنشینی بونیاتنراوە و تا کۆتایی سەدەی نوزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم، زۆرینەی دانیشتوانی کوردانی کوردستان لە دەرەوەی شاردا ژیاون. کەواتە داب و نەریتی خێڵایەتی و دەرەبەگایەتی و پیاوسالاری لە ژیانی ڕۆژانەی ئەواندا بە تۆخی

---

[٢٢]( Irish Independent/ Mothers and Babies، 3 May 2017 PP. 14 -1(ڕۆژنامە )

ڕەنگیداوەتەوە، بە تایبەتی کە کۆمەڵگەی کوردەواری زۆرینە موسوڵمانن، ئەمەیش مافی فرەژنی و سەڵتەنەتی پیاوی پتر بە نێرینە داوە کە لەبەر نزمی هۆشیاریی خود و کۆمەڵگا ڕاستەخۆ و ناڕاستەوخۆیانە، بار و ئەرکی دایکیان قورستر کردووە. ڕاستە لە مێژوودا ناوی چەندان شۆڕەژنی کوردی میر و دەسەلاتدار و چەکدار تۆمارکراوە، بەڵام ئەوانە لەچاو کۆی ژن و دایکانی کورد ژمارەیان زۆر کەم بووە. کاتێك کە لەم لێکۆڵینەوە، ژیان و گوزەرانی دایکی لەتیف هەڵمەت ـ وەك نموونە دەخوێنیتەوە ـ باشتر لە سەخت و دژواریی و ناهەمواریی ژیانی دایکی کورد تێدەگەیت. خۆشتان دەزانن، کە منداڵ لەبەرخۆ چوواندن و ڕاگرتنی منداڵبوونی سروشتی یان بە داودەرمان، لەناو کوردەواری حەرام بووە و هەمیشە پیاوەکان شانازیان بە ژمارە زۆرەکانی منداڵەکانیانەوە کردووە، بە تایبەتی منداڵە نێرینەکانیان!

لە کوردەواریشدا، کردنەوەی دەرگای کارکردن لە دەرەوەی ماڵ، ئەگەر چەند قروشێکیشی بە ژنەکە بەخشی بێت، ئەوا لەسەر حیسابی منداڵ و تەندروستی و کاروچالاکییەکانی خۆیەتی، چونکە نە دەتوانێ باوەشێکی گەرم بۆ منداڵەکەی بکاتەوەو نە دەتوانێت ژیانێکی خۆشگوزەرانی بۆ ئەندامانی خێزانەکەی زامن بکات. بۆچی؟ چونکە تا ئێستا لە کوردستاندا کار بەو یاسا و ڕێنماییە جیهانییانە ناکرێت کە لە وڵاتە پێشکەوتووەکان بۆ ژن و بۆ دایکی (کارکەر) دەرچووە. وەك بینیمان، دایکانی وڵاتە پێشکەوتووەکان داد و بێدادیانە لە دەست قورسی و سەختی ژیان و بەخێوکردنی منداڵ سەرەڕای ئەو هەموو ئاسانکارییە لە دابینکردنی دایانگەو باخچەی ساوایان و تەندروستی و پیشەیی و کۆمەڵایەتییەی بە یاسا بۆیان زامنکراوە.. ئەدی داکێکی خاوەن حەوت هەشت منداڵی کوردەواری بڵێ چی!؟

بەداخەوە، ئاماری ئەو دایکانەمان لەبەردەستدا نییە، کە لە کوردستاندا لە کاتی دووگیانی یان لەکاتی منداڵبووندا دەمرن، بەتایبەتی لە زەمانە زووەکان کە مامانە پیرێژنە نەخوێندەوارەکان لە جیاتی نەخۆشخانەی لەدایکبوون، ڕۆڵی مامانییان گێڕاوە، هەر خودا دەزانێ چەند دایك بەسەرمنداڵەکانیانەوە چوون! بەداخەوە تا ئێستا ڕێژەی ئەو دایکانەی بەسەرمنداڵەکانینەوە دەچن بەرزە، لە "سەحرای ئەفریقیا دەگاتە (٥٦٪) و لە خوارووی ئاسیا

دەگاتە (٢٩٪) لە کاتێکدا لە وڵاتانی ئەوروپایی و ئەمەریکادا لەهەر (١٠٠) هەزار دایك تەنیا (١٠) دایك بەسەرمنداڵەوەدەچن ودەمرن. لە وڵاتانی دیکە ڕێژەکە دەگاتە (١٥٠٠) دایکی مردوو بۆ هەمان (١٠٠) هەزار."[٢٣] جگەلەوەش، ئەو توند و تیژییەی بەرامبەر دایك بەتایبەتی و بەرامبەر ڕەگەزی مێینە بەگشتی ئەنجام دەدرێ، بەتایبەتی لەڕۆژهەڵات، وایان لێکداوەتەوە کە شەرەفی پیاو لەلای مێینەیە، بۆیە بەبیانوی شەرەف ئەتك بەمێینە دەکرێت و دەکوژرێت، یان فشارێکی زۆری بۆدەهێنن و وای لێدەکەن خۆی بسوتێنێ، بەڵام بۆهەمان مەبەست، پیاو وەك بەرزەکی بانان بۆی دەردەچێ و کەس پێی نالّێ لە پشتی چاوت برۆیە. هەرچەندە ئێستا دیاردەی خەتەنەکردنی ئافرەتان کەم بۆتەوە، بەڵام لە کوردستان بنەبڕنەکراوە، ئەوەش کاریگەری خراپی زۆرە لەسەر مێینە، چێژی جووتبوونی سێکسی لاواز دەبێ، یان دادەمرکێ، وەك ئەوە وایە کەسێك دوو چاوی هەیە، بێی چاوێکی کوێر بکەیی و بێگومان ئەو کەسە سەتا پەنجای بینینی لەدەست دەدات، جۆرێکی تری خەتەنەش هەیە، پێی دەڵێن خەتەنەی فیرعەونی، شوکر ئەمەیان لەکوردستان نییە، ئەم جۆرەیان زۆر خەتەرە، چونکە تەنها قیتکەی ئەندامی مێینە نابڕن، بەڵکو لچ و لێوەکانی ناوەوەش دەبڕن، بەتەواوەتی چێژی سێکسی لەدەست دەدات و لەکاتی جووتبووندا ژان و ئازارێکی زۆری دەبێت و توشی هەوکردن دەبێت و زۆر جار دەبێتە هۆی مردنی.

---

[٢٣]) Rogers, Simon (٢٠١٠-٠٤-١٣). "Maternal mortality: How many women die in childbirth in your country?". The Guardian.

**٤- دایك له ژنخـواوه بۆ و كۆیـله**

فەیلەسوفی یۆنانی ئەرستۆ (٣٨٤ -٣٢٢ پ. ز.)لە پۆلینکردنەکەیدا بۆ پێکهێنەرەکانی ژیـان و ژینگەدا، کە بە (تەرازووی سروشت Scala Naturae) ناسراوە، مرۆڤی لەسەرووی ئاگر و درەخت و گیاندار داناوە، بەڵام لە خوار خوداوەندی و فریشتەی بەهەشت ڕیزبەندیکردوە.[٢٤]

بە درێژایی مێژوو لە سەرووی مرۆڤەکانیش، دایك وەك ژن و بەرهەمهێنەر و بەخێوکەر پایـە و مەقامێکی یەکجاردیاری هەبووە تا ئەو ڕادەیەی وەك خوداوەند سەیرکراوە. بێگومان ئەمە پتر لـەو پەیکــەرە بچــووکانەدا بەدیــدەکرێت کــەپێش مێــژووی ســەدەی بەردینــەکان دروســتکراون. لــە شارستانیەتی بابلییە کۆنەکاندا، دایەخوای

(Nammu، Nintu، Damgalnunna، Ninmah،Ninhursaga ) زۆر ناویـان هـاتووە کـە هێندکیان هاوژینی پیاوەخواکان بوون.جـا چـونکە (Ninsun) لـە ئەفسـانەی میزۆپۆتامیـا، وەك دایکی گلگامێش سەیردەکراوە، هەمیشە پایە و مەقامێکی یەکجار مـەزنی دراوەتـێ. هـەر ئـەو دایکە لە لای کەنعانییەکان بۆتە (Asherah)، لـە لای سـۆمرییەکانیش (Ninhursag) چـەندان داستانی شیعری بەسەردا هەڵگوتراوە.[٢٥]

شوێنەوارناسان و ئایینناسەکان پەرستنی ئەو دایەخوایانە بۆ ئەوە دەگەڕێننـەوە کـە ئـەوان وەك ڕەمز بە تەنکراون لە شێوەی جیاواز بۆ مـەزن ڕاگـرتنی پـیرۆزی سروشـت و دایکایـەتی و زاوزێ و خەلقبوون، تەنانەت هێندێك لەو دایەخوایانە وەك دایکی زەوی چـاویان لێکـراوە. خـاڵی بایەخـدار

---

[٢٤]) George F. Striedter, Principles of Brain Evaluation، ٢٠٠٥, Sinauer Association (N.C. Publisher, Massachusetts USA) P.٢٧ (کتێب)

[٢٥])http://www.en Mother goddess

ئەوەیە کە لە هەموو دایەخوایەکان، خەسڵەتی دایکایەتی بە زەقی دیاریکراوە بە دایکایەتی کۆی سروشت و گەردون و هەسارەکانیشەوە.

بۆ بەرچاو ڕوونی خوێنەر، چاخی بەردینی کۆن دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی دوو ملیۆن و نیو ساڵ پێش ئێستا و بەردەوام بووە تا چاخی داهێنانی کشتوکاڵ لە دەرووبەری (١٠) هەزار ساڵێك پێش زایین.

لەو ماوەیەدا هەر کۆمەڵگایەك دایە خودای خۆی هەبووە وەك دایەخودای (Venus)، کە لە گردۆڵکەکانی فەلەستین دۆزراوەتەوە، هاوشێوەکەشی لە مەکسیك هەبووە.

هەروەها دایەخوای (کیژەباڵندە) لە لای میسرییە کۆنەکان و (کیژی خەوتوو) لە لای ماڵتایەکان و(شێرەژن) لە لای ڕۆمانییەکان و (ئۆلۆمپیا) لە لای گریکە کۆنەکان (خودای زەوی) لە لای ڕۆمانەکان و و دایەخوای (ئانو)ش ـ واتا دایکە خودای پیرۆز ـ لە لای ئاریشییە کۆنەکان پەرستراوە. بەم شێوەیە ڕیزبەندی ناوی دایەخواکان لە زۆر سەرچاوەدا ئاماژەیان بۆ کراوە.

کاتێیش ئایینەکان لە ئەفسانەوە بوون بە بەشێك لە کەلتووری نەتەوەکان و گۆڕانکارییان بەسەرداهات، دایك پێگەی دیاری خۆی لە دەستنەدا و لە سەرتۆپی دەفتەری شکۆداریدا مایەوە.لەبەر ئەوەی مێینە بەگشتی و دایك بەتایبەتی ڕەمزی بەرەکەت و نەوە خستنەوە و زۆربوونە، بۆیە وەك سونبلێکی پیرۆز سەیرکراوە.

بۆ نموونە، هیندۆسەکان پتر لە دایەخوایەکیان هەبووە، وەك دایەخوای (Durga)، کە پارێزەری سروشتی دایکایەتییە و دایەخوای (Devi Adi Parashakti)، کە هێزی خەلقکردنی هەموو گەردوونی هەیە. لە ئایینی (ئینکەنەکان Incan) لە ناوچەی ئەندیز، دایەخوای (Pachamama)یان هەبووە بۆ خەلقکردنی دارودرەخت. هیندۆسەکان تاکو ئێستا(Kali Ma) کە بەمانای (دایکی مەزن) دێت، دەپەرستن و تقووسی تایبەتی بۆ دەگێڕن. بەم شێوەیە لە زۆربەی هەرە زۆری ئایین و ئایینزاکان، دایك بە شێوازی جیا جیاز بوونی خۆی سەلماندوو. ئەمەش هەموو بایەخ و بڵند و باڵای ئەو بوونەوەرە جوان و ناسك و جەرگسۆزە نیشان دەدەن.

له کتێبە ئاسمانییەکانیشدا، دایك نەك هەر ئاماژەی پێکراوە، بەڵکو زۆر پـیرۆز و شـکۆدار و هەیبەتدار، مەقام و پایەیی دیار ی کراوە.

له لای جوولەکەکان، ڕێزگردنی بنی ئادەم بەبێ ڕێزگرتن لە دایك و باوك هیچ مانایەکی نییە، بۆیە لە تەوراتدا زاراوەی ((Kavod) لە دەقەکاندا بۆ بەخشینی ئەو مانا و بەهایـە بـەکارهاتووە.[٢٦] لـە ڕاسـتیدا تەرجەمـەی ئـەو زاراوەیـە ئاسـان نییـە، چـونکە لـە زۆربـەی فەرهـەنگی زمانەکانـدا، هاومانایەکە وشەی (ڕێزگرتنە)، بەڵام ئەم زاراوەیە پانتاییەکی زۆر فراوانتری لە دیدی جوولەکەکاندا داگیر کردووە، بەوەی کە ئەو زاراوەیە تێکەڵەیەکە لە (ڕێزگرتن + شکۆداری + قورس و سەنگینی). ئەمەیش ئەوە نیشاندەدا، کە دایك و باوك پایەیەکی دیارییکراوی جیاواتریان هەیە لە چاو کەسـانی دیکەدا.

هەرچی مەسیحییەکانە، لە ڕوانگـەی دایکـە مریـەمی پـاکیزەوە، قـەدر و خۆشەویسـتی و ئەمەکدارییان بۆ دایك سنووردارکردوە تا ڕادەی کرنوشبۆبردن و عیبادەتکرنی بـە پێشکەشـکردنی چەندان تقووسی تایبەتمەند و دیاری و قوربانی، ئەوە جگە لەوەی کـە وێنـەی ئـە و پاکیزەیـە وەك ڕەمزی بوونی (مەسیح) هەمیشە لە کڵێسا و شوینە ئاییینییەکاندا لەبەرچاوە، وەك ڕەسم و نـەخش و پەیکەر و هەڵکۆڵین. لە ئینجیلیشدا بەم شێوەیە ئاماژە بە دایك کراوە کە دەڵێ: " حەوا دایکـی هەمووبوونەوەرەکانە" ئەمەیش سنووری بازنەی مرۆڤـ دەبەزێنێ و حەوا دەکرێت بە دایکە مەزنی کۆی بوونەوەرەکان. ئەمەیش بۆ نیشاندانی بەرزوبڵندی مـەقامی دایکە.لـە ئـاینی مەسـیحییەتدا دایك پێگەیەکی گرنگی هەیە، دایکی عیسای مەسیح، (مەریەم)بەهاو پیرۆزییـەکی زۆری هەیـە و لە سرووتە ئاینییەکانی مەسیحییەت پێگەی تایبەتی هەیەو لە هەموو بۆنە ئاینییەکان، تەرتیلـەی دینی و باس و خواسی (مریەمەی پاکیزە) هـەردەم لەسـەر زارانـە. (مریەمـە) ڕەمـزی قوبـانی و

---

[٢٦]http://www.myjewishlearning.com/article/how-to-show-respect-for-a-/parent-a-jewish-view

بەخشین بووە، لەپێناو کوڕەکەی، ناخۆشی زۆری بینی، لەپێناوی پاراستنی کوڕەکەی ڕێگایەکی دووری بڕی و ڕووی کردە زۆر دەرو دەشت و چۆڵەوانی و عەزابی کێشا. کاتێك کە (هیرۆدس) بڕیاری سەربڕینی هەموو منالێکی کوڕی دەرکرد. ناچاربوو مریەمە و یوسف و کوڕەکەی رووبکەنە میسر.

کاتێکیش کوڕەکەی تەمەنی دوازدە ساڵان بوو، مەسیح و مریەمە و حەزرەتی یوسف، چوبوونە (هەیکەل) بۆ دوعا و نوێژ کردن لە یەکێك لەبۆنەکانی یەهودی. ڕێگاکە زۆر قەرەباڵغ بوو، مەسیح بزر بوو، دایکی زۆر ترسا و نیگەران بوو و بەدوایدا گەڕا، تاوەکو نەیدیتەوە، ئارام و هێور نەبۆوە. هەرچەندە منداڵ گەورەش بێت، ئەوا دایك هەرچاودێری دەکات.

تایبەتمەندییەکانی (مریەمە) وەك دایکێك لە ئینجیل وابـاس کـراوە: "دەستکەوتەکان و چاوگی هێزی لە کەسێتی ئەودابوو، ئەو کەسە دایکی یەسوع(مەسیح) بوو. ئەو تاکە مروڤ بوو کە یاوەری (یەسوع) بوو لە بوونیەوە تا لە خاچدرا. ئەو هەمیشە دەستەونەزەر بۆ جێبەجێکردنی فەرمایشەکانی خودا لەئامادەباشی دابوو. ئەو لە واتای وشەی خودا تێگەیبوو و لە ژیانیشیدا جێبەجێی کرد."[27]

کاتێ کە خودا مەریەمەی هەڵبژارد بۆئەوەی ببێتە دایکی مەسیح، خودای گەورە پاکیزەترین کەسی هەڵبژارد. ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە دایك زۆر پیرۆزە. کاتێ کە مەلائیکەت ئەوەی پێڕاگەیاند کە ئەو سکی دەبێت و کوڕێکی دەبێت. زۆر نیگەران بوو، چونکە کەسێکی پاك بوو، هیچی بەخۆی شك نەدەبرد، نەیدەزانی ئەم کارە چۆنە. بەڵام کاتێ زانی ئەو کارە پەرجووی خودایە دڵی خۆش بوو، هەرچەندە لەلایەن کۆمەڵگاوە ڕووبەڕووی تانەو تەشەرەی زۆر بووەوە، چونکە هەرگیز قبوڵی ئەوە نەکراوە، کچێك بەبێ شووکردن منداڵی ببێت. خەڵك جنێویان پێدەدا و گاڵتەیان پێدەکرد. هەتا (یوسف)ی دەستگیرانی زۆر نیگەران بوو. دوای چەشتنی عەزابێکی زۆر گەیشتنە ئەو قەناعەتەی کە (مەسیح) پێغەمبەرە و شتێکی ئاسایی نییە. چونکە بە لەدایك بوونی

---

[27]) التفسیر التطبیقي للکتاب المقدس، القاهرة، مصر، ص٢٠٦٧ (نووسەران ئەم بڕگەیان کردووەتە کوردی)

مەسیح مێژوویەکی نوێی بۆ مرۆڤایەتی دروست کـرد، ئـەویش سـاڵی زاینـی بـوو. نـاوی دایکـی مریەمەی پاکیزە، (حەنێ) بوو، ناوی باوکی (یویاقین) بوو، لەقورئانیشدا بە (عەمران)ناوی هاتووە. کاتێ کە مریەمە لەسکی دایکی بووە، خودا پارێزگاری لێکردووە، هەروەها خودا ئەوی هەڵبـژارد، چونکە پاك و بە رەوشت بوو. لەبەر ئەوە کاتێ کە مەلائیکەت هات و مـژدەی ئـەوەی دایـێ، کـە دووگیان دەبێت، زۆر دڵخۆش بوو و وتی: من خزمەتکاری خودام و هەمیشە وام وتووە.لە ئینجیـل دا دایك زۆر جار لە شێوەی موعجیزە پیشان دەدرێ، بۆ نموونە(ئەلیسابات)، کە دایکـی یۆحـەنای لەئاو هەڵکێش بوو و پووری مریەمەی پـاکیزە بـوو، ئـەو هەرچـەندە پیرەژنێکـی بەتەمـەن بـوو، مناڵیشی نەبوو، مێردەکەشی پیربوو و لەهەمان کاتیش عارفێکی گەورە بوو. هەمیشە باوەڕی بەوە هەبوو کە گۆڕانکاری لەژیانیدا ڕوودەدات، هەمیشە نزای دەکرد و نوێژەکانی جێ بەجێ دەکرد. تـا خودا پەرجوویەکی خوڵقاند و کوڕێکی پێدا، هەموو خەڵك سەریان سـوڕما کـە ئـەو پیرەژنـە چـۆن منداڵی بووە. مناڵەکە کـە بـوو نـاونرا یـەحیا(یۆحـەنا)، [28] لـە ئینجیـل دا بـەم شـێوەیە باسـی (ئەلیسابات)ی دایکی(یەحیا) کراوە: (ئەو واناسرابوو، کە ژنێکی رۆحانی بوو، هەرگیز لە قـودرەت و توانای خودای مەزن گومانێکی نەبوو، کە ئەو بەڵێنەکانی دێنێتە دی. ئەو دایکی یەحیای لەئاو هەڵکێش بوو.)[29]

لە قورئانی پیرۆزدا، دایك دەبێتە کرۆکێکی سەنگین و دەوڵەمەندی زۆر بە نرخ. وشەی (الام ـ دایك) وەك زاراوە چەندان لقوپۆی لێبۆتەوە و کۆی ئەو وشانەی لـە شـەجەرەی (دایـك)وە دەبینـری (٨٦) وشەیە، ئەوە جگە لەو وشانەی کـە پەیوەسـتن بـە زاراوەی (الوالـده) و ژمارەکـەیان (١٠٤) وشەیە. تەنانەت یەکێك لە سورەتەکانی قورئان بە نازناوی (مریەم) ناونراوە. خۆ ئەگەر بگەڕینـەوە سـەر فەرهـەنگی زمـانی عـەرەبی ئـەوا بـە دەیـان وشـە لـە سـێبەری (الام) دەخوێنینـەوە کـە سەرچاوەکەیان (دایکە). خودای مەزن دەفەرموێت: "وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ إِحْسَانًا حَمَلَتْهُ أُمُّهُ

---

[28]) یۆحنا(یەحیا)، بەواتای (حنان لله) واتا سۆز بۆخودا.

[29]) التفسیر التطبیقي للکتاب المقدس، القاهرة، مصر، ص٢٠٦٣ (نووسەران ئەم بڕگەیان کردووەتە کوردی)

كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا وَحَمْلُهُ وَفِصَالُهُ ثَلَاثُونَ شَهْرًا حَتَّى إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُ وَبَلَغَ أَرْبَعِينَ سَنَةً قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَى وَالِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحًا تَرْضَاهُ وَأَصْلِحْ لِي فِي ذُرِّيَّتِي إِنِّي تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّي مِنَ الْمُسْلِمِينَ."[٣٠]

پێغەمەبەریش(د.خ) فەرموویەتی:" إن الله يوصيكم بأمهاتكم، إن الله يوصيكم بأمهاتكم، إن الله يوصيكم بأمهاتكم، إن الله يوصيكم بآبائكم، إن الله يوصيكم بالأقرب فالأقرب"[٣١] واتا، سێ جاران مەقامی (دایك)ی لەپێش مەقام و مەنزڵیەتی باوك و خزم و کەسوکار داناوە. مەخابن، شارستانیەتی ئەم سەردەمە بە دەستی کەتنەلۆژیا و عەولەمەوە، زۆر لەو مەقامە پیرۆز و مەزنانەی جارانی دایکی کەمکردۆتەوە. ڕاستە لە ماڵەوە دایکەکان، جۆرەها ماشینی سەردەمییانە وەك کەلوپەل خزمەتی خێرا و بێئەرك ئەنجامدەدەن، بەڵام لە ناخ و دەروون و دڵدا، ئەو بوونەوەر هەست ناسکە، لەپێناو بژێوی ژیانیدا، باوەشی گەرمی دایك و لایەلایەی بەسۆزی جارانی لێسەندراوەتەوە و لە چێژوەرگرتنی بەخێوکردنی منداڵەکانی مەحرومکراوە. سەردەمی ئێمڕۆ دایکەخوای کردوە بە کۆیلەیی مەکینە و عەولەمە، ئەوان ڕۆبۆت ئاسا مامەڵە لەگەڵ دایك دا دەکەن.

## ٥- پووختەیەك دەربارەی (دایکی مەزن)

(دایکی مەزن) یان (دایە مەزن) ناونیشانی کتێبێکی زۆر بایەخداری(٦٠٤) لاپەرەیی نووسەری ئەڵمانی (ئیرك نیومان Erich Newmann ١٩٠٥-١٩٦٠) ە بە ناوی (The Great Mother) کە(Ralph Manheim) کردوویەتی بە ئینگلیزی، لەبەر دەوڵەمەندی کتێبەکە، بۆ خوێنەری کورد، لەم بڕگەیەدا ئاماژە بەچەند خاڵێکی دیاریکراو دەکەین، کە پەیوەستە بە لێکۆڵینەوەکەمان و مشتێ زانیاریمان دەداتێ، کە لە شیتەڵکاریی دەقە شیعرییەکانی لەتیف هەڵمەت ــ دواتر ـ سوودیان لێوەردەگرین.

[٣٠]) سورة الاحقاف: ١٥

[٣١]) صحيح الجامع: ١٩٢٤

نووسەری ئەم کتێبە هەوڵیداوە وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە: بۆچی دایك هێندە مەزنە و چۆن بە درێژایی مێژوو مرۆڤ هەوڵیداوە مەزنی ئەو بوونەوەرە بە شێوازی جیاواز بەرجەستە بکات؟ لێکۆڵەر دەروونی و شوێنەوارناسی و کۆمەڵناسی ئاوێتەی یەکتری کردووە، بۆ گەیشتن بە وەڵامی شیاوی پرسیارەکە.

هەر لەسەرەتادا، نووسەر بەشی یەکەمی کتێبەکەی بۆ زاراوەی (Archetype) تەرخانکردوە، کە بۆ خوێنەران، پێویستی بە ڕاڤەکردنێکی سەرپێی هەیە. مانا فەرهەنگییەکەی وشەکە، ئاماژەکردنە بە یەکەمین یان کۆنترین نموونەی شتێك، کە دواتر کەسانی دیکە لاساییان کردبێتەوە و(کۆپیان) لەبەرگرتبێتەوە، جا کتومت وەك خۆی بن یان بە دەستکاریی و گۆڕانکارییەوە بن. ـ ڕەنگ بێ داتاشینی زاراوەی (نموونەزادە)، بە زمانی کوردی، نەختێ لە مەبەستی وشەکە نزیکمان بکاتەوە، لێ ئێمە لێرەدا زاراوەکە هەر بە شێوە لاتینییەکە بەکاردەهێنین ـ. کاتێك پسپۆڕانی دەروونناسی شیکاری، قسە لەسەر (Archetype)ی دایکی مەزن دەکەن، ئەوان هەر ئاماژە بە وێنەیەکی داهێنراوی ئەو زاتە لە زەمان و مەکانێکی دیاریکراو ناکەن، بەڵکو لە ئاماژەکانی دیوی ناوەوەی ئەو وێنەیە دەکۆڵنەوە و ڕێژەی کارتێکردنی لە دەروونی مرۆڤەکان دەستنیشان دەکەن. بۆ؟ چونکە لە دیدی ئەوانەوە، هەمیشە گوزارشتکردنێکی ڕەمزیی لە دیاردەیی دەروونناسییدا، لە ڕوخساری ژنەخوداوەندە مەزنەکاندا هەیە، کە بە شێوەی جیا جیا لە ئەفسانە و کارە ئەدەبییەکاندا ڕەنگدانەوەیان هەیە. جا ئەوەی وایکردوە ئەو(Archetype)ی دایکی مەزن بەدرێژایی مێژوو لە زهنی مرۆڤدا بمێنێتەوە، وزە سیحراوییەکەی ئەو وێنەیە کە توانییویەتی ڕەگ و ڕیشەی خۆی بگەیێنێتە بوارەکانی ئایین و ئەفسانە و خەون و بەرهەمە خەیاڵاوی و فەنتازییەکانی مرۆڤە سادەوساکارەکان و بلیمەت و بەهرەمەندەکان بێ فەرق و جوداییی. تێگەیشتن لە زاراوەی (Archetype) وەك توخمێکی دەروونی، ئاسان نییە، بەبێ نیشاندانی ڕەهەندە جیاوازەکانی ئەو زاراوەیە لەڕووی: بایەخی جوولەی (دینامیکی) سۆز/ هێماگەریی (ڕەمزییەتی) زاراوەکە/ کەرەستە پێکهێنەرەکانی/ شێوازی بونیاتی وێنەکە.

جووله (Dynamic) له كاریگەریی (Archetype) بریتییه له پرۆسەیەكی وزەدار كه لـه دەروونـدا بوونی هەیه و هەستی پێدەكرێت له هەردوو حاڵەتەكـەی بـەئاگایی و بێئاگایـدا( Conscious and Unconscious State) وەك حاڵەتی سۆزی ئـەرێنی (لـه جـوانی و ڕوخسـار و ئەڤینـدا) یـان لـه حاڵــەتی ســۆزی نــەرێنی (لـــه نیگـــەرانی و شـــین وشـــەپۆڕ و دڵەڕاوكێییـــدا). پـــتر ئـــەم ڕەهەندەی(Archetype) ئەوكاته خۆی دەنوێنێ كه(خۆم Ego) بەسەر هەموو هەست و هەوەسەكانی دیكەدا زاڵ دەبێ، بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئاكامی كاریگەرییەكه به پەسەندیی و ناپەسندییەوە.

ڕەهەندی هیماگەری(Archetype) ئەو وێنه دەروونییانەیه، كه له جیهانی هەستی بەئاگا خۆی نمایشدەكات، بۆ نموونه له وێنەی (دایكێكی ڕەزا قورس)دا وێنەی (باوكێكی ڕەزاقورس) لەبەرچاوماندا زەق دەبێتەوە.

هەرچـی كەرەسـته پێكهێنـەرەكانی(Archetype)ە، بریتییـه لـه تـۆڕێكی ئاڵۆزوپـاڵۆزی كۆئەندامەكانی دەروون، كه جووله و هێماگـەریی و هەسـته بـەئاگاو بێئاكاییـەكان دەگرێتـەوەو بـه شێوەی بینرا و نەبینراو خۆیان دەنوێنن. بۆ نموونه هەڵسوكەوت و ڕەفتـار و نـەریتی تاكـەكان، بـەبێ ئاگایی، زۆربەی جار له ژێركاریگەری ئەو كەرەستانەن. به واتایەكی دیكه (Archetype) حاڵەتێكی دەروونی تایبەتمەنی بایەلۆژییه كه له ڕەفتار و سیفەت و خاسیەتی تاكـەكان (یـان بوونـەوەرەكان) دا دەستنیشان دەكرێت.

بونیاتی ئەو (Archetype)، بریتییه له تێكەڵەیەك له بوونی به ئاگایی و بوونی بـێ ئاگـایی. بۆنموونه زۆرجار دۆخی دەروونی كەسێك ئەوكاته بەئاگادێتەوە كه وێنەیەكی شاراوەی تێدا حەشـاردرا بێت.

بۆیه له لای دەروونناساندا غەریزە و دەروونی زاڵ، زۆربایەخدارە، چونكه هەمیشه وێنەیەكی كۆن له جیهانی بێئاگاییدا، شتی نوێ بەرهەمدەهێنێت، ئەمەیش لەسایەیی هێز و سەنگی ئەو هیماگەرییەی كه له وێنەكەدا بوونی هەیه.

خوێنەری بەرێز، شیکردنەوەکەمان نەختێ تەم و مژاوی دێتە بەرچاو. بەڵام ئێستا بۆتان ڕووندەکەینەوە. چۆن وێنەی یان پەیکەرێکی کۆنی چەند هەزار ساڵەی دایك، لە هزر و زهنی ئەدیبێك دەبێتە (دایە مەزن) و جوانترین شاکاری ئەدەبی پێدەبەخشێ، لێرەدا دوو پرسیار دەورووژێنین:

- ڕێژەی بەشداری شاعیر لە هەر داهێنانێکی نوێی دا چەندە؟
- کام وێنەی دایك بۆتە (Archetype)ی دایکی مەزنی لەتیف هەڵمەت، بۆ نموونە؟

بۆ وەڵامی پرسیار یەکەم، پەنا بۆ تیۆرییەکی دەروونناسی ناودار (یۆنگ) دەبەین کە بە ناوی(بێئاگایی دەستەجەمعی Collective Unconscious) ناسراوە و دەڵێ: لە ناخی هەموو کەسێکدا چەندان وێنەی شاراوە هەیە، کە لە هەموو قوناغەکانی تەمەندا لەگەڵ ئەو کەسەدا دەژین، بەبێ ئەوەی ئەو پێبزانێت یان بەئەنقەست ئەو وێنانەی لەلای خۆی حەشار دا بێ .(یۆنگ) ئەو وێنەیە بە (بیرۆکەی ئەفسانەیی) ناودەبات، کە مرۆڤ خۆشی نازانێ چۆن ئەو وێنەیە دروستدەبێ!

ئەمە پێمان دەڵێ، بۆ ئەوەی لە بنجوبنەوانی شیعری شاعیرێکی وەکو لەتیف هەڵمەت تێبگەین، دەبێ زووتر ئەو وێنە (یان وێنانە) بدۆزینەوە، کە لە هزر و زەینی ئەودا وەك (Archetype) جێگیر بووە ـ لێرەدا وێنەکە وێنەی دایکی مەزنە (کە دایکی شاعیرە).

بۆ وەڵامی پرسیاری دووەم: دەڵێین، هەریەکێك لە ئێمە، بە درێژایی تەمەنی خۆی بە هەزاران هەزار وێنەی دایکی خۆی بینیووە، (ئەوەندەی تەمەنی هەردووکیان بواری دابێت)، بەڵام کام تاکە وێنە لە نێو ئەو هەزار هەزار وێنەدا، بۆتە مۆتیڤ و هاندەری داهێنانەکانی ئەدیبێك یان شاعیرێك یان هونەرمەندێك یان زانایەك؟

(Erich Newmann) دەڵێ بۆ دۆزینەوەی ئەو وێنەیە، (دەبێ پرۆسەیەك ئەنجام بدەین کە ناوی لێناوە(بەراودکاریی مۆرفۆلۆژی دەروونیComparative Morphological Psychology) بەو

واتایە دەبێ شیکارییەکی ورد بۆ ئـەو کەسـە بکـەین دەربـارەی مێـژووی ئـایین و شوێنەوارناسـی و ئەنتۆلۆژیی و ڕەگەزناسی (Ethnology)...تاد هەموو قۆناغـەکانی تەمـەنی.[32]

ئەو (Archetype)ی دایکی مەزنتان بۆ دەست نیشان دەکەین کە بۆتە هاندەری نووسینی ئـەم هەموو دەقـە شـیعرە لـە لای لـەتیف هەڵمـەت لەسـەر (دایـك) دوای ئـەوەی ئـەو بەراوەردکارییـە مۆرفۆلۆژییە دەروونییەی بۆ ئەنجام دەدەین.

(Erich Newmann) لە پاشکۆی کتێبەکەیدا کۆپی(١٩٠) پەیکـەر و وێنـە و هێمـای جیـاوازی نمایشکردووە، کە بە کەرەستەی جیاواز لە بەرد و دار و ئاسن و کانزاکانی دیکە بە ڕەنگ و قەبارە و شێوازی تایبەتمەندا دروستکراون. مێژوو و زێدی ئەو پەیکەر و وێنانە هەموو قۆناغـەکانی مێـژووی مرۆڤایەتییە و لە هەموو کون وقـوژبنێکی ئـەم زەمینـە پـان وبەرینـەدا ـ ئەمـەش بـەها و نرخـی کتێبەکەی سـەنگینتر کـردووە ـ جـا هـەر پەیکـەر و وێنەیـەکی ئـەو کتێبـە وەك (Archetype) وەرگیراون، بەو مانایەی کە:

- هەر(١٩٠) پەیکەر و وێنەکە تایبەتن بە دایکی مەزن.
- هەر یەکێك لەوان یەکەمین یان کۆنترین پەیکەر و وێنەیە.
- بەسەدان پەیکەر و وێنە لە سـەر ئـەو (١٩٠) پەیکـەر و وێنەیـە لەلایـەن بـەهرەدارانی دیکەدا بە داهێنانەوە دروستکراونەتەوە.
- تـا ئێسـتا هـەر ئـەو (١٩٠) پەیکـەر و وێنەیـە دۆزراوەنەتـەوە کـە تایبـەت بـن بـە (Archetype)ی دایك و زۆربەشیان خوداوەند بوون.

---

[32] Erich Newmann, The Great Mother, translated by Ralph Manheim, Princeton (کتێب) University Press, Princeton and Oxford, ٢nd edition, ٢٠١٥, PP.١ -٥

- لەسەرەتای چاخی بەردینەوە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بە پیاوەکانیشەوە لەژێر سایە و سیبەری ئەو دایکە مەزنانەدا ژیانیان بەسەر بردوە و گەیشتوونەتە ئەم ڕۆژگارەی ئیمڕۆ، بەردەوامیش دەبن.[٣٣]
- ئەو(١٩٠) پەیکەر و وێنە و ئەوانەی لەبەریان گیراوەتەوە، بوونەتە گەنجینە و زەخیرە و کەرەستەی کۆی هەموو ئەو بەهرەمەندانەی لە کارە ئەدەبی و هونەرەکانیاندا سوودیان لێوەرگرتوون.

ئەو خاڵەی کە بۆ ئێمەی لێکۆڵەر لە دەقەکانی لەتیف هەڵمەتدا بایەخدارە، ئەوەیە کام وێنەی دایك بۆتە (Archetype)ی ئەو شاعیرە و ئەو هەموو بەرهەمە جوانەی پێبەخشیووە!

## ٦- چۆن وێنەی دایك (Mother - Image) دەبێتە خودوێنە (Self-Image)؟

لێرە، وشەی (وێنە) وەك زاراوە بەکارهاتووە نەك وەك ناوێکی سادە، چونکە مەغزای ئێمە بۆ وشەکە فراوانترە لە ماناباوەکەی، هەرچەندە زاراوەی (Image) لەبارتر و شیاوترە بۆ گەیاندنی پەیامەکەمان. چونکە خودی وشەکە لە وشەی (Imitate: لاسایکردنەوە)ی لاتینی وەرگیراوە. فەرهەنگی (Oxford) سەرەڕای مانای (وێنە)، ئەم لێکدانەوانەشی بۆ وشەی (Image) کردووە:[٣٤]

١. بیرۆکەیەکی یان نواندنێکی هزری.
٢. کەسێکێك یان شتێك کە زۆر بە یەکێکی دیکە بچێت.
٣. پێکچوون و گونجان.
٤. نموونە.

---

[٣٣]) سەرچاوەی پێشوو، ل. ٤٤.

[٣٤]) https://en.oxforddictionaries.com/definition/image

لێکۆڵینەوە زانستییەکان، دەمێکە ئەوەیان سەلماندووە، کە لە ناوخێزان و ژینگەی پەروەردەکردنی منداڵدا، هیچ کەسێك ناتوانێ بە قەد دایك کاریگەری لەسەر وێنەی ئەودا هەبێت، کاریگەرییەك کە تا دوا ساتی ژیان لەگەڵ خاوەنەکەیدا دەمێنێتەوە. بۆیە گوتراوە: دایك هاوتای نییە.

کارکردنی (میکانیزمی) ئەو پرۆسە ئاڵۆزە، کتومت وەك ئەو وێنە وایە کە بە کامیرایەك دەگیرێت. هاوڕێیەکەت وێنەیەکی خۆیت بۆ دەنێرێ، تۆ جگە لە شکڵ و ڕوخساری هاوڕێیەکەت، (پشتوێنە: باکگراوند)ەکەشی دەخوێنیتەوە و دەزانی: لە کوێ گیراوە، کەش وهەواکەی چۆن بووە، کات و وەرزەکەی کەی بووە... باری دەروونی هاوڕێکەت چۆن بووە، ئەو گۆڕانکارییانەی بەسەر روخساری داهاتووە چییە؟ بەبەراورد لەگەڵ شێوە و وێنەکانی تری ساڵانی تر چۆن بووە... تاد. بەو واتایەی لەگەڵ گرتەی کامیرایەکە هەردوو وێنەکان (وێنەی هاوڕێیەکەت و پشتەوێنەکە) لە یەك کاتدا تۆمارکراون. لێرەدا، هاوڕێیەکەت منداڵەکەیە و پشتوێنەکش دایکی منداڵەکە.

سەرەتای پەیوەندی نێوان دایك و منداڵ دەگەڕێتەوە بۆ دوو مانگی یەکەمی خەلق بوونی کۆرپەلە زاندان‌دا، لەو تەمەنەدا، کۆئەندامی گوێ دروستدەبێت و کۆرپە دەنگەکانی دەرەوەی زاندانی دایکی دەبیستێ، بۆیە ئێستا لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا، ئامۆژگاری ژنە دووگیانەکان دەکەن، کە دەبێ بە چیرۆك و حیکایەتی خۆش خۆش و ئاوازی لایەلایەی بەسۆز، کۆرپەکانی ناو زاندانیان بلاوێننەوە. کاتێك منداڵ دێتە دونیا، یەکەم وێنەی کە چاوەکانی گەشدەکاتەوە، وێنەی دایکیەتی. دکتۆر (لۆرا ئارنیس فیورستێن Laura Arens Fuerstein) لە کتێبی (دایکیی من، ئاوێنەی من) دا دەونووسی: "لەو چرکە ساتەی کە دێ دایکەوێنە لە زەینماندا چەکەرەبکات، خودوێنەش چەکەرە دەکات. ئەو دوو وێنەیە هێندە ئاوێتە و تێکەڵی یەکترین کە بە هیچ مەقەستێك لێکجودا ناکرێنەوە. تا وێنەکانی دایك زۆرتر و پانتایی جوگرافیایان فراوانتر دەبێ، ئەوا تۆخی و خەستی و چڕیی و پڕی وێنەکان لە هزر و زەینی منداڵەکەدا باشتر دەبریسکێنەوە. کاروان و ڕێڕەوی ئەو دوو وێنەیە (دایکەوێنە و خودوێنە) تادوای تەمەنی منداڵیش هەربەردەوام دەبن لە تۆمارکردنی گرتەی نوێ و تازەدا. بەهەڵەداچوون ئەوانەی وا تێدەگەن، دوای تەمەنی منداڵی وێنەی دایك لەبەر چاوان کاڵدەبێتەوە، نەخێر وانییە، چونکە تا

دڕەنگانێکی تەمەنی هەرزەکاری، وێنەی دایك بەبەردەوامی بەشدارە لە دروستکردن و داهێنانی وێنەی خود. بۆیە ئاساییە لە تەمەنی چل یا پەنجا ساڵیتدا، لە وێنە و هەڵوەیست و ڕووداوی جیاجیای ژیانتدا، دەنگ و ڕەنگ و هاوار و پێکەنین و گریان و جوولە و بۆن و تامی دایکت لە مێشکتدا دووبارە ببنەوە."[35] ئەو پەیوەندییە رۆحییەی منداڵ لەگەڵ دایکی دروستی دەکات، کەمتر لەگەڵ باوك دروست دەبێت، ئەوە جگە لەوەی هەر کە لەسکی دایکی دایە، هەست بەبوونی دایکی دەکات، کاتێکیش کە لەدایك بوو، دەکەوێتە ئامێزی گەرم و گوڕی دایکی و ئەو پەروەردەی دەکات. کوردەواری دەڵێن (ئەوەی لەبەرچاوانە، لەبەردڵانە)، بۆپیاویش وتوویانە (پیاو هەوای دەرەوەیە)، واتا لەکۆمەڵگای کوردەواری دا، پیاو زیاتر، دەچێتە دەرەوەو سەقاڵی کار و کەسابەتە، وێنەی دایك زیاتر لەبەرچاوانە، ئەو هەست و سۆزەی کە منداڵ لەدایکەوە وەری دەگرێت، کەمتر لەباوکەوە پێی دەگات. بۆیە وێنەی دایك ئاوێتەی ناخی منداڵ دەبێت و تێکەڵاوی خودو کەسایەتی دەبێت و بەشێك لە وجودی دایك لە زەین و دەروونی منداڵ دەتوێتەوە و دەبێت بە بەشێك لەو. ئەو شتەی لەتەمەنی منداڵی لای مرۆڤ شکل بگرێت، وادەنەخشێت کاڵ نابێتەوە، سەباح ڕەنجدەر دەڵێ: "وشەی خەون و منداڵی و مردن، بێئاگایم دەجولێنن و لام دووبارە دەبنەوە"[36] کەواتە دەبینین، جیهانی منداڵی لای شاعیر هەرتەنها یادگاری و بەبیرهاتنەوەیەکی ئاسایی نییە، بەڵکو ئاوێتەی نەستی مرۆڤیش دەبی

[35]) Laura Arens Fuerstein. PH, My Mother, My Mirror. New Harbinger Publications, Inc. Oakland, US, ٢٠٠٩, P ٣٨

[36]) سەباح رەنجدەر، دوو کتێب لەبارەی شیعرەوە، چاپخانەی رۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١١، ل ١٠٠

# تــەوەرەی دووەم

# دایــك و كــوڕ

***"دایە گیان! مـن ڕۆحـم نییە، ئەوە ڕۆحی تۆیە لە ناخ و جەستەی مـن دایە."***

(جان جاك ڕۆســۆ)

## ١- بۆچی منداڵ هەر وابەستەی وێنەی دایك دەبێ و وێنەی باوك غائیبە؟

لە زۆربەی کۆمەڵگاکاندا، بە گشتی، منداڵ لە تەمەنێکی نەختێ هەراشدا، لەلایەن باوکییەوە دەگرێتە باوەش، تەمەنێك کە زۆر جیاوازە لەو تەمەنەی کە دایکی لە باوەشیگرتووە. چون؟ منداڵی ساوە، بونەوەرێکی لاواز و بێهێز و بێدەسەڵاتە، ناتوانێ خۆی خۆی بژێنێت، وەك بێچوە کەو و بەچکە کیسەڵ نییە خۆژی بێت، ئەو هەمیشە پێویستی بە یارمەتیدەر و پشتیوان هەیە، قەت کەسیش نییە وەك دایك یارمەتیدەر و پشتیوانی جەرگسۆز و ئەمەکداری بێت. هەرچی باوکە، درەنگ منداڵ دەگرێتە باوەش و دەتوانین بڵێین ئەسڵەن ئەو منداڵە زۆر بەپەرۆشی ئەو باوەشە نییە. چونکە زۆربەی پێویستییە بنەڕەتەکانی ئەو لەلایەن دایکییەوە بۆی دابینکراون. لە هەمووشیان گرینگتر وێنەفانتازییەکانی دایکە. دکتۆر(لۆرا ئارنیس فیورستێن Laura Arens Fuerstein) زۆر ئەکادیمییانە ڕۆڵی ئەو وێنە فانتازییانەی دایکمان بۆ ڕاڤەدەکات و دەڵێ: "لە سەرەتای تەمەنی منداڵیدا، ئەقڵی بێئاگا هۆشیارترە لە ئەقڵی بەئاگا. هەموو ئەو ڕەفتارانەیە کە دایك دەینوێنێ لە خەندە و پێکەنین و گەمەکردن و گفت ولتف، پڕن لە وێنەی فانتازیایی، تەنانەت توڕەیی و هاوارەکەی ئەو خاڵی نییە لەو تەرحە وێنەیە. جا زانستییانە سەلمێندراوە کە وێنەی فانتازیایی باشتر و خێراتر و زووتر و زۆرتر لە ئەقڵی بێئاگایدا دەمێننەوە، ئەوا کە منداڵەکە گەورە دەبێ و ئەقڵی بەئاگایی باشتر نشونما و گەشەدەکات، وێنەکان لە هزر و هۆشی ئەودا دووبارە و سەدبارە دەبنەوە. ئەمە هۆکارێکی بنەڕەتییە کە وێنەی دایك پتر لە وێنەی باوك لە بونیاتی خودوێنەی منداڵ ڕۆڵی هەیە "[٣٧]

ئەمە بایەخ و بەهای وێنەی فانتازیایی نیشاندەدا، کە زۆر لە ڕۆمانووس و شانۆنووس و سینەمەکارەکان لە بەرهەمەکانیاندا پشتی پێدەبەستن، چونکە وەك لێرەدا ڕوونکرایەوە، وێنەی فانتازییایی کاریگەری بەهێزترە لە وێنەی ئاسایی .((فرۆید بە شێوەیەکی بنە بڕ باوەڕی وایە، کە

---

[٣٧]) Laura Arens Fuerstein. PHD, My Mother, My Mirror. New Harbinger Publications، Inc. Oakland, USA, ٢٠٠٠, P ٣٧

ناوەرۆکە نەستییەکان لە ئەقڵی مرۆڤدا زۆر زۆرترن لە ناوەرۆکە هەستیانەی کە تێیدان.))[38] نەست شتێکی شاراوە و ناوەکییە لە ڕەفتاری مرۆڤـ ڕەنگ دەداتەوە، "دایك وێنەیەکە لـەژیان، ڕەمـزی خۆشەویستی و سۆزدارییە و سەرچاوەی دڵدانەوەشە"[39] بۆیە مرۆڤــ هــەم هەســتی پێــدادا، هــەم نەستی بەرە و ئەو ئاراستەی دەبات کە هەست بەو پەیوەندییە و بەو خۆشەویستییە بکات.

لێرەدا خاڵێکی زۆر بایەخدار هەیە، چونکە مرۆڤـ توانای یادکردنە و بەبیرهاتنەوەی هەیە، هەمیشە دایکەوێنە، لە دووبارەبوونەویەکی بێ بچرانەوە، لە مێشکی مرۆڤدا کاریخۆی دەکات و وەك پەینی کیمیاوی هەمیشە خودوێنە بەهێز دەکات و بەرهەمی نوێتری بـۆ دەهێنێتەکایـەوە. بەڕاستی شاعیرێکی وەکو لەتیف هەڵمەت زۆر قەرزاری ئەو دایکەوێنانەیە، بە بەڵگـەی ئـەوەی لە تەمەنی (٦٥)ساڵیدا لەسایەی ئەو وێنانەوە، شیعری تەمەن (١٧) سـاڵی دەنووسـێ. بۆیـە ناحەقی (نزار قبانی)ناگرین کە دەڵێ:

***دایەگیان،چۆن***
***دایەگیان ئاخر چۆن***
***وا بووم بە باوك و***
***هەر گەورە نەبووم؟***[40]

نابێ باوکان، لێومان لێهەڵقرچێنن، گەر بڵێن، بە گشتی باوکەکان نەك هــەر نــاتوانن وەك دایك وێنەی فانتازیایی بۆ منداڵەکانیان دابهێنن و شارەزاییان لەو هونەرەدا کەمــە، یــان هــەر

---

[38]) ئەحمەد حیدوش، و. دێرەوان محەمەد، گەڕان بەدوای نەست لەدەقی ئەدەبی دا، گ.کاروان، ژ: ١٢٥، ١٩٩٩، ل ١٠ ـ ١١

[39]) هەڵمەت بایس ڕەسووڵ، ڕەهەندی دەروونی لە چیرۆکەکانی شێرزاد حەسەن دا، چاپخانەی موکریان، هەولێر، ٢٠١٢، ل٢٠٠

[40])http://www.adab.com/modules.php?name=Sh٢er&doWhat=shqas&qid=

ف. شـەوڕۆ کردوویەتییە کوردی ١٦

نییانە، بەڵکو زۆرجار بە ئەنقەست یان بێئەنقەست، وێنە فانتازییاکانی دایك بـە شـتێکی بـێ بایەخ تەماشادەکەن و لە دڵڕا هەوڵی لاسایکردنەوەیان نادەن.

**٢- دایـك و کـوڕ**

دەکرێ سەرەتای سەدەی بیست وەك گڕکانێکی ئاوس تەشبیە بکەین، کە چەندان ساڵ بوو بەدوای درزێك دا دەگەڕا تا لە نزیکترین دەرفەتدا بتەقێتەوە و ئەوەی لە ناخیـدا حەشـاری داوە دەریهاوێژێتە دەرەوە. گڕکانەکە خێزانە و درزەکە زانستە مرۆییەکانە و تەقینەوەکە، تەقینەوەی زانستی کۆمەڵناسی و دەروونناسییە، کە ئێمڕۆ بـە دەیـان لقیـان لێبۆتـەوە و سـەدان خـەرمان کتێبیان خستۆتە بەر دەستی خوێنەران. دوای پەلپەلکردنی کۆمەڵگا بۆ چەندین توێـژ و چـین و بەرە، کەوتنە پەلپەلکردنی پێکهاتەکانی خێزان، ئەوجا توێکاری و شتیتەڵکاری یەکـە یەکـەی ئەندامەکانی ئەو خێزانە لـە ڕووی کۆمەڵناسـی و دەرووەنناسـی و دەروونناسیکۆمەڵناسـییەوە ئەنجامدرا. بۆیە لێرەدا ئاساییە تەوەرەیەکی سەربەخۆ تەرخان بکەین بۆ پەیوەندی (دایك و کوڕ و کـوڕ و دایـك) کـە دەڵـێن سـەدەی بیسـت سـەدەی تەقینـەوەی زانسـتی دەروونناسـی و کۆمەڵناسییە، بەو مانایە نا، پێشتر ئەوان نەبووبێتن، لێ لـەم سـەدەیەدا ئـەو دوو زانسـتە لـە تاقیگەکاندا بە ئەزموونی پراکتیکی، دروستی نادروستی تیۆرییە کۆنەکانیان ساغکردەوە و بـە زانیاری سەردەمییانەی جۆشدراو بە سەرچاوەی باوەڕ پێکراو، دەوڵەمەندتریان کردن.

توێژینەوە دەروونناسییەکان، پەیوەنـدی نێـوان دایـك و کـوڕ بـۆ سـەردەمێکی زۆر کـون دەگەڕێننەوە، بۆ دەووروبـەری (٤٤٠ پ. ز.)، ئـەو کاتـەی کـە (سـۆفۆکلیس Sophocles) دەربارەی(ئۆدیپیۆس ڕیکس Oedipus Rex) ـ ئەو کوڕەی باوکی خۆی دەکوژێـت و لـە گـەڵ دایکیدا دەخەوەێ، دەنووسی. جا کاتێك دەروونناسی ناسـراو(سـیگمۆند فرۆیـد Sigmund-Freud١٨٥٦-١٩٣٩) لـە توێژینەوەیـەکی زانسـتیدا، تیـۆریی(گرێـی ئـۆدپ Oedipal Complex)ی داهێنا، جۆری شیتەڵکاریی پەیوەندی دایـك و کـوڕ و کـۆڕ و دایـك قـالبێکی دیکەی وەرگرت. پووختەی تیۆرییەکە ئەوەیە:" کوڕان لە نێوان (٣ ـ ٥) ساڵێدا حەز لە دایکی

خۆیان دەکەن مەیلیان بۆ باوکیان کاڵ دەبێتەوە. بۆیە کە گەورەش دەبن وێنەی بـاوك وەك هـی دایك لەلایەن خۆشەویست نییە. هەرچەندە دەستەیەك لە دەروونناسان ئەمە بە لێکدانەوەیـەکی ناپەسند دەزانن، لێ تاکو ئێستاش ئەو تیۆرییە هەوادارانی خۆی هەر هەیە"[41].

لە ڕاستیدا، کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتی، تێڕوانینی جیاوازیان بۆ کوڕ هەبووە، ئەوەتا لە لای عەرەبەکانی سەردەمی جاهیلی، تا هاتنی ئایینی ئیسلام، کـچ زۆر جـار زیندەبەچـاڵ دەکـرا و شەرەفی هۆز و ئێلات لە شەرەفی کوڕدا بووە، بەڵام هەمووشی هەروا نەبووە، لە لای بوودییەکان ڕۆژی لەدایك بوونی مێیینە وەك جەژن، بە چاوێکی پیرۆزە سەیرکراوە.

لە ناو کوردەواریشدا، دایك کوڕی بە سەرچاوەی هێز و سامان داناوە و کچیش بە خـەمخۆر و دەستگر. ئێستایش کە ژنێك دوعای خێر بۆ ژنێك یان کچـێك دەکـات دەڵـێ: " یـا ڕەبـی خوایە، بە داکی حەوت کوڕان بی." نەمانبیستووە، پیاوێك ژنـی بەسـەر ژنەکەیـدا هێنـابێ، چونکە کچی نەبووە، بەڵام ئاسایە کە بۆ کوڕ، ژنی دووەم، بگرە سێیەمیشی هێنـابێ! جـاری واش بووە ژنە، تەسلیمی واقیعەکە بووە و هیچ لاری نیشان نەداوە کـە بیـانوی پیاوەکـە لـە هێنانی ژنی دووەم (کوڕ) بووە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، حەزیان نەکردووە، کوڕەکانیان هەمیشە لە باوەشی دایکیان دابن، چونکە بەلای ئەوانەوە ئاساییە کچ ببێتە کچی دایکی، بەڵام نـابێ کوڕ ببێتە کوڕی دایکی، بـۆ؟ چـونکە ئـەو کـوڕەی زۆر دایـك نـازی بـداتێ بـە ترسـنۆك و بێدەسەڵات سەیردەکرێ. ئێستاش، هەر بۆ نموونە، بە پیاوێکی لاواز دەڵـێن (کـوڕی داکـێ)، واتا پێیان باش نەبووە، کوڕ(داکۆنی) بێت، پێیان باش بـووە (بابۆنی)بێـت و سـیفاتی بـاوك وەربگرێت.

---

[41])http://oureverydaylife.com/psychology-motherson relationship-46250.html

تۆژینەوەکان بنەما و سەرچاوەی خۆشەویستی دایك بۆ کوڕ (هەروەها بۆ کچیش) دەگەڕێننەوە بۆ سۆز، حەز دەکەین لێرەدا، زانستییانە وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەینەوە: سۆز چییە؟ چۆن پەیدا دەبێ؟ دەکرێ وەك نووسین و خوێندنەوە، مرۆڤ فێرە سۆز بکرێت؟ دەکرێ شێوازەکانی سۆز بگۆڕین؟ نهێنی سۆزی دایك لە چییدایە؟ سەرتا "مەبەست لە ئەرکی سۆزداری بریتییە لە بزواندن و دەبڕینی هەست و سۆزی خودی و دەروونی...پیشاندانی وەفا خۆشەویشتی بۆ کەسێك یان بۆیاد و بۆنەیەك." [٤٢]

لە ساڵی (١٨٨٤) دا زانای دەروونناس( ولیەم جێمز William James) (١٨٤٢ـ ١٩١٠) پرسیارێکی ورووژاند کە ئێستاشی لەگەڵدا بێ هەر کتێبی نوێی لەسەر دەنووسرێت، پرسیارەکەش ئەوە بوو: سۆز چییە؟ نامانەوێ لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا سەر بە دەرگاکانی فەلسەفەدا دابگرین، دەنا دەبێ بۆ دوو هەزار ساڵێك پێش ئێستا بگەڕێنەوە، کە ئەرستۆ بۆ یەکەمین جار وشەی (Pathos) گریکی بۆ سۆز بەکار هێنا و بەم شێوەیەش پێناسەی کرد: " سۆز هەموو ئەو هەست و مەیل و حەزانەن کە مرۆڤ هاندەدەن بۆ گۆڕینی بیروبۆچوونەکانی لەکاتی هەڵسەنگاندن و نرخاندن و حوکومداندا، ئەمیش هەمیشە وابەستەی خۆشی و شادمانی و نیگەران و نارەحەتی و ژان و ئازارە. ئەمەش هەموو شێوە سۆزەکان و دژە سۆزەکان دەگرێتەوە وەك توڕەیی و بەزەییپێداهاتنەوە و ترس و هەڵچوون.... تاد." [٤٣]

بە پێی ئەو پیناسە کلاسیکییە گریکییەی ئەرستۆ، سۆز دەرهاویشتە و بەرهەمی ئەنجامدانی کارێك یا ڕووداوێکی دیاریکراو نییە، بەڵکو هەڵوێستێکە هەڵقوڵاوی ئە و کارەیە، بۆنموونە سووتان نابێتە هۆکاری دروست بوونی سۆز، بەڵام سووتانی منداڵێك بە بەرچاوتەوە،

---

[٤٢]) نەسرین رەئوف ئیسماعیل، ئەرکی شیعر لە ئەدەبی کوردیدا، ساڵانی ١٩٢٠–١٩٥٨، چاپخانەی رۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١٠، ل ١٨٠ ـ ١٨١

[٤٣]) Jan Plamper، Translated by: Keith Trib، History of Emotion، Oxford University، UK. Ox٢٦DP، ٢٠١٥، PP.١١-١٢

دەبێتە هاندەر بۆ هەڵویست وەرگرتن، کە بێگومان تۆ لەم حاڵەتەدا چەپڵە و هەڵهەلەی بۆ لێنادەی، بەڵکو بەزەیت پێدادێ. بە واتایەکی دیکە ئەم پێناسەیە دەچێتە خانەی (حوکومدان) لەسەر شتەکان، کە ئەمەش مایەی ڕەخنە و توانجی زۆرە.

هەرچی پێناسەکانی جیهانی لاهوتە بۆ سۆز، زۆربەیان سۆز بە بەزەیی و ڕەحم و بەخشندەیی خوداوە دەبەستنەوە. دواتریش ڕۆشەنگەراییەکانی ڕۆژئاواش، سۆزیان لە دەرەوەی خوداپەرستی دانا و وابەستەی سروشتیان کردەوە، هەر دوو سروشتەکە: سروشتی ژینگەی ناخی مرۆڤ و سروشتی ژینگەی هەسارە.[٤٤]

سەبارەت بە سۆزی شاعیرانیش ئەوا "مەبەست لە سۆز ئەو هەڵچوون و حاڵەتە حەماسییەیە کەشاعیر بەهۆی ڕوداوێکەوە لەخۆی داهەستی پێدەکاو دەیەوێ لەو هەست و ئیحساسەی خۆی دا خوێنەر یان بیسەر لەگەڵ خۆی هاودەم و هاوبەش بکات."[(٤٥)]

بە کوردی و کرمانجی لەم سەردەمەدا، لە تێکەڵەیەکی زانستییانەی بۆچوونە جیاوازەکانی دەروونناسی و ئەنترۆپۆلۆژی و مێژووی و فیسۆلۆژی و زانستی دەمار، دەربارەی (سۆز) زانستێکی نوێ داهێنراوە بە ناوی (سۆزناسی یان زاستی سۆز) (Emotionology).

وا چەند خاڵێکی بایەخدار، لە زانیارییەکانی ئەم زانستەتان دەخەینە بەرچاو: کە دەڵێ: لە ناو هەموو نەتەوەکانی جیهاندا:

- وشەی تایبەت هەیە بۆ دەستنیشانکردن و نیشاندانی هەست (Feeling).
- هەستەکان دوو جۆرن: خۆش و ناخۆش، چاك و خراپ.

---

[٤٤]) سەرچاوەی پێشوو ل ١٣٢

٤٥) د. محمد رضا شفیعی کدکنی، صور خیال در شعر فارسی، تحقیق انتقای در تطور ایماژ های شعر پارسی وسیر نظریة بلاغت در اسلام وایران، انتشارات آگە، چاپ نهج، تهران ١٣٨٣، ص ٢٤

- له هەموو کەلتوورەکاندا، ڕوخساری مرۆڤەکان بە هەست دەبەستنەوە.
- زمانی جەستە هاوتای وشەکانی هەستە، وەك خەندە و گریان...تاد.
- هەموو زمانەکان وشەیان هەیە بۆ بەستنەوەی هەست بە:
    - بیرۆکەی ئەوەی کە ڕەنگە شتێکی خراپم بەسەر بێ.
    - بیرۆکەی ئەوەی کە دەبێ من کارێك ئەنجام بدەم.
    - بیرۆکەی ئەوەی کە ڕەنگ بێ خە ڵك خراپ تەماشام بکەن یان بیرم لێبکەنەوە.
- له هەموو زمانەکاندا بۆ زمانی جەستە لە نیشاندانی هەستەکان ڕەمز و هێمای دیاریکراو هەیە. کە ئاوێنەی ناخی مرۆڤن و شاردنەویان زەحمەتە.
- دەکرێ زمانی سۆز هەم لە ڕێی ئاخەوتن و هەم لەڕێی وێنەگەریدا دەربڕێن. مەبەست لە وێنەگەریی: نووسین و وێنە و ئیمیج و نمایش و هونەرەکانی دەربڕینە.[٤٦]

## سەرچاوە یان مەکۆی سۆز لە کوێیە؟

بۆ یەکەمین جار لە مێژوودا، زانای توێکاری جەستە(کارڵ ف. بورداخ Karl F. Burdach ١٧٧٦ – ١٨٤٧ )ی ئەڵمانی نەژاد، لە ساڵی(١٨١٩) زاراوەی (Amygdala) ی بۆ ئەو شانەیە بەکارهێنا کە لە مێشکدا مەکۆی سۆزە و قەبارەکەی بەقەد دەنکەباوییەکە، زاراوەکەش لە زمانی لاتینی مانای (دەنکە باوی) دەدات. خۆشبەختانە، لە سایەی ئەو پێشکەوتنە تەکنەلۆژیاییەی سەردەم، لە ساڵی (٢٠٠٩)، لە پەیمانگای توێکاریی(Charitē) بەرلین، کە بەناوبانگترین سەنتەری توێکارییە لە هەموو ئەوروپا، زانای توێکاری (جان پلەمپەر Jan Plumper) بەچاوی خۆی ئەو دەنکەباوییەی ناو مێشکی بینی، کە دەکەوێتە لای پێشەوەی بەشی ڕاستەی مێشك.

---

[٤٦]) Jan Plamp،Translated by: Keith Tribe، History of Emotions، Oxford Universit، UK. Ox٢٦DP، ٢٠١٥، P. ١٣٣ (کتێب)

دکتۆر (جۆزیـف لـەدۆکس Joseph Le Doux) لـە کتـێبی (مێشـکی سـۆزدار The Emotional Brain) دا دەنووسیٚ: خانەکانی (Amygdala) بەرپرسی ترس و سۆزی مرۆڤـ و گیانلەبەرەکانن، بۆ نموونە کە (چاو) پەتێك لەسەر زەوی دەبـینی ئـەوە یەکسـەر خانـەکانی (Amygdala) بە گەڕدەکەون و دەکەونە گەڕان و پرسیارکردن:

- ئەمە پەتە یان مارە؟
- ئەگەر مارە زیندووە یان مردووو؟
- ئەگەر زیندووە ژەهردارە یان ژەهردار نییە؟
- ئەگەر ژەهردارە لە دۆخی پەلاماردان دایە یان هەڵاتن؟
- ئێستا من چی بکەم باشە؟ وازی لێبێنم، ڕاکەم، بیکوژم، یان یاری لەگەڵ بکەم؟

ئەم پرسیارانە لە هەزارەها بەشی چرکەیەك لـە نـاو مێشـکدا ڕوودەدەن. دوای بڕیـار دان، ئەوە(Amygdala) یە کە فرمان بـە ماسـولکەکانی لـەش دەدات بڕیارەکـە جێبەجێبکـەن. زانست ئیمڕۆ دەیەویٚ دەستکاری ئەم (Amygdala) یە بکات لە بەرژەوەنـدی مرۆڤایەتیـدا. بۆ نموونە لە هەوڵی ئەوەدان چۆن وابکەن سەرباز نەترسێت و منداڵ لە ترسان ڕزگار بکەن![٤٧]

---

[٤٧]) Joseph Le Doux، The Emotional Brai، Simon and Schuste، USA، ١٩٩٦، PP

(کتێب) ٣-١

## ناتوانی (دایك)ی لەبیرخۆی بباتەوە و کردویەتی بە شاڕەمزی شیعرەکانی؟

پێش ئەوەی وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە کە لە لەچوارچێوەی پەیوەیوەندی (دایك و کوڕ و کوڕ و دایك) دایە، با نەختێ قسە لەسەر سۆزی دایك بکەین، دوای وەرگرتنی ئەو زانیارییانەی سەرەوە.

خۆ مێشکی ژن و پیاو (نێر و مێ) ئەو شانەی (Amygdala) ی تێدایە، کەواتە بۆ باوك وەك دایك سۆزدار نییە؟ پرسیارێکی جوانە.

جیاوازی لە نێوان کارکردنی چاوی ئاسایی و گەدە ئەوەیە کە چاو ئامێرێکە تەنیا بە کردنەوەی پێلوەکان دەتوانی شتەکان ببینێ، هەرچی گەدەیە ناتوانی خۆی خۆی تێربکات، هەمیشە چاوی لە دەستە پاروە نانێکی بداتێ، کتومت شانەی (Amygdala) وەکو گەدە وایە هەمیشە دەبێ کارێك یان ڕووداوێك بە سۆز تێری بکات دەنا لە خۆڕا نابێتە خاوەن سۆز. جا کاتێك بەراورد لە نێوان چالاکی (Amygdala)ی دایك و باوك دا دەکەین دەبینین، کە هی دایك دەیانبار چالاکترە لە هی باوك و بەبەردەوامی خەریکی کۆکردنەوە و داگرتنی سۆزە نوێیە گەرم وگۆڕەکانە. چۆن؟ ئەوە دایکە کە کۆرپە لە زاندانی خۆیدا هەڵدەگرێ، لە یەکەم ساتەوەختی دروست بوونی ئەو کۆرپەڵەیە، پەیوەندی نێوان دایك و منداڵ دروست دەبێ، کتومت وەکو بینینی (سەرە پەتەکە)وایە، هەمیشە پرسیار لە دوای پرسیار مێشك و هزری ئەو دایکە (دەربارەی کورپەڵە و منداڵ و بەخێوکردنی) دەورووژێنن. لە کاتێکدا باوك ئەو ئەزموونەی نییە، ئەسڵەن ئاساییە کە چەند مانگێك بێ دایکەکە دووگیان بێت و باوکەکە پێشی نەزانی بێ. ئەوە جگە لەو حاڵەتانەی کە باوەکەکە نەك لە کاتی دووگیانی دایکەکە، بەڵکو لە کاتی هاتنە دونیا و گەش و نماکردنیشی لە ماڵ ومنداڵەکەی دوورە ـ بەهەر هۆکارێك بێ ـ ئەمانە هەموو وادەکەن باوك مەحروم بێ لەو گەنجینەیەی کە بەردەوام دایك لە (Amygdala)ی خویدا ئاماریان دەکات. ئەوە جگە لە پەیوەندییە جەستەیی و ڕۆحییەکەی نیوانیان کە دایك خۆی بە خولقێنەری منداڵەکە دەزانێ و ڕۆحی ئەو بە بەشێك لە ڕۆحی خۆی

یان درێژکراوەی ڕۆحی خۆی دەزانێ. ئێستا دەکرێ لەم قۆناغەدا پرۆسەی (دایکەوێنە) و (خودوێنە) ئاوەژوو بکەینەوە و بیکەینە پرۆسەی(دایکەوێنە) لەناو (دایکەوێنە) دا. چۆن؟ هەر جارەی ئەو دایکە سەیری ئەو منداڵەدەکات، خۆی دەبینێ یان ئەو بەشانەی پەیوەستن بەوەوە و لە منداڵەکەدا دەبینێ. زۆر ئاسایە کە بڵێ: چاوی کوڕەکەم لە چاوی باوکم دەکات و لووتی لەهی دایکم دەچێ و لیوی لە هی نەنکم...تاد. بەڕاستی (٩) مانگ کەم نییە کە بەبەردەوامی دایك دەربارەی ئەو کۆرپەڵەیە شت تۆماردەکات و لە ناخی خۆیدا دەیچێنێ. ئەگەر باوك سکی ئازارێکی هەبێ، ئەوە ئەو هەر خەمی خۆیەتی، بەڵام ئەگەر سکی دایك ژان بکات، ئەوە دایکە کە خەمی خۆی و خەمی کۆرپەڵەکەی ناو زیاندانیەتی! بێ گومان ئەمە بۆ کوڕ وکچ وەك یەکە، بەڵام چونکە (زۆربەی) دایکەکان، کوڕیان لە لا بەنرخترە لە کچ، هۆشی بێئاگا پتر شتەکانی جیهانی کوڕ هەڵدەگرێت و بە هەندییان دەزانێ.

ئێستا با بگەڕێینەوە، لای سۆزی کوڕەکە (کە لەتیف هەڵمەت لێرەدا نموونەیە) و وەڵامی پرسیارەکەی سەرەوە بدەینەوە، کە بۆچی لەتیف هەڵمەت ناتوانی (دایك)ی لەبیرخۆی بەرێتەوە وکردویەتی بە شارەمزی شیعرەکانی، خۆ زۆر شاعیر و ئەدیبی دیکەش دایکیان کۆچی دوایی کردووە؟ لەڕاستیدا پەیوەست بوونی ئێمە بەمەرگ، لەمنداڵییەوە تاکو گەورەیش توشی پەرۆشی ڕۆحی کردووین، چونکە بەبەرچاومانەوە کەسە خۆشەویستەکانمان دەمرن[٤٨]

هەمیشە مردن یەکسانە بە لەدەستدان، لە نێو هەموو کەلتوورەکانیشدا لەدەستدان گرێدراوە بە خەم، لە کاتێکدا ڕووبەر و قوڵایی و پانتایی ڕەهەندەکانی لەدەستدان زۆر لە خەم گەورەترن، چونکە لەدەستدان زۆر جۆری هەیە وەك:

- لەدەستدانی جەستەیی(Physical Loss): واتا لەدەستدانی شتێك هەتاهەتایە نەتوانرێت جارێکی دیکە بیبینیتەوە، مردن لەم جۆرەیانە.

---

[٤٨] ) نویسندە: لیس تایسن، ترجمەی: مازیار حسین زادة، فاطمة حسینی، نظریە های نقد ادبی معاصر، تهران، ١٣٧٨، ص ٥٤

- لەدەستدانی پەیوەندارییی (Relational Loss): وەك دەستبەرداری نێوان دوو دڵدار.
- لەدەستدانی جەفەنگی (Symbolic Loss): ئەمەیان پەیوەستە بە جیهانی ڕۆح و دەروون و ناخی مرۆڤەکانەوە، ئەمە نە بە چاو دەبینرێت و نە بە دەست هەستی پێدەکرێت، وەك لەدەستدان و نەهاتنەدی حەز و خەون و مراز و ئاواتەکانی مرۆڤ. دەکرێ مردن ببێتە خەمی لەدەستدانی جەفەنگی.
- لە دەستدانی ڕاز ومراز (Anticipatory Loss): وەك بێهیوای بوونی نەخۆشێك کە هەم ڕەنگ بێ ئەندام و ئۆرگانێکی لەشی لەدەستبدات و هەم خەون و مرازەکانی نەێنەدی و هەم خزم وخوێش دەستبەرداری بن. بەواتایەکی دیکە ئەم لەدەستدانە نزیك بوونەوەیە لە مردن بەقوونەخشکێ.[49]

قورسترین و ناخۆشترین لەدەستدان ئەو جۆرەیە کە خەمێك لەگەڵخویدا دەهێنێ، پێیدەگوترێت(خەمی بێبەریکردن Disenfranchised Grief)، ئەویش بەم جۆرەیە: لەکاتی لەدەستدانی کەسێکی ئازیز، وەك دایك و باوك و خوشك و برا، خەڵکانێکی زۆر لە خزم و دۆست و ئەحباب لە دەورت خڕدەبنەوە و هاوخەمی خۆیان نیشاندەدەن، بەڵام هەرگیز ئەوان ناتوانن هەست بەو ئازار و ژان و خەم و موعاناتانە بکەن کە تۆ هەستی پێدەکەیت، ئەمە لە لایەك، لەلایەکی دیکە بۆ تۆ ئەو خەمە بەردەوامە و لێت دوورناکەوێتەوە، لە کاتێکدا بۆ ئەوانەی دیکە هەر ئەو ساتەیە کە لەگەڵت ڕاوەستاون. ڕووبەڕووبوونەوی تۆ بە تاق وتەنیا لەم لەدەستدانەدا، پتر شپرزەت دەکات و خەمت بەسەرردادەبارێنێ.

لێکۆڵینەوەکان، ئەمەیان سەلماندووە کە مێینە بەتایبەتی کچ پتر دەکەوێتە ژێر کاریگەری لەدەستدانی باوان و خەم و پەژارە هەڵدەگرێ، لێ هەمان لێکۆڵینەوە، گەیشتووتە

---

[49]) https://en.wikipedia.org/wiki/Mother_Nature

ئەو ئاکامە کە ئەمە بۆ منداڵی هەرزەکاریش ڕاستە، هەرچەندە بە گریان وەك کچەکان ئەو خەمە دەرنابڕن (ئەمە لەتیف هەڵمەتیش دەگرێتەوە).

خۆ ئەگەر لەتیف هەڵمەت خەمەکانی لەدەستدانی دایکی بۆ ئێمە لەو دەقە شیعرانەدا بەرجەستە نەکردبا ئێمە پێمان نەدەزانین. بەڵام بۆ وا ئەم شاعیرە خووی بەو شیعرانەوە گرتووە کە وابەستەی دایکن؟ "شیعر بە زنجیرەیەکی گەورەی پێکهاتەی دەروونی تاك بەستراوەتەوە و وەزیفەی دەروونی خۆی هەیە" [50] و لە مەشاعیرەکانی شاعیرەوە هەڵدەقوڵێ، بەبێ کار و کاردانەوە، شیعر نانووسرێ، بەڵام" سروشتی خود لای هەموو شاعیر و نووسەرێك ڕۆڵێکی سەرەکی و گرینگ دەگێڕێ بۆ لە دایك بوونی هەر بەرهەمێك و بەرزی و سەرکەوتوویی داهێنانی هەر شاعیرێك. واتا ئەزموونی شاعیر چاوگەی هەموو کارێکی ئەدەب و هونەری مەزن و نەمرە."[51]

ئیمڕۆ زانستی دەروونناسییکۆمەڵ زۆر بایەخی بە هەڵس وکەوت و ڕەفتاری تاکەکان لە بازنەی کۆمەڵدا دەدات. بۆ نموونە لە ساڵی (١٩٧٠) وە پسپۆڕانی ئەم بابەتە بەدوای وەڵامی ئەو پرسیارە دا دەگەڕێن: بۆ هێندێك دیاردەی پەیوەست بە سۆز، چەندان جار لە مێشك دووبارە دەبنەوە و بە زیندووی خۆیان نیشان دەدەن؟ دوو زانای دەروونناس(لەنج و کارڵ جۆرج Lange and Carl George) لە لێکۆڵینەوەکانیدا گەیشتنە ئەو ئەنجانە کە کاتێك مێشك زەبرێکی بەردەکەوێ، هێندێك شت لە دەستدەدات و هێندێ شت پەیدادەکات کە پێشتر نەیبوو، جا ئەو زەبرە ماددی بێ وەك کێشانی گۆپاڵێك بەسەری یەکێکدا، یان مەعنەوو بێ،

[50]) خەزعەل ئەلماجدی، و. عەبدولموتەڵیب عەبدوڵڵا، عەقڵی شیعری، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل ٦٣

[51]) ڕزگار عومەر فەتاح، ڕۆمانسیزم لەشیعری هێمن و محەمەد نووری دا، چاپخانەی موکریان، هەولێر، ٢٠١٣، ل ١٠٧

وەك مردنــی یــان لەدەســتدانی ئازیزێــك. ئــەوان لــە كتــێبی(ســۆزداری، لێكۆڵینەوەیــەكی دەروونناسی كۆمەڵایەتییە(A Psychobiological Study،Emotions )

ئەم نموونەیان بۆ ساغكردنەوەی بیرۆكەكــە هێناوەتــەوە: كرێكــارێكی هێڵــی ئاســن، شیشــە ئاسنێكی بە ســەری دەكــەوێت و كەللەســەری كونــدەكات و لــە ژێــر جەناگــەی دەردەچــێت. خۆشبەختانە نەخۆشەكە لە دوای نشتەرگەری لــە مــردن ڕزگــاری دەبــێ، بــەڵام چــاوێكی لــە دەستدەدات، كرێكارەكە دوای چاكبوونەوەی دوو گۆڕانكاری بەسەر ڕەفتاری داهات، یەكێكیان ئەوەبوو هەمیشە شیشە ئاسنێكی لەشێوەی ئەو شێشە ئاسنەی لەسەری چەقیبوو لەناو دەستی خۆی دەگرت، دووەم، هەمیشە شتی ئەوتوی لەبەرخۆیەوە دەگوتەوە كە پێشتر نە كردبووی و نە گوتوبووی.[٥٢]

لێرەدا ئەگەر لەتیف هەڵمەت لە شوێنی كرێكارەكە دابنێین، ئەوا بەراوردەكە بەم شــێوەیە دەبێ: مردنی دایكی لەتیف هەڵمــەت ئــەو شیشــە ئاســنەیە بەســەری كرێكارەكــە دەكــەوێ، لەدەستگرتنی قەڵەم و كتێبەكانی، ئەو شیشە ئاسنەیە كە هەمیشە كرێكارەكە لە مستیدایە، ئەو شیعرە نەگوتراوانەی لــەتیف، ئــەوە ئــەو وڕێنــە و قســانەیە كــە كرێكارەكــە بــەردەوامی دەیانڵێتــەوە. ئێســتا چــەندان خانــە لــە مێشــكی لــەتیف هەڵمەتــدا شــەو و ڕۆژ خــەریكی لاسایكردنەی ئەو وێنە و جولە و یادەوەریانەن كە دایكی بە میرات بــۆی بەجێهێشــتووە، ئــەو كۆمەڵە دەمارەی وەك ئاوێنە ئەو شتانە بە تایبەتی(ســۆز و ســۆزداری) لە مێشكی كەسێكدا نیشاندەدەنەوە پێیان دەگوترێت (شانە هەستەدەماری ئاوێنەیی Mirror Neurons).[٥٣]

---

[٥٢] ) Lange and Carl George، Emotions، A Psychobiological Study، Translated by Istar A. Haupt، Baltimore: Williams & Wikins، ١٩٩٢، P ١٩٤ (كتێب)

[٥٣]) سەرچاوەی پێشوو ل. ٣٠٦

بڕوانە هێڵکاریی بەراوردەکە:

| کرێکارەکە | لەتیف هەڵمەت |
| --- | --- |
| زەبری بەرکەوتوو (ماددی) | زەبری بەرکەوتوو (مەعنەوی) |
| شیشە ئاسنێك | کۆچی دایك |
| لەدەستدانی چاوێك | لەدەستدانی ئازیزێك |
| گۆڕانکاریی ڕەفتاریی | گۆڕانکاریی ڕەفتاریی |
| شیشە ئاسنێك لەناو مست | قەڵەم و دەفتەر لەبەردەست |
| گۆڕانکاریی ئەقڵی | گۆڕانکاریی ئەقڵی |
| وڕێنەوە و گوتن | شیعرنووسین و داهێنان |
| بەردەوام بوون | بەردەوامبوون |

(بەراوردیی نێوان دوو مێشکی زەبربەرکەوتوو)

ئەمەیش لە ڕووی کارکردنی فیسۆلۆژیدا دا، پەیوەندی هەیە بە گرژبوون و فراوانبوونی لوولەکانی خوێن لە لەشدا، کە ڕۆڵیان لە دووبارەکردنەوەی سۆزەکاندا هەیە لە مێشکدا. "دەتوانین ئەوە ساخ بکەینەوە، کە فەتازیای شاعیر ئاوێنەیەکە بۆئەزموونی ژیان و وێنە حەشاردراوەکانی ناوەوەی، کە شیعری هەر شاعیرێك جیاواز و تایبەتە."[٥٤] بەڵام گۆشە نیگاکانی ڕوانینی شاعیر بۆ ژیان، لە شاعیرێکەوە بۆ شاعیرێکی دیکە جیاوازە، جۆری ژیان و بیرکردنەوەی شاعیران جیاوزن، هەرچەندە" شیعر، ئەو زمانە بەربڵاوەیە کە لە توانای دایە، گشت شتەکان بێسنوور لەخۆی بگرێ.[٥٥] جا هێندێك لەوشتانە لەلای شاعیران دەبنە جێی سەرنج، واتا جۆری سەرنجدان و گرینگی دان بەشتەکان لەگۆڕانکاری دایە. ئەو شتەی سۆزی شاعیر ببزوێنێ ئەوا شیعرێکی زۆری لێدەکەوێتەوە، چونکە ئەدەب بەگشتی و شیعر بەتایبەتی، بێ(ئاگری) سۆز نایێتە وجوود.

---

[٥٤]) مەهاباد قەرەداغی، ژن و کۆمەڵگا لە قۆناغی باڵندەیی شێرکۆبێکەس دا، ٢٠١٣، ل ٣١

[٥٥]) ئەحمەد سالار، ڕەنگ لەرەنگداندا، چاپخانەی کەمال، سلێمانی، ٢٠٠٩، ل ٣٧

ئێستا، زانست دەڵێ سۆز جـۆرە وزەیـەکی هەیـە کـە ناویـان لێنـاوە (وزەی سـۆزداری Emotional Energy)جا چۆن وەزی ئەلکتریکی دەیان جۆرە شت کارپێدەکات، وەك گلـۆپ و تیڤی و پانکە و کۆمپیوتەر و زۆپا...تاد، ئەوە وزەی سۆزداریش دەیـان شـت بەخاوەنەکـەی دەبەخشێت. چۆن؟ بەگوێرەی پێناسەی زانستی بایـەلۆژیی هاوچـەرخ بـۆ سـۆز، سـۆز خـاوەن وزەیەکە کە توانای گۆڕانکاری لە جەستە و ڕەفتار و هۆشی تاکەکاندا هەیە، کەواتە سۆز هـەم لە ناخدا و هەم لە دەرەوەی بازنەی ناخ کاری خۆی دەکات، جا پاڵنەرێکی بـەهێزی بەخشـینی ئەو وەزەیە لە دەستدانی کەسێکە، بۆ نموونە دایـك. کـە دەبێتـە هۆکـاری دروسـتبوونی یـان نواندنی دوو جۆرە چالاکی:

**یەك:** چالاکی هەڵسەنگاندن و خەملاندن، کە کردەییەکی زهنی و مێشـکە، کـە پرۆسـەیەکی نائاگاییە، دەبێتە دروستکەری بەرنامەی گونجاو بۆ ئەنجامدانی کاری ئەنجامنـەدراو، ئەمـەیش بەبەردەوامی شێوازی ڕەفتاری تاکەکان دەگۆڕێـت. (وەك هەوڵـەکانی فـەرهاد بـۆ کـونکردنی کێوی بێستوون.)

**جۆری دووەم:** چالاکی گۆڕانکارییە، ئەمەیان هەوڵێکی هۆشدارییە، کە جۆری ئامانجی تاکەکان دەست نیشان دەکات. (لێرەدا کردەی شیعر نووسینە بۆ لەتیف هەڵمەت.)




**(هێلکاریی کاریگەریی وزەی سۆزداریی)**

لێرەدا هەڵوەستەیێك دەکەین، بۆ خستنە ڕووی لێکدانەوەی دەروونناسی ناسراو(کارۆڵ یۆنگ Caral Jung) بۆ دیاردەی دووبارەکردنەوەی یادەوەری کەسێکی مردوو یان لەدەستچوو و دەڵێ: "هونەرمەند و ئەدیبی ڕەسەن وەك پێغەمبەران وان، نهێنییە دەروونییەکانیان لە ڕێی (وشەوە) دەردەبڕن، زۆربەیجارانیش وەك شەوڕۆیەك، بێئاگایانە کارەکە ئەنجامدەدەن. هونەرمەند و ئەدیب وا هەستدەکات کە ئەوە خۆیەتی قسەدەکات و هاواردەکات، لەکاتێکدا ئەوە ڕۆحەشارەوەکەی ناخیەتی کە هاندەری کارەکەیەتی، جا هەرشتێك ئەو ڕۆحە بیکات لەئاکامدا ڕاست دەردەچێ. ئەمەیش بەهۆی کاریگەری ڕووداوە پێشینەکانی ئەو کەسەیە".[56] ئەوە پلەی سۆزدارییە دەبێتە بەشێك لە هەست و سۆزی ئەدیب و بە بەردەوامی لە کارە ئەدەبییەکانی

---

[56]) Mark Patrick Hederman، Kissing the Dark،Criterion Press Ltd، Dublin، Ireland، P. ١٢٤ (کتێب)

ڕەنگدەداتەوە، بۆ ڕەخنەگرانیش دەبێتە سەرەداوێك بۆ شۆڕبوونەوە بۆناخی ئەدیب و دۆزینەوەی نهێنییە شارەواوەکان و دۆزینەوەی خاڵی ئیستاتیکی دەقەکان، چونکە" رەخنەگر لە هۆکاری کۆمەڵایەتییەکان دەگەڕێت، کار لە ڕەفتاری ئەدیب دەکات، واتا دەیەوێت ئەگەرە کۆمەڵایەتییەکانی دیاردە سایکۆلۆژییەکانی لای ئەدیب بکات بە بناغەیەك بۆ شیکردنەوەی پەروەردەبوون و نەشونما کردنی ئەدگارەکانی نووسەر."[57]

## کوڕی دایك

لە زۆربەی کۆمەڵگاکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەند و ئەفریقیا و بەشێکی بەرفراوانی ئاسیا، هەمیشە کوڕ لە پێش کچ داندراوە و پتر بایەخی پێدراوە، دەکرێ (٣) هۆکاری سەرەکی بکەینە هاندەریی سەرهەڵدانی دیاردەی (کوڕسالاری) لە نێو ئەواندا:

عەیامێکی دوورودرێژ، ئەو ناوچانە شەڕگە و مەیدانی کوشتن و بڕینێکی بێئامان بوون. جا قارەمەنی سەرەکی ئەو شەڕ و تێکهەڵدانە، هەمیشە چەکدار و سەرباز بوون. کوڕیش وەك ڕەگەزێکی خاوەن ماسولکەی بەهێز، باشترین هەڵبژاردەبووە بۆ چەك هەڵگرتن و شەڕکردن. ئێستاش لە کوردستاندا مامۆستاکان بە قوتابییەکانیان دەڵێن:" بەرخی نێر بۆ سەربڕینە."

دوای ئەوەی کە لەشکری پیاوسالاری پاشەکشێی بە هێزی دایکسالاری کرد، ژن ناردرانە کونی ژوورەوەی ماڵەکانیان، دەستی کار و کرێکار و ڕەنجبەر و پاڵەکان پتر بوونە کوڕ. هەمیشە خێزانە گەورەکان چاویان لە دەستی کوڕەکانیان بووە، چونکە کچەکانیان دەرفەتی پەیداکردنی پارە و پوولیان لێ زەفتکرابوو.

کەلتووری کۆمەڵایەتی و ئایینی، هەمیشە بەچاوێکی جیاوازەوە سەیری نێرو مێی کردوە و نێرینەی بە شیاوتر و پەسندتر و ئازاتر داناوە. بیروباوەڕی ئەفسانەی کۆن و دواتریش خراپ

---

[57]د. ئازاد عەبدولواحێد کەریم، سۆسیۆلۆژیای ئەدەب، چ٢، چاپخانەی کارۆ، کەرکوك، ٢٠١٣، ل ١٦

بەکارهێنانی دەسەڵاتی ئایینی لەلایەن پیاوانی ئایینەوە، پتر ژنی وەلاوەنا و دەروازەکانی کار و دەستپێشخەری بەڕووی کوڕ (پیاو)دا والاتر کردەوە و بڵندتر لەسەر شانان بەرزیان کردەوە و بەهەمان ڕژدی و هێزەوە کچیان نزمکردەوە و بێدەسەڵاتیان کرد. ئێستاش لە هەندێك شوێنی کوردستان، ماڵی خەسوو بە لالووتی تەماشای نۆبەرە(کچ)ی بووکیان دەکەن. بۆیە ئەمە لە شیعر و لاوك و بابەتە فۆلکلۆرییەکانیش ڕەنگی داوەتەوە، وەك لەم دوو دێڕە شیعرە فۆلکلۆرە واهاتووە:

***خوشکی بێ برا کێلیان لەبەرکەن***

***هەڵیان بگرن لە وراتیان دەرکەن***

***خوشکی بێ برا لەدوور هەر دیارن***

***ڕەنگیان هەر زەردە و لێویان بەبارن***

لەم دەقە فۆلکلۆرییە دا ئەوە پیشاندراوە، کە خوشکی بێ برا بۆئەوە باشن کە شاربەدەر بکرێن، ئەوان هەمیشە ڕەنگ زەرد و نەخۆش و لاوازن، ئەمەش لەسایەی پیاوسالاری کۆمەڵگای کوردەواری دایە.

دایك، وەك بوونەوەرێکی گەردوونی، سەرچاوەی سۆزە، پێشتر گوتمان سۆز تۆخمێکی وزەدارە لە دەروونـدا. وەزەش بەکاربەری جوولە و کـردارە. تـۆ وەرە دەست بـۆ جوجەڵـەی مریشکێك بەرە، یان بێچوە پشیلەیەك لە دایکی بدزەوە و یان فەرخە کێشکەیەك بگـرە، بزانـە دایکیان چیدەکەن و چۆن هێرشت بۆ دێنن. یان زۆر جار بینـراوە کـاتێ دەورو بـەری هێلانـەی پەڕەسێلکە ئاگری تێبەردەبێ، پەڕەسێلکە مێیـەکان بـۆ ڕزگـار کردنـی بەچـکەکانیان خۆیـان بەئاگرەکە دادەدەن و خۆیان دەسوتێنن، کەواتە زۆر ئاساییە کە دایکیش لەبەر خەست وخۆڵی و گەرم وگۆڕی سۆزەکانی پتر ناز بداتە کوڕەکەی و گرنگی پـتری پێبـدا ــ بەتایبـەتی ئەگـەر کوڕەکە نۆبەرە بێ و یان لەسەر شەش حەوت کچانەوە بێ، یان لە ناو بنەماڵەکەدا کـچ زۆرینـە بێ، لەم حاڵەتەدا زۆربەی جار کوڕەکە ناودەنێن (شـوان).

پێشتر گوتمان ئەو جۆرە کوڕە لە کوردەواریدا، سەنگ و قورس سەیرناکرێت و جار هەیە بە دەستەواژەی (کوڕی داکێ) یان (داکۆنی) بانگیدەکەن، یان دەڵێن (کوڕی دایکییەتی) یان (جوجەڵە)یە. گۆیا تۆکمە و ئازا و جەسوور و ڕەشید نیین و بە ناز پەروەردەکراون.

لە ساڵی (٢٠١٠) لە(سکۆڵی دەروونناسی و کلینکی زانستی زمان ) لە ( University of Reading) دا دکتۆر (پاسکۆ فیرۆن Pasco Fearon) لە توێژینەوەیەکی زانستیدا کە لەسەر(٦٠٠) هەزار منداڵ، (٦٩) لێکۆڵینەوە کرابوو، گەیشتە ئەو ئاکامە کە هەرگیز باوەشی دایك نابێتە هۆکاری وەبەرهێنانی کوڕی خاووخلیچ و بێدەم وپل و لاواز و وشك وبرینگ. هەر بۆیە خاتوو (کێیت ستۆن لۆمباردی Kate Stone Lombardi) لە کتێبی (ئەفسانەی کوڕی دایك) دا دەنووسێ: " دایکان، کوڕەکانتان، توندتر لە باوەش بگرن و پتر لە نزیکی خۆتانیان دانێن، منداڵی دوور لە باوەشی دایك یاخی و سەرکێش و لاسار و تەشقەڵەچین. بەڵام ئەوانەی لە باوەشی گەرمدا گەورەبوون، هێمن و ئارام و زیرەك و ئاسودەترن." لە گۆڤاری(دەروونناسی ئیمڕۆ Psychology Today)، دکتۆر (پێگی دریکسەر Peggy Drexler) دەنووسی:"قەت خۆشەویستی بێحەددی دایك زیانی بۆ منداڵەکانی نییە، ئەوەی دەڵێ ناز، منداڵ، بێدەسەڵات و مردۆخ دەکات، ئەوە خورافاتە"[٥٨].

ئەو منداڵەی دایك پەروەردەی دەکات لایەنی هۆش وهزری باشترە و گرفت و کێشەی دەروونی کەمترە و پەیوەندی کۆمەڵایەتییەکانی لە هەرزەکارییدا ئاساییە و کەمتر ساتمە و دەکات و ڕەتان دەبات.

---

[٥٨]http://oureverydaylife.com/psychology-motherson- relationship-٤٦٢٥٠.html

## تــەوەرەی ســێیەم

# پووختەیەك دەربارەی جیهانبینی

*" مرۆڤـ زادەی بیروباوەڕە، بیروباوەڕی چ بێ، ئەو ئەوەیە."*

(Johann Wolfgang von Goethe)

## جیهانبینی یان فەلسەفەی ژیــان

لە ڕوخسار و هەیئەت و شکل و شێوە، مرۆڤەکانی سەر ئەم زەمینــە پــان و بەرینــە زۆر لێکدەکەن و جیاوازییەکی دیار و ناوازە لە ئەندام و ئۆرگانەکانی جەستەیان بەدی ناکرێت، بەڵام لە بیروباوەڕ و بۆچوون و بیرکردنە و ڕەفتاریاندا بە دەگــەمن کۆلکــەی هاوبــەش لــە نێوانیانــدا دەدۆزیتەوە، هەر مەخلوقەی بۆخۆی عالەمێکی سەربەخۆیە و بە گوێرەی هزر و تێڕوانینی خۆی جەڵەوی کاروانی ژیــانی گرتۆتــە دەســت و ئەســپی خــەیاڵاتی خــۆی تــاودەدات. ئــەم کردەیــە دەرهاویشتەی جیهانبینی ئەو مەخلوقەیە. کەواتا دەکرێ پێناسەی جیهــانبینی لــە دوو وشــەدا کۆبکرێتەوە: (فەلسەفەی ژیان)، کە قامتێك بیروباوەڕ و بۆچوون و لێکدانەوە و ڕاڤــەی جیــاواز جیاوازی مرۆڤەکان دەگرێتەوە بۆ پانتاییەکی بەرفراوانی کایــەکانی ژیــان و بــوون. جیهــانبینی خەرمانێك زانیاریی کەڵەکەبوو و قەڵاچنی پێکهێنــەرە جیاوازەکــانی ژیانــە: چ شــتێك بــوونی هەیە؟ چ شتێك دەبێ و ڕوودەدات؟ چیمان لە دەستدێ و چیمان پێدەکرێ؟ من بەرەو کام ئاقــار دەڕۆم؟ جیهانبینناسان، پتر قسە لەسەر ئەو تەوەرە و ڕەهەندانەی بوون دەکەن کــە بــە درێــژایی مێژوو مرۆڤیان بە خۆیانەوە سەر قاڵکردوە و مرۆڤیش شێتگیرانە هۆگریــان بــووە، وەك خــودا، ژیان، مردن، زیندوبوونەوە، زانست، هزر، کەسێتی، کۆمەڵگا، زانیاری و مەعریفەت، ئــەخلاق و بەهاو قەدر و قیمەت...تاد.

جیهانبینی نە وەك گوڵەهێرۆ خۆرسکە و لە خۆیەوە شینبێ، نە وەك بــەژن و باڵایــە هــەر بۆخۆی گەشەبکات و هەڵبچێ، بەڵکو زادەی چەندان کــردە و چــالاکی هەمەچەشــنی تێکئــاڵاو تێکخزاوی بەهێز و یەکگیری بــەردەوامن، کــە ســاڵەکانی تەمــەن یــەك لــە دوای یــەك خڕیــان دەکەنەوە و بناغەی هەیکەلی جیهانبینی ئەو کەسە دادەنێن، کەواتە جیهانبینی دەرهاویشەی، یان بەرهەمی کاردانەوە و ئــەزموون و خودڕەخنــە و بەبــەرەکانی دەروونــی خــود و ئەزیــەت و مەشــەقەتێکی نــەبڕاوەی قۆناغــەکانی تەمەنــە. جــا ئــەو توخمانــە هەمیشــە وەك ژیــان، لــە گۆڕانکاریدان. ئاساییە کە جیهانبینی کەسەکانیش لە گۆڕانکاری دابن. بێباوەڕ دەبێتە باوەڕدار

و سۆشیال دیموکرات دەبێتە ئاغا و چەتە دەبێتە خێرخواز و جانفیدا دەبێتە خائین و شەڕخواز دەبێتە ئاشتیخواز... تاد.

هەریەکێك لە ئێمە خاوەن جیهانبینی خۆیەتی، هەرچەندە حوکمدان لەسەر چاکی و خراپی جیهانبینی کەسێك کارێکی زەحمەتە، لێ جیهانبیناسەکان دەڵێن: بە پیڕەوکردنی چەند بنەما یان پێوەرێك دەکرێ نمرە بۆ جیهانبینی تاکەکان دابنێن ـ هەرچەندە ئەم حوکمدانە پتر زاتییە. پێوەرەکان زۆرن وەك: تێڕوانینی کەسەکە بۆ باوەڕو ئایین بەها و ڕەوشت و نەریت و مرۆڤایەتی و ڕەگەز و ئازادی و ئاشتی و ئاسوودویی و ئەڤین و ڕۆح و سروشت و هەسارە... تاد. جا ئەمانە لە شێوەی سەدان پرسیار ڕیزبەندکراون و هەر پرسیارەی نمرەی خۆی لەسەرە. خێوەتی جیهانبینی لەسەر (چوار) ئەستووندەنگ ڕاوەستاوە: مرۆڤ / واقیعییەت / ڕەوایی / بەهاکان. مرۆڤ و واقیعیەت ئاوێتەی یەکتر دەبن، واقعیەت، کەلتوور و کۆمەڵگاو ئایین و...تاد.، هەموو تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگا دەگرێتەوە، جگە لەوەی تاك خۆی بیردەکاتەوە و جیهانبینی تایبەتی دەبێ بۆشتەکان، بەڵام ئەوەشمان لەبیرنەچێ، زۆر جار کەلتوور ڕەنگڕژی کەسێتی و جیهانبینی مرۆڤەکانیش دادەرێژێ، بۆیە دەبینین (هیندی)یەك کە موریدی هیندۆسییە یان شوێنکەوتەی سیخەکانە، بیرکردنەوەی بۆ ژیان لەگەڵ بیرکردنەوەی مسوڵمانێك جیاوازە، مەسیحییەکیش هەروا، هەرچەندە لە زۆر تەوەرە و بنەمای سەرەکی ڕەنگە بیرکردنەوە و جیهانبینی مرۆڤەکان لێکنزیك بن، بەڵام لە وردەکارییەکان لێکجیاوازن. کەسیەتی رەنگە شتێکی خودی بێت، بەڵام شێوەی فراوانبوونی، یا رێگری لە فراوانبوونی پەیوەستە بەکاریگەری کەسانی ترو ژینگەکەی[59] هەروەها "کردەوەی مرۆڤەکان لەسەر بنەمای جیهانبینییان شێوە

---

[59] ) پروین معتمدی أذری، جهان بینی رئالیسم،١٣٨٤، ص٨٤

دەگرێت"[٦٠] زاهیر ڕۆژبەیانی دەنووسیٚ: " هەموو ڕاستییە گرینگەکان پێشتر زانداراون و ئەرکی گشتی نووسەران هەر ئەوەیە، کە بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر و کاریگەر پێشکەشیان بکەنەوە"[٦١] جا جگە لەشێوازی دەربڕین، جیهانبینی تاکیش ڕەنگرێژی بیرۆکەکان دەکات و ڕەهەندی دیکەیان پێدەبەخشن بە ئومێدی ئەوەی بگەنە لوتکەی سەرسوڕهێنەر. " زۆر جار لە پێناسە کردنی ئەدەب دا دەگوترێت ئەدەب ئاوێنەی کۆمەڵگایە، کاتێك کۆمەڵگاش لە مرۆڤ پێکدێت، ئەوا بێگومان هەرچی لەناو کۆمەڵگادا ڕوودەدات، لە دەقە ئەدبییەکانی ئەم کۆمەڵگایەدا دەردەکەوێت"[٦٢]

پەیوەندەییەکی تۆکمە و پتەو لە نێوان ئاستی تێگەیشتن و ڕۆشنفکری و مەعریفی تاکەکانی کۆمەڵ و ئاستی بەرز ونزمی جیهانبینی ئەوان دا هەیە. ئەوەندەی کەناری جیهانبینی ئەرستۆ و دیکارت و شەیکسپیر و بەرناردشۆ و فارابی و موتەنەبی و شێخی سەعدی و جبران خلیل جبران و خانی و مەحوی و نالی و مەلای گەورەی کۆیەو مەسعوود محەمەد... دوورودرێژوو و بەرفراوانە، کەناری جیهانبینی پاڵەیەك، گاوانێك، فەرشچنێك، کوێخایەك، سەربازێك، ژنەنانکەرێك دوورودرێژوو و بەرفراوان نییە، نەك لەبەر نزمی ئاستی ئەوان، بەڵکو لەبەر کەمی یان نەبوونی میراتی تۆمارکراوی سیخناخ بە فەلسەفەکانی ژیان.

ئەزموون و خوێندنەوە و گەڕان و بینین لەپاڵ پێکهاتەی کەسی هۆکارن بۆ ڕەنگرێژکردنی جۆری جیهانبینی کەسەکان.

---

[٦٠]) http://jmmlq.azad.ac.ir/article_٥٣٣٠٤٧.html

[٦١]) زاهیر رۆژبەیانی، چیرۆکی هونەری کوردی، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٧، ل ٧٣

[٦٢]) د. دەریا حەوێزی، هاوژین سلێوە، ئیرۆتیك لە شیعری (حەمام)ی شێرکۆبێکەس دا، چاپخانەی شەهاب، هەولێر، ٢٠١٥، ل ١٨

له ناونیشانی کتێبەکـەدا، دەسـتەواژەی (جیهـانبینی لـە شـیعری لـەتیف هەڵمـەت) مـان بەکارهێناوە، لە سونگەی ئەو واقیعحاڵەی کە ئێمە هەڵمانسەنگاندووە، کە ئەم شاعیرە خـاوەن جیهانبینییەکی تایبەتمەند بەخۆیەتی، لە شیتەڵکاری دەقەشیعرەکاندا بە چڕوپڕی تەوەرە تەوەرە قسەیان لەسەر دەکەین، بـە تایبـەتی ئـەو شـتانەی پـتر لـە بازنـەی جیهـانبینیی (دایـك) دا خڕبوونەتەوە.

# تەوەرەی چوارەم

# ڕۆژی دایــك

***"لە ڕۆژی چەژنی دایکاندا، دایکت لەبیر نەچێ."***

(جاکسۆن براون)

## ڕۆژی دایــك

له بڕگەكانی پێشتر پایه و مەقامی دایكمان له سەردەمی بتپەرستی چـاخه كۆنەكانـدا باسكرد، كه چۆن ئەو بوونەوەره گەردوونییه وەك ژن و دایك و مامۆسـتا و بەخێوكـەر هێنـده پایەدار و شـكۆدار سـەیركراوه، تـاڕادەی پەرسـتن. ئاماژەمـان بـه دایكـەخواكان كـرد، كـه پەیكەرەكانیان له هەرچوار ئیقلیمی ئەم سەرزەمینه دۆزراوەتەوه، جا له ناو هـەر كۆمـەڵگا و هۆز و خێڵێك بەشێوه و ڕوخسارێكی جیاواز نازناوی مەزنیان پێـدراوه وەك دیكـەخوای (یـان ژنەخوای) خۆشەویستی و دایكەخوای پیـت و بەرەكـەت و دایكـەخوای زەمـین و دایكـەخوای سروشت و دایكەخوای دارودرەخت و دایكـەخوای مـردن و دایكـەخوای خۆر...تـاد. زۆر لـەم پەیكەرانه له شێوەی (دایك)كه منداڵی له باوەشدایه، یان مـەمك دەداتـه منداڵەكـەی، یـان لەسەروو پیاو داندراوه. خۆ تـاكو ئیمـڕۆ چـەندان پەیكـەری دایكـەخودا لـه لای هێنـدۆس و بودابیەكان و بتپەرستەكان، ڕۆژانه له ڕێ و ڕەسمی سـرووتەكانیایندا قوربانییـان بـۆ دەكـەن و كرنۆشیان بۆ دەبەن و نوێژیان بۆ دەكەن و به دوعاو نیزاكانیان لێیان دەپاڕێنەوه.

لەگەڵ گۆڕاكارییەكانی شارستانییەت و گەشەكردنیان، شێوازی قـەدرزانی و ڕێزگـرتنی دایكیش گۆڕانكاری بەسەر داهات. وەك دەبینین لەم سەردەمەدا وەك حورمـەت و نیشـاندانی شكۆمەندییەكی تایبەت بۆ دایك، ڕۆژێـك وەك جـەژنی، یـان ڕۆژی دایـك تـەرخانكراوه، كـه ساڵانه لەو ڕۆژەدا بەها و نرخ و سەنگی دایـك لـه ڕێـی پێشكەشـكردنی دیـاری و سـازدانی سیمینار و فێستیڤاڵ و ئاهەنگ و كۆڕ و كۆبوونەوه و چالاكی جیاواز بەرز ڕادەگیریت.

لـه ڕاسـتیدا، یادكردنـەوەی ڕۆژی دایـك بیرۆكەیـەكی ڕۆژئاواییـه و لـه دەووروبـەری ساڵەكانی(١٨٠٠) وه بەرێكوپێكی یادیدەكرێتەوه، بەڵام ئەم ڕۆژه وەكـو ڕۆژی (١)ی ئایـاریی جەژنی كریكاران نییه، سەرتاسەری و جیهانی بێ، بەڵكو هەر وڵاتەی یـان نەتـەوەی ڕۆژێكـی تایبەتیان بۆخۆیان كردۆته ڕۆژی دایك، كه بەجۆرێك له جۆرەكان پەیوەندی هەیه بـه مێـژوو و ئایین و ئەفسانەی ڕووداوێكی دایك، یان ژنی ئەو وڵات و نەتەوەیه. بۆ نموونه له وڵاتی ئێرانـدا

"پێش شۆڕشی ٥٧ لەسەردەمی شاهەنشا محەمەد ڕەزای پەهلەوی، ٢٥ ی ئازەر، لەدایکبوونی فەریدە قوتبی دایکی فەرخ دیبا، بەناوی رۆژی دایکی خۆشەویست ناونرا، دوای شۆڕشی (١٣٥٧)مێژووی ئەو ڕۆژەیان گۆڕی"[٦٣] واتا تەنانەت لەنێو یەك ولاتیش ئەشێ لەسەردەمێکەوە بۆسەردەمێکی تر و لە حکومڕانییەکەوە بۆیەکێکی تر، ئەم ڕۆژە بگۆڕن و مەدلوول و مەبەستی تری بخەنە پاڵ.

پێش (١٨٠٠) یش، لە نێو زۆر نەتەوەدا، بە شێوەی جیاواز ڕێز لە دایك گیراوە و وەك قارەمانێکی دیار پەنجەی بۆ درێژکراوە:

- گریکە کۆنەکان هەموو ساڵێك لە بەهاراندا بۆ ڕیزگرتن لە خودای (Rhea) فێستڤاڵیان سازدەکرد. ئەو خودایە بە دایکی ژنەخوداوەند و پیاوەخوداوەندەکان دادەندرا.
- ڕۆمانە قەدیمەکان ڕۆژێکی تایبەتیان هەبوو بە ناوی ڕۆژی (Hilaria) کە پشووی فەرمی بوو بۆ پێشکەشکردنی شوکرانە بۆ ژنەخوای (Cybele).
- مەسیحییەکانی ڕۆژئاوا، لە سەدەکانی ناوەندا، لە سایەی مریەمەی پاکیزەدا. دیارییان پێشکەش بە دایکەکانیان دەکرد.

لە سرووتی ئاینی مەسیحییەتدا، جگە لەوەی کە مانگەکانی ساڵ دابەش کراون، ئەوەی کە باوە و خەڵك هەستی پێدەکات، لەهەمان کاتیش مانگەکانی ساڵ لە کڵێسەدا کەش و هەوایەکی ئایینییان وەرگرتووە، بۆنموونە، لەو دوازدە مانگە، مانگێکیان بەناوی (مانگی مریەمەی پاکیزە)یە، کە لە ماوەی ئەو مانگە بەشێك لە سرووتە ئاینیەکان بۆ پیرۆزی مریەمەی پاکیزە تەرخانکراوە."مانگی (ئایار)، بە مانگی مەریەمەی پاکیزە ناوبراوە، ئەم سی ڕۆژە، ڕۆژانە لە کڵێسا نوێژ دەکرێت، بەتایبەتی عەسران، نوێژەکان بەتەزبیح ئەنجام دەدرێن، تەراتیلی ئایینی دەگوترێتەوە، خوتبەکانی قەشە لەو مانگەدا، زیاتر لەبارەی

---

٦٣) http://www.parsnaz.com/

کەسایەتی مەریەمەی پاکیزە دەبێت."[٦٤] بەشێك لە تەراتیلە ئاینییەکانیش کە بە کۆراڵ(کۆڕس) دەگوترێنەوە، کە باس لە شکۆ و مەزنی مریەمەی پاکیزە دەکرێ، ئەو دایکەی عیسای مەسیحی لێ لە دایبوو و بەخێوی کردوو، زۆر عەزابی بینی، چونکە ئەو ئەشکەنجەو ئازارانەی کە مەسیح دەیکێشا لەپێناو مرۆڤایەتی، مریەمەش بەشداربوو لە کێشانی هەموو ئازارەکان. جگە لە مانگی پێنج لەمانگی هەشت(ئاب)، (کلێسا لە ڕێکەوتی (٨/١٤) یادی مەریەمەی پاکیزە دەکاتەوەو قوداسی بۆ ئەنجام دەدرێ، چونکە لەم ڕۆژەدا ڕۆحی چوو بۆئاسمان."[٦٥]

- لە(١٦٠٠) وە لە بەریتانیا، لە ڕۆژی(یەکشمەی دایکایەتی Mothering Sunday) بۆ نیشاندانی شکۆ و پایەیی دایك، تەدارەك و ڕێوڕەسمی تایبەت بە ڕێوەدەچێ. جاران لەو ڕۆژەدا ژنە کویلەکان ئازاد بوون سەردانی دایکیان بکەن و کێکێکی تایبەت بەناوی (کێکی دایکایەتی) پێشکەشدەکرا و دەبەشرایەوە.
- هێندییە سوورەکانی ئەمەریکا جەژنی دایکیان هەیە و لەو ڕۆژەدا گوڵە قەنەفڵ پێشکەش بە دایکیان دەکەن.
- لە ڕۆژی (٢) ی حوزەیرانی (١٨٧٢) خاتوو (جولیا وارد) لە ئەمەریکا داوای لە دایکان کرد کە بەشداری ڕیۆڕەسمێك بکەن کە لەپێناو دامالێنی چەك لە دونیادا بکرێت، بەو ئیعتبارەی کە دایکان قوربانی هەرە گەورەی شەڕوشۆر وجەنگن لە هەموو شوێنێکدا. ئەو ڕۆژە هەرچەندە بۆ دایك نەبوو، بەڵام دواتر وەك ڕۆژی دایك لەو وڵاتە ناسرا.
- لە کۆماری میسردا، ڕۆژنامەنووس (عەلی ئەمین)، دامەزرێنەری ڕۆژنامەی (اخبار الیوم)، یەکەم کەس بوو، کە لە وتارێکیدا داوای کرد (٢١) ی ئادار وەك ڕۆژی دایك لەو وڵاتەدا دەستنیشان بکرێت.

[٦٤]) هاوژین سلێوە، مێژووی هەرمۆتە، چاپخانەی زانا، سلێمانی، ٢٠١٣، ل ٢٤١

[٦٥]) سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٤٢

- له سەردەمی یەکێتی سۆڤیەتیشدا، له زۆربـەی وڵاتـە شـیوعی و سۆشیالیسـتەکاندا ڕۆژی (جیهانی سۆشیالیستی بۆ ژن) یان کردبووە جەژنی دایك، ئێستاش له ڕوسیا و ئۆکرانییە هەر وایە.
- له عیراق ڕۆژی (١١) ی ئاداریان کردۆتە ڕۆژی دایك.
- ڕۆژی یان جەژنی دایك له زۆربەی وڵاتانی دونیا له ڕێککەوتی سەرەتای بـەهارە، یـان سەرەتای ساڵە.
- له ساڵی (١٩١١) هەرێمی (ڤێرجینیای ڕۆژئاوا) یەکەم هـەرێمی ئەمـەریکا بـوو لـە جیـاتی دووەم یەکشـەممەی مـانگی (ئایـار)، سـاڵیادی ڕۆژی (دایـك)ی کـردەوە. لـە سـاڵی (١٩١٤)ەش سەرککۆماری ئەو وڵاتە (ودرۆ ویلسن) بە فەرمی ئەو ڕۆژەی کردە ڕۆژی دایـك. ساڵانە ملیونەها دۆلار بۆ کڕینی دیاری بۆ دایك لەو ڕۆژەدا خەرجدەکرێت.[٦٦]
- لـە کوردسـتانیش دا گرنگـی بـە ڕۆژی دایـك دەدرێ، بەتایبـەتی لـە ( Social Media) خەڵك وێنەی دایکی خۆی دادەنێت و لەو ڕۆژەدا ئاهەنگ دەگێردرێت. له ڕۆژی (٨) ی مـارت ئاهـەنگ بـە بۆنـەی ڕۆژی دایـك دەگێـڕن و لـە کـەناڵ و تیڤییەکانـدا تیشـکی دەخرێتەسەر، له هێندێك له قوتابخانەکانیش دا وتار دەخوێندرێتەوە و ئاهەنگ سـاز دەکـەن و کۆڕ دەگێڕن.

---

[٦٦] https://www.timeanddate.com/holidays/common/mother-day

## بــەشی دووەم

# دایك لە ئەدەب و كەلتوور و هونەردا

*"جوانترین شیعر لەسەرتاسەری جیهاندا، لایەلایەی دایکە."*

(لامارتین)

## ١- دایك لە ئەدەب و کەلتوور و هونەری جیهانیدا

ئەدەب و هونەر دوو ئامرازی باڵا و جوانی گوزارشتکردنی مرۆڤن، هزر و ناخ و دەروون و هۆشی ئەوان دەربارەی پەیوەندییەکانی نێوان تاکەکانی کۆمەڵ لە لایەك و پەیوەندییەکانی نێوان کۆمەڵگاکان بە گشتی، ڕەنگرێژدەکات، ئەمەیش بە ئاوێتەکردنیان بە سروشت و ژینگەی واقیعی و خەیاڵ و سرووش. جا بە چاوخشانێك بە پانتایی جوگرافیای جیهانی دایك، دەبینین ڕووبەر و مەودا و ڕەهەندەکانی پەیوەندییەکانی دایك لە گەڵ تاکەکانی کۆمەڵ و خودی کۆمەڵگادا، یەکجار بەرفراوان و واڵا و سنوورشکێنە، ئەمەیش ڕاستەوخۆ لە ڕشتە ئەدەبی و هونەرییەکاندا، بە درێژایی مێژوو بە شێوازی جیاواز جیاواز ڕەنگی داوەتەوە. ئەوەی بونیاتی پێگە و بوونی دایکی لە بونیاتی کۆی ئەندامەکانی دیکەی خێزان جیاکردۆتەوە و مەقامێکی باڵاتر و بەرزتر و بەرچاوتری پێبەخشیوە، کارەکتەرە پڕ توانست و چەلەنگ و فرە ڕەهەندە جیاوازەکەی ئەو کائینە بێنەزیرەیە:

- دایك تاکە بوونەوەرە لە خێزانی مرۆڤدا، توانای وەچەنانەوەی هەیە، ئەمەش وایکردووە، بەچاوی ڕێزەوە سەیربکرێ، گەر بۆ خاتری چاوی ڕەشی ئەویش نەبێ، لەبەرخاتری ئەو بەرهەمەی کە تەنیا زێدانی ئەو توانای وەبەرهێنانی هەیە و هەموو لایەکیش پێویستیان بەو بەرهەمەی ئەو هەیە، جا چ کوڕ بێ و چ کچ.
- دایك باشترین و جەرگسۆزترین بەخێوکەری منداڵە، لەلایەك مەمکەکانی مەسرەف و خەرجی دابینکردنی خۆراکی منداڵەکەیان لەسەر باوك سووککردووە، لە لایەکی دیکە، باوەش و تووری پشت و بێشك و جۆلانە، باوکیان لە بەرپرسیارییەتی ڕزگارکردوە و ئازادی تەواوی جولە و گەڕان و سوڕانیان پێبەخشیوە.
- دایك ئەو بوونەوەرەیە کە پیاویش (وەك هاوژین) لەباوەشی خۆیدا دەلاوێنێتەوە و پشتیوانی دەکات و خەمخۆرییەتی، هیچ باوەشێك بۆ پیاو وەك هی هاوژینەکەی جێگەی متمانە و چێژ و دڵئارامیی نییە، ئەوەجگە لەو پیرۆزییەی کە ئایین و داب ونەریت و کەلتوور بەم باوەشە پاکەی بەخشیووە. دەگوترێ:" لە پشت هەر پیاوێکی مەزن، ژنێکی مەزن هەیە."

- دایك، خێوەتێکە کە زۆرترین نەوەکانی خێزانی لەژێرخۆیدا کۆدەکاتەوە، جگە لە منداڵەکانی خۆی زڕەکانیش بە هی خۆی دەزانێ، هەر خۆشی دەبێتە نەنك و دایە گەورە.
- دایك، بنەما و بنەجەی پێکهاتەی تیرە و خێڵ وهۆز و نەتەوەیە.

هەموو ئەندامەکانی خێزان، لە هەموو زەمان و مەکانێکدا، پتر مەیل و موحیبەت و ڕێز و قەدرزانییان بۆ دایك هەیە هەمیشە پتر و چڕتر و بەردەوامتر خەریکی خەملاندنی ئەو مەیل و موحیبەتەی دایکن. (فۆلتێر) دەلێ: "زەردەخەنەی ئافرەت تیشکێکە لە تیشکەکانی ئاسمان."[٦٧] هندییەکان دەربارەی ئافرەت دەڵێن: "ژنی بێ مێرد وەك زەوی بێ باران وایە."[٦٨] وەك دوو تایی تەرازو هەمیشە نێرو مێ تەواوکەری ژیانن. ریتشتند دەڵێ:" هیچ خۆشییەك لە دونیادا ناگاتە ئەو خۆشییەی دایك کاتێ سەرکەوتنی منداڵەکەی دەبینێ." [٦٩]ئەمەش مەزنی و دڵسۆزی دایك پیشان دەدات. "دایك منالەکانی لەخۆی دەگرێ، منداڵەکانیشی بەئاسانی دەکەونە ژێر کاریگەری ئەو."[٧٠]

شیتەڵکاریی ڕۆڵ و پێگەی دایك لە ئەدەبدا، دەمانباتەوە بۆ سەردەمی ئەفسانە کۆنەکان و داستانە زارەکییەکانی قەدیمی. دەبینین لە ئەفسانەناسی گریکی کۆندا، جگە لە (بەخوا) کردنی دایك، ئەو بوونەوەرە کراوە بە قارەمانی چەندان ئەفسانەی بەناوبانگ ـ کە ناکرێ لێرەدا ئاماژەیان پێبدەین نەکۆ لە کرۆکی بابەتەکەماندا دوورکەوینەوە ـ، بەڵام نابێ ئەوە بشاردرێتەوە، کە لە هەموو ئەو ئەفسانانەدا، دایك ئەو بوونەوەرە فریشتەئاسا و پەریزادە ئاسمانییە نییە کە ئێمە هەمیشە بەپیرۆزییەوە سەیری دەکەین. لە چەند ئەفسانەیەکدا، دایکی شەیتانی و دایکی

---

[٦٧]) حسين احمد سليم، موسوعة أروع ما قيل في المراة والحب والجمال، دار اسامة، الاردن، عمان، ٢٠٠٢، ص ٣٣

[٦٨]) سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٣٦

[٦٩]) سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٣

[٧٠]) گردأوردی: مرچیه یعقوبی، پدر در ادبیات ایران و جهان، ص ٥٥

بەدڕەوشت و دایکی دڵبەرد نمایشکراون، کە هێندێکیان کوڕی خۆیان کوشتوە و کچی خۆیان وەك کەباب برژاندوە و هاوژینەکانی خۆیان سەربڕیوە یان ژەهرخواردوو کردووە. بێگومان خولقاندنی هەموو ئەو جۆرە دایکە لە پێناو گەیاندنی پەیامێکی دیاریکراوبووە. بۆیە لە ئەفسانەی گریکی کۆندا، وەك چۆن دایکی دڵسۆز و ئەمەکدار و جوان هەیە، دایکی دڵڕەق و بێویژدان و ناشیرینیش هەیە. لە ئەفسانەی (Clytemnestra)کە لە شانۆگەری (Aeschylus) ئاماژەی پێدراوە. باوکێك کچەکەی خۆی دەکاتە قوربانی بۆ خوداوەندی (با) بەو ئومێدەی شەماڵێك بنێرێت و کەشتییەکەی لە دەریادا بەگەڕبخات، دایکی کچە لە تۆڵەی کچەکەیدا، هاوژینەکەی(باوکی کچەکە) دەکوژێت. هەروەها لە ئەفسانەی (Medea) دا لە شانۆگەری(Euripidy) دا دایکێك لە ڕقی مێردەکەی کە نیازی ئەوەی هەبووە ژنی بەسەر بێنێ، دوو لە کچەکانی خۆی بە ئاگر سووردەکاتەوە.[٧١]

ئەوەی کە دەبێ لێرەدا ئاماژەی بۆ بکرێت ئەوەیە، کە دایکەکانی نێو ئەفسانە کۆنەکان، دواتر لە زۆر شاکاری ئەدەبی و هونەری جیهانیدا تەوزیفکراونەتەوە بۆ گەیاندنی پەیامی جیاوازتر لەوەی لە دەقی ئەفسانەکاندا هەبووە.

دوای قۆناغی ئەفسانەکان. پەیدابوونی ئایینەکان، دایك لە زۆر دەقی کتێبە ئاسمانییەکاندا، وەك دەقێکی ئەدەبی، پتر لە شێوەی چیرۆکی ئایینی، وەك کارەکتەرێکی بەخشندە و ڕەند و چالاك و دیار و کاریگەر مامەڵەی لەگەڵداکراوە.

دوو ژن هاتنە لای حەزرەتی سولەیمان، دەمە قاڵەیان بوو لەسەر منداڵێك-کوڕێك- هەریەکەیان دەیگوت دایکی ڕاستەقینەی ئەو منداڵەین، دوای مشت و مڕ **سلێمانی حەکیم** گوتی: "ئێستا کێشەکەتان بۆ یەکلایی دەکەمەوە. شمشێرێکم پێبدەن، دواتر فەرمانی دا

[٧١]https://www.thoughtco.com/top-legendary-greek-mothers-١٢١٤٨٤

منداڵەکە بکەنە دوو کەرت، بۆ هەردوو ژنەکە، ژنێکیان گریاو پارایەوەو وتی: مناڵەکە مەکوژن بیدەن بەو ژنە. ژنەکەی دیکە گوتی: منداڵەکە هی من نییە و هی تۆش نییە بۆمان بەش بکەن. ئەوجا حەزرەتی **سلێمان** گوتی: مەیکوژن بیدەن بەو ژنەی دەیەوێت بژیێت، ئەو دایکی ڕاستەقینەیەتی." [٧٢]

لە قورئانیشدا، وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، لە دەیان دەقدا ئاماژە بە دایك کراوە و لە وێشدا لە شێوەی چیرۆکی ئایینی چەندان بابەت بۆ عیبرەت و باوەڕهێنان بە خودای تاك وتەنیا ئاماژەی پێکراوە. لە سورەتی (مریەم)کە (٩٨) ئایەتە. کە تاکە سورەتی قورئانە ناونیشانەکەی ناوی ژنی وەرگرتبێت. لەم سورەتەدا چیرۆکی (زەکەریا و چیرۆکی مریەمەی کچی عمران و چیرۆکی ئیبراهیم باسکراوە و مریم وەك دایکی پاکیزەی مەسیح بە شەریفترین ژنی سەر زەوی ناوزەندکراوە. لەم سورەتەدا دوو موعجیزە ئاماژەی پێکراوە: لە دایك بوونی (یەحیا) و (مەسیح) ـ سەلامی خوایان لەسەر بێ.[٧٣]

ئیمڕۆ سەر بەسەر گۆشە و کونجی هەر ڕشتەیەکی ئەدەبی کۆن و هاوچەرخ دا دەگریت، دەبینی دایك حزوورێکی دیاری هەیە، جا ئەو ڕشتە ئەدەبییە نووسەرەکەی ژن بێ یان پیاو. لەڕاستیدا ڕووماڵکردنی هەموو ئەو بەرهەمە ئەدەبییانەی دایکیان کردۆتە بنەما و سەرچاوە و قارەمان و ئەکتەر، کارێکی پڕ زەحمەتە و کاتێکی زۆری دەوێ، بۆیە هەوڵدەدەین تەنیا لە چەند نموونەیەکدا بایەخ و ڕۆڵی دایك هەڵسەنگێنین. خاتوو (ماریانی هێرسج Marianne Hirsch) لە لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتدا، پەیوەست بە دایك و کچ، کە لە ساڵی (١٩٨٩) بڵاویکردۆتەوە دەنووسێ:" نمایش و نواندنی قارەمانییەتی دایك لە ئەدەبدا، لەزۆربەی قۆناغەکانی ئەدەبیدا، بە جۆرێك لە چوارشێوی ڕەمزگەرایی و گرێچنی و ناڕوونیدا داپۆشراوە، یان پێچراوەتەوە، ئەویش

---

[٧٢]) نهێنییە زێڕینەکانی ژیان ـ پەندەکانی حەزرەتی سلێمان، کۆمەڵەی دەولی کتێبی پیرۆز، ساڵ ؟، چاپخانە؟، ل ١

[٧٣]) قورئانی پیرۆز، سورة مريم.

لەبەر ئەوەی زۆربەی ئەدیب و نووسەران، دایك وەك دایك بەرجەستە ناکەن، بەڵکو هەمیشە لە خەمی ئەوەدان بە داهێنانی خۆیان ئەو کارەکتەرە وەك ڕەمز یان ئامراز یان دەستگر بۆ گەیاندنی پەیامی شاراوە و نەشاردراوەی نووسینەکانیان بەکار بێنن، بۆیە قسە کردن لەسەر مەقامی دایك لە ئەدەبدا، کارێکی قورس و ئاڵۆزە."[٧٤]

ئەو خاتوونە ڕووماڵی زۆربەی ڕۆمانەکانی ئینگلیزی و ئەمەریکی و فەرەنسی سەدەی نەزدەم و بیستەمی کردووە کە بەسەر (٣) قوناغدا دابەشی کردوون: قوناغی ڕیالیزمی و قۆناغی مۆدریزم و قۆناغی پۆستمۆدریزم. لایەنی مێژوویی و کەلتووری فۆناغەکانیشی شیکردۆتەوە. لە ئاکامی لێکۆڵینەوەکەیدا گەیشتۆتە ئەو خاڵە، کە خودی بیرۆکەی بزوتنەوەی فیمینیزم لە ڕۆژئاوادا، بەرهەمی ئەو کارە ئەدەبیانەیە کە (دایکیان) کردۆتە بیرۆکە و کرۆکی ناوەرۆکەکانیان، جا هەر نووسەرەی بەگوێرەی جیهانبینی و فەلسەفەی خۆی. ئەوەی کە جێگەی شانازیشە بۆ دایك، زۆر لەو مەقامانەی بەدایك دراون، بۆ گەیاندنی پەیامی تایبەتی خۆیان، داهێنەرانە کاریان تێداکراوە.[٧٥]

ئێمە لێرەدا بۆ پشت ڕاستکردنەوەی، بۆچوونەکەی ئەو خاتوونە، ڕۆمانی (دایك)ی (مەکسیم گۆرکی ١٨٦٨ ـ ١٩٣٦) بە نموونە دەهێنینەوە، کاتێك یەکەم شۆڕشی کۆمەنیستەکان لە ساڵی (١٩٠٥) لە ڕوسیا، شەکستی خوارد، لە ساڵی (١٩٠٦) (مەکسیم گۆرکی) ئەم ڕۆمانەی لە ئەمەریکا نووسی، بۆ بەرزکردنەوەی ورەی جەماوەر و تێهەڵچوونەوە لە شۆڕش، هەرچەندە ئەم ڕۆمانە یەکەم بەرهەم بوو لەسەر شۆڕشی نوێی ڕوسیا بنووسرێت، کە باسی ئەوە دەکات چۆن دایکێك هەوڵدەدات، کوڕەکەی بۆ ئایندەیەکی گەشتر پەروەردەبکات، بەڵام خودی ڕۆمانەکە لەسەر دایك نییە، بەڵکۆ دایك کراوە بە ڕەمزی داگیرساندنەوەی گڕوگڵپەی شۆڕش لە

---

[٧٤]) https://core.ac.uk/download/pdf/١١٢٦٥٦.pdf

[٧٥]) سەرچاوەی پێشوو.

بیر و ناخی هاوولاتییه نائومیدبووەکاندا. دواتـریش لـه سـالی (١٩٣٢) شانۆنووسـی ئـەلمانی ناودار (بێرتۆلد بریخت Bertolt Brecht)، بیرۆکەی ئەم ڕۆمانەی کردە شانۆنامەیەکی مەزن.

له سەدەی حەڤدەمدا، دوو لەسەر سێی ئەو چیرۆکانەی دەربارەی دایك له فەرنسا نووسراون، بە قەڵەمی خودی دایکەکان یان ژنەئەدیبەکانی فەرەنسـی بـووە، ئەمـەیش وایکـردوە پـتر بـە ڕاستگۆیی و ئەزموونی کەتواری ژیانی خۆیان ئاوس بن، چونکە زۆربەی بیرۆکەکانیان دەربـارەی عیشق وەچەنانەوە و پەروەردەکردنی منداڵ و خەوبینین بە ئایندەوە بووە.[٧٦] بەڕاستی لە ئـەدەبی جیهانیدا، شاکاری زۆر مەزن بۆ گۆزارشتکردن له هزر و ناخ و ژیانی دایـك نووسـراون، کـە زۆر لایەنی شاراوەی ژیان و کێشە و خەمەکانی ئـەویان تێـدا بەرجەسـتەکراوە، هـەر بـۆ نموونـە وا سەرپێیی، ئاماژە بە (٣) لەو بابەتانە دەکەین.

له چیرۆکی (ژوور)ی کچە ئایرشی (ئیما دۆنۆ Emma Donoghue) کە تاکو ئێستا پتر له ملیۆنێك دانەی لێفرۆشراوە، باسی موعاناتی دایکێك دەکات کـە لەبـەر خـاتری چـاوی کوڕە ساواکەی ئامادەیە بۆ ماوەی حەوت ساڵ له ژوورێکی بچووکدا ژیان بەسەربەرێ کە درێژی و پانییەکەی هەر (١١ فوت) بووە، ئەمەیش لەبەر دلڕەقـی و بـەدڕەفتاری مێـردە خراپەکـەی بووە، کە ئەو دایکە بەستەزمانە لەو ژوورەدا بەند دەکات.

له چیرۆکی (کێروشکە بچووکەکان) کە (مارگرێت وایز براون Margaret Wise Brown) له ساڵی (١٩٤٢)دا نووسیویەتی، پەرێشانی و عەزابی ئـەو دایکـە دەخاتـە ڕوو کـە کچـەکەی دەیەوێ لەدەستی ڕابکـات، کچـە دەڵـێ: دەبمـە تـەیرێك، باڵـدەگرم و دەفـڕم و تـۆ بەجێـدێڵم. دایکەکەش دەڵێ: جا منیش بۆ ئەو تەیرە جوانە، خۆم دەکـەم بـە درەختێـك، تـا بێـت لەسـەر لقەکانم بنیشیتەوە و هێلانەی تێدا چێبکات."

---

[٧٦]) Mother in French literature and culture

ڕۆماننوسی ناودار (سۆفی زاویستۆسکا Sophie Zawistowska) له ڕۆمانی (بژارده) دا خەم و دەردەسەری ئەو دایکە باس دەکەت کە دەکەوێتە داوی سەربازە نازییەکانی هیتلەر و بە زۆری زۆردار دوو کوڕی لێ زەفتدەکەن و داوای لێدەکەن، کە کوڕێکیان لەو دوانە بۆخۆی هەڵبژێرێت، چونکە دەیانەوێ یەك لەو دوو کوڕەی لێ بکوژن!

ئەوەی لە چیرۆك و ڕۆمانەکاندا دەربارەی دایك نووسراوە، لە شانۆنامە و شیعر و پەخشانیشدا بە شێوازی جیاواز و بیرۆکەی جیاواز لە ئەدەبی هەموو نەتەوەکاندا سەنگی خۆی هەیە. دەتوانین بڵێین لە کۆبەرهەمی ئەدیب و شاعیرە مەزنەکانی دونیا، هەمیشە دایك لە جوانترین شاکاری پڕ داهێنەرانەدا بەرجەستەکراوە، هەر بۆ نموونە وا چەند دەقە شیعری (عەرەبی و ئینگلیزی و فارسی و سریانی)تان بۆ تەرجەمە دەکەین: شاعیری فەلەستینی، مەحمود دەرویش(١٩٤١ - ٢٠٠٨) لە قەسیدەی (الي امي) هێندە بە سۆز باسی دایکی دەکات، کە دەیهێنێتە پلە و مەرتەبەی خوداوەندەکان و هەموو مرازی ئەوەیە جارێکی دیکە دەستی بە سەرەداوێکی دامێنی کراسی ئەو دایکە ڕابگات. ئەو دەڵێت:

***(بۆ دایکم)***

***تامەزرۆی نانەکەی دایکم و***

***قاوەکەی دایکم و***

***دەست بەسەرداهێنانی دایکمم***

***وا سەردەمی منداڵیم***

***ڕۆژ لەدوای ڕۆژ گەورە دەبێ و***

***عاشقی عومری خۆم دەبم***

***چۆنکی گەر مردم***

***لە سێڵاوی فرمێسکە گەرمەکانی دایکم شەرم دەکەم!***

***ڕۆژێ، گەر گەڕامەوە،***

***بمکە بە پێچەی سەر برژانگەکانت و***

ئێسقانەکانم بە سەوزە گیایەك داپۆشە

لە ئاوی پاکی پاژنەتدا (تەعمید)کرا بێ و

بەندەنیم بە ئەگریجەیەکی قژی خۆتەوە

بە سەرەداوێکی دامێنی کراسەکەتەوە گرێدە،

ئێ بەڵکۆ ببم بە خوداوەندێك...

خۆ گەر هەر دەستم بە ناخی دڵتا ڕابگا

خوداوەندێکم لێدروست دەبێ...

گەر گەڕامەوە بمکە بە سووتەمەنی

بۆ ئاگری تەندوورەکەت،

بمکە بە ڕستی جلك هەڵخستنی سەربانەکەت.

چونکە من بەبێ نوێژی ڕۆژانت

لەسەر پا خۆم ڕاناگرم...

پیروکەنەفت بووم،

ساتوخوا ستێرەکانی کاتی منداڵیم پێببەخشەوە

تا لەگەڵ فەرخە کێشکەکاندا

پێکەوە

ڕێگای گەڕانەوە بگرینە بەر،

بەرەو هێلانەی چاوەڕوانیت![٧٧]

---

[٧٧] http://www.adab.com/modules.php?name=Sh٢er&doWhat=shqas&qid=٦٤٧٦٧

نزار قەبانیش لە قەسیدەی (خمس رسائل الي أُمي) دا، جگە لە موعاناتی نامۆیی بــوون و غەریبی، وێنەیەکی غەمگینی (دیمەشق)مان بۆ دەکێشێ، کە لە سایەی نامەکانی بــۆ دایکیــدا تێیدەگەین وڵات بۆتە چ خەرابەیەك و کەلاوەیەك، ئەو دەڵێ:

***(پێنج نامە بۆ دایکم)***

***بەیانیت باش، شیرینەکەم***

***بەیانیت باش.***

***ئەی پاکیزە شیرینەکەم***

***وا دوو ساڵ ڕابرد، دایە گیان،***

***لەوەتەی ئەو کوڕە،***

***لە گەشتێکی ئەفسانەییدا،***

***شەپۆلی دەریاییەکان تاودەدات و***

***لەوەتەی لە نێو جانتاکەیدا***

***سپێدەی سەوزی نیشتمانەکەی***

***بە ستێرە و ڕووبارەکانییەوە***

***بە هەموو گوڵەنیسانە سوورەکانییەوە***

***شاردۆتەوە.***

***لەوەتەی لە نێو پۆشاکەکەیدا،***

***چەپکە نەعنا و جاترە و***

***چەپکە گوڵی(لەیلانك) ی دیمەشقیی***

***شاردۆتەوە.***

***

***من تەنیاو تەنیام...***

***دوکەڵی جگەرەم بێزارە و***

تەنانەت کورسییەکەشم لێم بێزارە و

خەمەکانم چۆلەکەن

تا ئێستاش بە دوای خەرمانێکدا دەگەڕێن.

ژنانی ئەورووپام ناسی...

بە سۆزی کۆنکریت و تەختەدار ئاشنا بووم

بە شارستانیەتی هیلاکی ئاشنابووم و

هیندستان گەڕام، وڵاتی سند گەڕام،

جیهانی زەرد گەڕام و

ژنێکم نەدۆزییەوە

پرچە زەردەکەم بۆ شانە بکات و

لەناو جانتاکەیدا شەکرۆکەم بۆ هەڵگرێ و

کە ڕووت بم دامپۆشێ و

کاتێك ڕەتێك ببەم دەستم بگرێ و هەڵمستێنێتەوە.

هۆ دایە گیان...

هۆ دایە گیان...

من ئەو کوڕەم کە شەپۆلەکان تاودەدەم و

تاکو ئێستاش

تامی شەکرۆکەکانم لە زاریدایە.

دایە گیان، چۆن

دایەگیان ئاخر چۆن

وا بووم بە باوك و

هەر گەورە نەبووـ ووم؟

***

سـلاو...

سـڵاو...

لەو ماڵەی ئەڤین و میهرەبانی پێبەخشین،

لە گوڵاڵە سپییەکانت...

لە گۆیەند و تەدارەکەکانی (گۆڕەپانی نەجمە)

لە ڕەحلەکەم

لە کتێبەکانم...

لە منالآنی گەڕەکەکەمان و

لەو دیوارانەی بە نووسینە شەڕەپشیلەکانمان دەماننەخشاندن

لەو پشیلە تەمەڵانەی

لە بالکۆنەکەماندا دەخەوتن و

لە گوڵە لەیلانکەکانی لەسەر پەنجەری دراوسێیەکەماندا

کەپرۆکەیان دەکرد.

دایە گیان!

وا دوو ساڵ ڕابرد و

دەموچاوی دیمەشق

چۆلەکەیەکە چرنووك لە ناخمان دەدات

پەردەکانمان دەگەزێت و

بە نەرمی دنووك لە پەنجەکانمان دەدات...

دایە گیان!

وا دوو ساڵ ڕابرد و

شەوانی دیمەشق و

یاسەمینەکانی دیمەشق

خانووبەرەکانی دیمەشق

هەر لە خەیاڵماندان

مناره‌كانی... له‌ سه‌ر گه‌شتییه‌كانمانه‌وه‌ ده‌ده‌ره‌وشێنه‌وه‌

هه‌رده‌ڵێی مناره‌كانی (ئه‌مه‌وی)

له‌ ناخماندا بونیاتنراون،

هه‌رده‌ڵێی ڕه‌زی سێوه‌كانمان

له‌ نێو ویژدانماندا گڵوكه‌ده‌كه‌ن

هه‌رده‌ڵێی تیشك و به‌رده‌كان

هه‌رهه‌موویان له‌گه‌ڵمان هاتوون.

***

هۆ دایه‌، وا سه‌رماوه‌ز هات و

خه‌مه‌كان هاتن و دیارییان بۆ هێناوم و

له‌ سه‌ر په‌نجه‌ره‌كه‌مدا

فرمێسك و گله‌ییه‌كانی به‌جێدێڵێ.

سه‌رماوه‌ز هات... كوانێ دیمه‌شق؟

كوانێ باوكم و چاوه‌كانی و

كوانێ ئاوریشمی سه‌رنجه‌كانی؟

خوای به‌خشنده‌، گۆڕه‌كه‌ی پڕ بكات له‌ نوور.

ئه‌دی كوانێ حه‌وشه‌ی ماڵه‌ گه‌وره‌كه‌مان؟

كوانێ ساته‌ ئارامه‌كانی؟

كوا ڕه‌فه‌ی تاقه‌كان كه‌ له‌ گۆشه‌كاندا پێده‌كه‌نن؟

ئه‌دی كوانێ سه‌رده‌می منداڵیم له‌وێدا؟

كلكی پشیله‌كه‌ی ڕاده‌كێشم و

له‌ هێشوه‌ ترێیه‌كانی ده‌خۆم و

له‌ گوڵه‌ له‌یلانكه‌كانی ده‌چنمه‌وه‌.

دیمه‌شق، دیمه‌شق،

*ئەی ئەو شیعرەی*

*لە گلێنەکانماندا تۆمارمان کردی*

*ئەی ئەو منداڵە ڕۆحسووکەی*

*بە کەزیەکانمانەوە لەخاچماندا*

*لەبەر پێیدا کرنۆشمان برد و*

*لە خۆشەویستیی ئەودا تواینەوە*

*تا لە نێو خۆشەویستیماندا کوشتمان!*"[٧٨]

ژنە شاعیری ئینگلیزی خاتوو(کریستینە ڕۆزیتی Christina Rossetti) (١٨٣٠–١٨٩٤) لە سەدەی نوزدەمدا بەمشێوەیە دەیەوێت چاکەی دایکی بە سایەی دەقە شیعرێکی ناسك بداتەوە و نەمریی پێببەخشێت و دەڵێ:

*(غەزەلەکان سیخناخن بە خۆشەویستی)*

*(سۆنێتەکان) تەژین لە خۆشەویستی و*

*ئەمە شاکارە نازدارەکمە کە پڕە لەو سۆنێتانە*

*فەرموون ئێستاش سۆنێتێکی دیکەم:*

*سۆنێتی ئەڤین...*

*لە منەوە بۆ ئەو خاتوونەی دڵکەی، دڵی ماڵە هێمنەکەی منە*

*بۆ یەکەمین خۆشەویستیم، بۆ دایکم،*

---

[٧٨])http://www.adab.com/modules.php?name=Sher&doWhat=shqas&qid=١٦ف. شەوڕۆ لە عەرەبییەوە کردوویەتییە کوردی

*كە لە نێو كۆشەگەرمەكەیدا*

*فێری غەزەلی خۆشەویستییەكی سادە و بێگەرد بووم،*

*هەرچی ئەو كردی بووە شكومەندی و سەربەرزی من*

*بۆ هەر شوێنی هاتم و چووم. بۆمن بووە ئەستێرەكەی گەلاوێژ.*

*جا دایە گیان، چونكە تۆ منت خۆشدەوێ و*

*منیش تۆم خۆشدەوێ*

*وا لە رتمی شیعرەكانم تاجەگوڵێنەیەكم بۆت چنیتەوە*

*تاهەتایە تاجی سەروەری دەنێتە سەرسەرت و*

*نەمریت پێدەبەخشێ.*

*هەشتا ساڵەیی تەمەنت*

*بڵێسەی خۆشەویستیی پێخامۆش ناكرێ*

*بڵێسەیەك شەوق و شەبەقی*

*یاساكانی زەمەن و گۆڕان*

*فەنابوونی ژیان و مەرگی تێپەڕاند.* [79]

ئەمەی خوارەوەش نموونەكەیكی شیعری فارسییە كە شاعیری ناسراو مەحموود كیانوش بۆ (دایك)ی هونیوەتەوە و دەڵێ:

*(لەچاوانی دایكمدا)*

*لە چاوانی دایكمدا*

---

[79] http://www.best- poems. net/christina_rossetti/)

sonnets_are_full_of_love.html ف. شەوڕۆ لە عەرەبییەوە كردوویەتییە كوردی

***سەد دەشتی ڕۆشنی تێدا***

***سەد کێوی پڕ لە بەفر***

***سەد ئاسمانی شین و چڕ***

***لە چاوانی دایکمدا***

***باشیی و پڕ میهرەبانی***

***پڕ نەشئە و شادومانی***

***لە چاوانی دایکمدا***

***ئاوازی با و باران***

***شادی و خۆشی هەزاران***

***گوڵزاری نێو بەهاران***

***لە چاوانی دایکمدا***

***ئومێد و شادومانی***

***دڵخۆشی و کامەرانی***[٨٠]

شاعیری ناسراوی فارسیش (فروغ فرخزاد) دەبێژێ:

***تەواوی ژیانی دایک***

***بەرماڵێکی پان و بەرینە***

***لە دەرگای مەترسیی دۆزەخدا.***

***دایك لە بن هەرشتێکدا بەردەوام***

***بەدوای جێ پێی تاواندا دەگەڕێ و***

---

[٨٠]) اموزش نوین، جلد ٢، مولف: دکتور احسان قبول، شیعری: محمود کیانوش، ١٣٩٥، ص١٣، هاوژین سلێوە لە فارسییەوە کردوویەتییە کوردی.

*وا بیردەکاتەوە،*

*کە کوفری یەك تەڵەگیا*

*باخچەیەکی پیس کردووە.*

*دایك ڕۆژ تا ئێوارە نزا دەکات*

*دایك تاوانبارێکی سروشتییە و*

*بۆ تەواوی گوڵەکان دەمرێت،*

*بۆ تەواوی ماسییەکان دەمرێت،*

*بۆخۆی دەمرێت.*

*دایك چاوەڕوانی دەرکەوتنە و*

*بەخششی بۆدێتە خوارێ...*[81]

محەمەد تاهیری (محمد طاهيري) لە شیعری (دایك)دا دەڵێ:

*ئەی گەرمترین باوەش*

*ئەی میهرەبانترین عاشق*

*کاتێ لەگەڵ تۆم، دڵ مەست و بێهۆشم.*

*ئەی هاوڕێی ڕاستگۆ*

*گوڵی نەشئەبەخش*

*ئەی جوانترین شت*

*ئازیزترین کەس،*

[81])http://rashidramezanpoor.persianblog.ir/post/١٤٠

وەرگێڕانی لە فارسییەوە: هاوژین سڵیوە.

***میهرەبانیت بێ هاوتایە و***

***خەمەکانت گشت پەنهانن***

***خەمخۆری هەمیشەییم***

***بێ تۆ ساردوسوڕە ژیانم.*** [٨٢]

مریم سادات موسوی سەبارەت بەدایك لە شیعرێکدا دەڵێت:

***هەرشتێکی تازە***

***لە وجوودمدا شێوەی گرتبێ،***

***ئەزموونێکی جوانە و***

***تۆ بە بڵندی ئاسمان ناونیشانی دەدەیتێ.***

***ئەمەش جوانترین ناونیشانی جیهانە،***

***خودا چەند جوان ڕووی خۆی بە تۆ نیشان دەدا،***

***ئەمەش جوانترین دیاری ئەوە بۆ تۆ.*** [٨٣]

ئەمەش چەند نموونەیەکە لە شیعری سریانی کە بۆ دایك نووسراون:

نائل حەنا لە شیعری (دایکم)دا دەڵێ:

***لە نێو ژناندا هەرا و هۆریا بوو***

***لە نێویاندا یەکیان دایکم بوو،***

***زیاتر بوون خەم و ئازارەکانم***

***سەیرکە دایە چۆن بۆت دەڕوانم،***

---

[٨٢]) http://shereno.com/list وەرگێڕانی لە فارسییەوە: هاوژین سلێوە.

[٨٣]) سەرچاوەی پێشوو.

*سەیرکە دایە ئازارم دەدەن*

*خەم و ناسۆرم تادێ زیاد دەکەن.*[٨٤]

نوها لازاری شاعیریش لە شیعری (هەیکەلی خۆشەویستی)دا دەڵێ:

*دایکم هەیکەلی خۆشەویستی*

*ڕۆژگارەکانی ئارایشت کرد،*

*کە سەر دەخەمە سەر سینگی*

*برینەکانم سارێژ دەبن.*

*دایکم: ئەی کانیاوی ڕەحمەت*

*خەمەکانم لێ دەشارتەوە و*

*بە ڕوومدا پێدەکەنێ.*

*دایك: ئەی کانیاوە ڕوونەکە*

*چەندە دڵڕەقم دەبینێ*

*من: بەگریان خۆم ژێر دەکەمەوە*

*ئەو: نوێژ و دوعام بۆدەکا.*

*دڵی لانکی منە*

*گۆرانییەکانی لە گوێمدا دەزرینگێنەوە،*

*هەموو پەنجەکانم دادەگیرسێنم بۆ ئەو*

*هێشتا هەر کەمە.*

*گشت ژیانم تەرخانکەم بۆ ئەو*

*هێشتا هەر کەمە...*[٨٥]

---

[٨٤]) نائیل حەنا یەلدا (لەدیك بووی ١٩٧٦، هەولێر ـ عەنکاوە)یە، شیعری دەستنووس (دایکم)، ساڵی ١٩٩٦ نووسراوە. هاوژین سلێوە لە زمانی سریانییەوە کردوویەتییە کوردی.

له فۆلکلۆریشدا، هەموو نەتەوەکان بە شێواز و گۆزارشتی جیا جیا جێگەی تایبەتییان بۆ دایك تەرخانکردوە. هەر کە بووکی تازە بە نۆبەرە دووگیان دەبێ، بە زۆر شێوازی حیکایەت و چیرۆك و پەند و بەیت و بالورە و مەتەڵ و چەندان دابوو نەریتی تایبەت بە پۆشاك و هەڵس وکەوت و زان و پەروەردەکردنی منداڵ دێتە ئاراوە، ئەمانەش هەمووی نیشانەی بایەخدان و بە هەند وەرگرتنی تێکڕای قۆناغەکانی تەمەنی دایکە. ڕەنگبێ لایەلایەی دایك قەدیمترین و پڕ سۆزترین شێوازی ئەم فۆلکلۆرە بێ کە تایبەتە بە جیهانی دایك و قەت هیچ کەسێکی دیکەش توانا و مافی داهێنان و بەکارهێنی ئەو دەقە ناسك و خۆشئاوازەی نەبێ.

له جیهانی هونەریشدا، هەر لە سەردەمی هونەری ئەشکەوتەکانەوە تا ئەم چرکەساتە، دایك کەرەستە و ئامراز و پەیامێکی دیاری هونەرمەندان بووە. پێشتر لە کتێبی (دایکی مەزن) ئاماژەمان بۆ هەموو ئەو پەیکەرانە کرد کە لە چوار ئیقلیمی دونیا بۆ دایکی خواداوەند دروستکراون و تاکو ئێستاش لە ناو هێندێك تیرە و هۆز و خێڵدا پەیکەری خوداوەندی دایك کرنۆشی بۆ دەبردرێت و قوربانی بۆ دەکرێت.

هیچ مۆزەخانەیەکی هاوچەرخ نییە چەندان شاکارەتابلۆی دایکی تێدانەبێ، هێندێکیان کە بەرهەمی هونەرمەندە بەناوبانگەکانی دونیان، نرخیان لە قیمەت نایە. سەدەی هەژدەمین، بە تایبەتی لە فەرەنسا، سەردەمی گەشانەوەی هونەری وێنەکێشانی دایك بوو، چ وەك دایکە پاکیزە مریەم و چ وەك دایکی ئاسایی، خۆ هونەرمەندی ئەمەریکی خاتوو(ماری کاسات Mary Cassatt ١٨٤٤ - ١٩٢٦ ) بە شاهونەرمەندی تابلۆی دایك ناوبانگی دەرکردووە. هەموو ئەم هونەرمەندە ناودارانەی خوارەوە خاوەن تابلۆ یان وێنە یان پەیکەری زۆر جوانن تایبەت بە دایك و بەرهەمەکانیان لە بەناوبانگترین مۆزەخانەکانی جیهاندا پارێزراون.

---

[٨٥]) شیعری: نوها لازار، لەساڵی ٢٠٠٩ هونەرمەند: یوسف عەزیز، ئاوازی بۆداناوە و بە گۆرانی وتوویەتی، هاوژین سلێوە لە سریانییەوە کردوویەتییە کوردی.

Leonardo Da Vinci (١٥١٩–١٤٥٢)

Michelangelo (١٥٦٤–١٤٧٥)

Raphael (١٥٢٠–١٤٨٣)

Rembrandt(١٦٦٩–١٦٠٦)

Jan Vermeer (١٦٧٥–١٦٣٢)

Claude Monet(١٩٢٦–١٨٤٠)

August Renoir (١٩١٩–١٨٤١)

Pablo Picasso (١٩٧٣–١٨٨١)

Vincent Van Gogh (١٨٩٠–١٨٥٣)

Paul Cezanne(١٩٦٠٦–١٨٣٩)

دەتوانین بڵێین لە هەرە زۆری شارە گەورەکانی وڵاتە پێشکەوتووەکاندا، پەیکەری دایك لە گۆڕەپان، یان پارك یان شاشەقاەکاندا دەبینرێن. ئەمانەش هەموو بەڵگەن کە مرۆڤایەتی لە هیچ کایەیەکی ژیاندا دایکی فەرامۆش نەکردوە.

دوای داهێنانی کامێرا و هونەری سینەما و ڤیدیۆ و تەکنەلۆژیای نوێش، بە شێواز و هونەری هەمە چەشن، دایك بایەخی تایبەتی پێدراوە و زۆرن ئەوانەی وەك ڕەمز و شۆڕەژنی دونیا لۆگۆ و ئارم و تابلۆیان بۆ دەکێشرێت وەك: دایکە مادام ماری کیووریی و دایکە ئەندیرا غاندی و دایکە نانسی ئەدیسۆن و دایکە تیرێزا. لەناو کوردانیشدا حەپسەخانی نەقیب و

نەجیبەی کچی مەلای گەورەی کۆیە و خانزادی سۆران و زینەب خان(کچە کورد)...تاد دەبینرێن. جوانترین وێنەی دایکیش (دایکی ئەنفالکراو)ی کوردە.

## ٢- دایك لە شـیعری كوردیدا

*دەستت بخەرە سەر ناوچەوانم ئەی دایكی*

*جەرگسووتاو*

*با ناوچەوانم گڕ بگرێ بە پشكۆی پەنجەكانت.*

*(نەزەند بەگیخانی)*

**دایك لە دیدی شاعیرانی (کورد)دا**

دایك لە ئەدەبیات و کەلتووری کورددا ـ لە ئەفسانە و حیکایەت و پەندی پێشینان و داستان و بەیت و بالۆرە و شیعردا ـ ڕەنگدانەوەیەکی زۆری هەیە، لێرەدا گەشتێکی خێرا بەناو دیوانی شیعری کوردیدا دەکەین و چەند نموونەیەك لە شیعری تایبەت بە دایك دەکەینە کەرەستەی خاوی شیتەڵکاری و لێکۆڵینەوەکەمان، بەڵام لە پێشدا، دەقێکی فۆلکلور دەکەینە سەرتۆپی تەوەرەکە، چونکە شیعری فۆلکلۆر دایەگەورەی هەموو شیعرەکانە. چونکە کارێکی زەحمەتە بتوانین کۆی شیعری دایك لە ئەدەبی کوردیدا لێرەدا ڕوماڵ بکەین، ناچارین هەر مشتێك بکەینە نموونەی خەروارێك ـ هیواداریین نووسەرانی دیکە بابەتی (دایك لە شیعر و ئەدەبی کوردیدا) بەسەر بکەنەوە.

**دایك لە دەقی فۆلکلۆری کوردیدا:**

***(لایەلایە)***

***لایە لایە کۆرپەکەم لای لایە***

***کۆرپەی من دەرێ دایە شەوی زستانان درێژە و سەرمایە***

***هەرچەند دەکەم خەو بەچاوم دانایێ دایە***

***لایە لایە کۆرپەکەم لای لایە***

***دەرێ دەچمەکن نەجاڕان لە بۆمن دروست بکەن***

***لانکەکی سوڵتان مەحمودی***

***هەتا ئەمن دانی سبەینان داینێم لەبن هەیوانێ***

***لایە لایە کۆرپەکەم لای لایە***

***دانی هێواران ئەمن لانکی کوڕە جوانەکەم***

***ببەمە بن داری هەتا بایەکەی شەمارێ بێتن***

***هەتا لانکی کوڕە جوانەکەم هەر بەخۆی بێ و بیبەهژێنی***

***لای لایێ کوڕە جوانەکەم***

*لايلايێ عەزیزی دایێ لایلایێ.* [٨٦]

دەقی لایەلایە، بەرهەمی زارەکی دڵ و دەروونی دایکە، وەك بڵێی دایکان هەموویان شاعیر بوون ـ هەر نەبێ جاری جاران ـ کەواتە لەجێی خۆیەتی لە زاری دایکەوە گوێبیستی ناخ و هزر و تێڕوانینەکانی خۆی بین، ئەگەر لە بازنەیەکی بچووکیش دابێ.

نابێ ئەوە فەرامۆش بکەین، کە هەرچەندە دایك لە لایلایەکاندا بەسەر کۆرپەکەدا هەڵدەڵێ، لێ لە زۆربەی جاران ئاماژەکان بۆ خۆی دەگەڕێتەوە، بۆیە دەکرێ وەك ئاوێنە سەیریان بکەین و دیوی ناوەوەی دایکەکان لەو ئاوێنەیەدا بخوێنینەوە. لەم دەقەی سەرەوە، جەرگسۆزیی دایك بۆ کۆرپەکەی بەرجەستەکراوە. بڕوانە لە کەش و هەواو جێگایەکانیش خۆشترین و دڵگیرترینیانی بۆ هەڵدەبژێرێ. لە دەروونناسی سەردەمدا، سەلمێنراوە کە ئەو لایەلایە هۆکارە بۆ دڵنەوای کردنی ئەو منداڵە ساوایە، چونکە ئەوەیش هەست بەو پشت و پەناو ئارامییە ڕۆحییە دەکات لەسایەی دایکییەوە دەڕژێتە ناخی و هەم دایکەکەش هەست دەکات کە نەختێك خەمەکانی سووك دەبن و هەست بە جۆرە دڵنەواییەك دەکات. زمانی دەقە فۆلکلۆرییەکە ژنانەیە، پڕ سۆز و تاسەیە، شێوەزاری ناوچەی دەشتی هەولێر و کۆیەی پێوەدیارە کە لێوان لێوە لە مۆسیقای ناوەوە وەك *(لایەلایە/ دایە/ سەرمایە/ دانایێ، سوڵتان/ سبەینان/ هێواران، داری/ شەماری، لایلایێ/ دایێ....)*

**قانع و دایك:**

(قانع) چەند شیعری بەناوی دایکەوە هەیە. لەوانە: *(وەسیەتی دایك بۆکچ، لای لایە، هاواری دایك، دڵی دایك)*، لێرەدا ئێمە تەنها شیعری (*دڵی دایك*) دەخەینەڕوو، هەرچەندە لە

---

[٨٦]) مەولود ئیبراهیم حەسەن، زیاتر لە عەشقێك، کۆمەڵێك بابەتی مێژوویی و فۆلکلۆری ناوچە جیاجیاکانی نێوکوردەوارییە، ب ١ ـ ٢ چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠٠٨، ل ٤٧١

پەراوێزی دیوانەکەی نووسراوە، (لە ئەدەبی بێگانانەوە) واتا شاعیر بەسوود وەرگرتن لە شیعری شاعیرێك ئەم شیعرەی نووسیوە، ئاماژە بەوە نەکراوە، هـی کـام نەتـەوە و هـی کـام شـاعیرە.
ئەمەش شیعرەکەیە:

*جارێکیان لاوێك سەرگەرم و مەغروور*
*لەناو یارانا بەنەزان مەشهوور*
*ئەیدا لەدایکی هەتا ئەیتوانی*
*وتاری باوکی بە هیچ ئەزانی*
*دڵی چووە سەر دراوسێ ماڵێ*
*ژنێکی زۆر جوان، خۆش خەت و خاڵی*
*ئیشارەت بەچاو، پێکەنین بەدەم*
*بەبەینیا نەچوو لە زوو و لەکەم*
*گا شەڕە چەپۆك، گا پاڵ پێوەنان*
*هەتاکو ئیشیان لە ئیش ترازان*
*دایکی لاوەکە، بەم ئیشەی زانی*
*کەوتە تەدبیری زۆر بە ئاسانی*
*وتی: خوشکەکەم، مەیە بۆماڵم*
*خراپمان مەکەو مەشکێنە باڵم*
*ئەم کوڕەی من سەرسەری مەکە*
*لەژینی دنیای بێبەری مەکە*
*ژنی دراوسێ کەزانی وایە*
*تەرکی ماڵی کرد نە هات بۆکایە*
*لەپاش یەك دوو ڕۆژ گوڕە هیلاك بوو*
*بۆنەهاتن یار، تەواو خەمناك بوو*

شەوێك لەشەوان زۆر بەپەنهانی

چوو بۆلای دۆستە هیچ کەس نەیزانی

وتی گیانەکەم، بۆتەرکت کردم؟

بەچاوت قەسەم ئەوا من مردم

وەرامی داوە مەعشووقەی عەیار

وتی: خۆشەویست بۆمن بریندار

دایکت زانیویە، ئابڕووی بردم

نازانی پیرێ کەچی پێکردم؟

تازە من و تۆ بۆیەکترنابین

هەتاکو مردن بۆلای یەك ناچین

کوڕ هاتە وتە، ئامان سەد ئامان

لێم زویر نەبی، دەستم بەدامان

تۆچی ئەفەرمووی، سەرم لەڕێتە

پەردەی دڵەکەم خاکی ژێرپێتە

وتی: ئەتەوێ بم بە میوانت؟

دەسکەمە ملت، بێمە سەرڕانت؟

دایکت زك بدڕە و دڵی دەربێنە

مەیخە بەیانی، ئەم شەو بۆم بێنە

منیش ئەوساکە وەکوو جارانم

هەرچی پێم بڵێی، بەندە فەرمانم

کوڕ بەنەزانی ڕایکردۆ بۆماڵ

زك دایکی دڕی، سا بە هەر ئەحواڵ

دڵی دەرهێناو خستییە سەردەستی

بردی بۆیاری دوو دیدە مەستی

*هێندە پەلەی کرد کوڕی مل قەوی*
*پێی هەڵخلیسکا دڵ کەوتە زەوی*
*بە زوانی حاڵ دڵ هاتە زمان*
*وتی: ئەی ڕۆڵە ئامان سەد ئامان*
*هۆشت بێ دەخیل، بریندارنەبی*
*لەنەخۆشخانە زارو خوار نەبی*
*قەزات لەگیانم لەسەرخۆ بڕۆ*
*ئێشت پێ نەگا، بکەی ڕەنجەڕۆ*
*هەرکەس بزانێ کە دایك کامە*
*هەتاکو مردن چەشنی غولامە*
*چاو بقۆنجێنە لە نان و ئاوت*
*پەڕۆ گوو شۆرین بێتە پێش چاوت*
*ئەم جار ئەزانی کە دایکت چییە*
*بۆ تۆزێ ئێشت ئارامی نییە*[٨٧]

لەکوردەواریشدا زۆرجار دایك بەرۆڵەکانی دەڵێ: "رۆڵە مەرگم پێش مەرگت کەوێ!"، ئەمەش نیشانەی ئەوپەڕی خۆشەویستی دایکە بۆ ڕۆڵەکانی. دەقە شیعرەکەی (*دڵی دایك*)، قوربانی و میهرەبانی و ئەمەکداری دایك، تەنانەت بەرانبەر ئەم جۆرە کوڕەش، بەیان دەکات، کە دڵی دەرهێناوە. قانع زۆر وەستاکاری لە دەقەکەدا کردوە و هێندە بە جوانی بە بۆن و بەرامەی کوردەواری ئاوپژێنی کردوە، میکیاژی (وەرگێڕانی) پێوە دیار نییە.

---

[٨٧]) بورهان قانع، دیوانی قانع، چاپخانەی دالاهۆ، ١٣٨٥، ل ٥٥٨ – ٥٦١ (شاعیری ئیسپانی جاس نتوفر باکو، خاوەنی ئەم قەسیدەیە، کە وەرگێردراوەتە سەر چەندان زمانی دیکە ـ نووسەران)

**گۆران و دایك:**

(گۆران) ی شاعیر (١٩٠٤ ـ ١٩٦٢)، (دایك) ی لە چوار دەقەشیعردا بەناونیشانی: (*ڕۆڵەی بێدایك/ لەكەركوكەوە بۆدایكم نووسیوە/ بێشكەی منداڵ/ ساوای ئاشتیخواز*) بەسـەركردۆتەوە. لە شیعری (*ڕۆڵەی بێدایك*) دا، دەڵێ:

***نە ئاخ لەسینەدا ئەخواتەوە پەنگ،***
***نە فرمێسك ئەتوانێ بڕژێ بەبێ دەنگ***
***نە زمان ئەوەستێ لەمە زیاتر،***
***نە قەڵەم وەك لاشەی مردووی سارد و سڕ***
***نەفام لە جێگای خۆی ئەمێنێ، نەهۆش،***
***دیمەنی من بینیم بەرد دێنێتە جۆش***
***كێ دایكێ ئەتوانێ بێنێتە بەرچاو،***
***بە مەرگی تاقانەی جەرگی هەڵقرچاو،***
***دامابێ لەدەشتێ، هاواری بەكەس***
***نەگا هیچ... هەرخۆی بێ و مەیتی كوڕی بەس!***
***ئا، سەیری دیمەنی وەها كاریگەر***
***كام ویجدان ناداتە بەر نووكی نەشتەر؟!***
***بەڵام ئاخ، ئەوەی من دیم بەم دووچاوە***
***مەینەتێكی سووكە ئەمەی بەلاوە:***
***وەك دایكی كوڕ ـ مردوو، دیم كۆرپەی ساوا***
***لای مەیتی دایكیا، فرمێسك لەچاوا،***
***كەوتبوو بەبێ شیر، بێ لاوانەوە،***

## *ناو جەرگی ئینسانی ئەچووزانەوە!*[٨٨]

ئەگەر لەتیف هەڵمەت لە تەمەنی مێرمنداڵیدا، دایکی لە دەست دابێ، ئەوا گۆران لە هەمان تەمەندا باوکی لەدەست دەداو بۆیە سۆزی ئەو بۆ دایکی وەك چیوەیەکی سێگۆشەیی وایە: سۆزی حەقیقی کوڕ بۆ دایکی، سۆزی تەعویزکراوەی باوك لە باوەشی دایکدا، وە سۆزی بێ باوکی لە هەرەتی لاویدا. هەرچەندە، سۆزی ئەو دەقەشیعرەی سەروە، گەردوونی و ئینسانییە، لێ وێنەی خودی شاعیر لە نێو دێڕەکانیدا دەبینرێ. ئەو هەوڵیداوە باوەش پێداکردنی دایك بە کۆرپەکەی، لە چوارچێوە غەریزییەکەیدا بێنێتە دەرەوە و ڕۆحێکی مرۆیی پێ ببەخشێ و ئەویش لە ڕێی تەوزیفکردنی وشەی شیعری ناسك و کاریگەر تا زۆرترین تەئسیر و وەقعی لەسەر خوێنەر هەبێ. قەسیدەکە شێوازی وەسفی وەرگرتووە، بەلاّم خاڵی نییە لە هونەر و وەستاکاری. هەر یەك لەم وشانە وەك چەقاندنی بزمار وایە لە هەست و ویژدانی مرۆڤ: *(ئاخ لەسینەدا/ نە فرمێسك بەبێ دەنگ / لاشەی مردووی سارد و سڕ/ بە مەرگی تاقانە / جەرگی هەڵقرچاو/ هاواری بەکەس/ خۆی و مەیتی کوڕ/ ئاخ / دایکی کوڕ ـ مردوو/ لای مەیتی دایك / بێ لاوانەوە / ئەچووزانەوە).* ئەوەی سەرنجڕاکێشە، هۆکاری ئەمەش ئەوەیە، کە شاعیر دەیەوێ هاوار بکات کە ئەوەی ئەو دەیڵێ نە خەیاڵە و نە چیرۆکە و نە داستان، گوزارشتکردنە لە کارەساتێکی حەقیقی کە خۆی شایەدحاڵییەتی، بەم تیرەش دوو نیشانەی پێکاوە:

یەك: بە ئەرشیفکردنی سەردەمێکی پڕ مەرگەساتی کوردان و تۆمارکردنی مێژووی خوێن و زوخاوی وان.

دوو: بێدەسەلاّتی شاعیر بەرانبەر ئەو کارەساتە جەرگبڕە، کە نەیتوانیوە، خۆی لێ گێل بکات و ڕووی خۆی لێلابدا. ئەمەش بۆتە هەوێنی ئەو قەسیدە سۆزدارە. هەر بۆیە گۆران بە شاعیری ڕیالیزم ناسراوە.

---

[٨٨]) دیوانی گۆران، ب١، بغداد، ١٩٨٠، ل ١٩٨

بۆ نرخاندنی هونەری دەقەکە، دەبێ خوێنەر نزیکەی سەدەیەك بگەڕێتەوە دواوە و بزانی ئەو کات کە گۆران ئەو قەسیدەییەی نووسیوە، لە دیدی پەیامگرانیدا لێوان لێو بووە لە جوانی و هونەرسازیدا، لە زمان و تەکنیك و دارِشتن و شێواز و پەیامدا، وەك دەزانین چۆن دواتر ئەو گوزارشتەی ئەو بووە قوتابخانەیەکی نوێ لە ئەدەبی کوردیدا.

گۆران لە شیعرەکانیدا، ڕاستگۆیانە و مرۆڤپەروەرانە مامەڵەی لە گەڵ دایك دا کردووە، وەك دایکی حەقیقی و باوەشی سۆز و قوتابخانەی ژیان و ڕەمزی خۆشەویستی نیشتمان و کۆڵەکەی ڕاگر و بە هێزی گەردوون و سووری بەردەوام بوونی وجود.

**شێرکۆ بێکەس و دایك:**

دایك لە جیهانبینیی شیعری شێرکۆ بێکەسدا(١٩٤٠ ـ ٢٠١٣)، ڕووبەر و پانتاییەکی فراوانی هەیە، شێرکۆ بێکەس لەقەسیدەی (*دایکم*) دەڵێ:

***دایکم...هەر لەوێیە... دایکم***
***لەوەئەچێ***
***بووبێ بە کرێچی پاییز***
***بە شۆڕەبی سەرلەرزۆکی***
***کەنار چۆمێ، لەوێ دایکم***
***دایکم...هەرلەوێیە دایکم.***
***من ئەزانم ئەمێستاکە***
***لەناو بوڵێڵی غوربەتدا***
***بووە بەئاو،***
***ڕەنگی بێڕەنگی گرتووە...***
***بۆنی بێبۆنیی گرتووە.***
***(تەنیایی) بووە بە کچی و***

***(نامۆیی) بووە بە کوڕی و***
***تازە نایێتەوە دایکم!***
***وەختی پیریی بە گۆچانەکەی دەستێوە***
***خاو خاو دێت و وەکو خەونێکی زەردەڵە***
***پەیدا ئەبێ وەناسە سوار، هەروەك دایکم،***
***لەسەر سەکۆیەکی پاییز دائەنیشێ،***
***تەزبیحەکەی لەباخەڵی سوخمەی مۆری***
***دەرئەهێنێ و چاو ئەبڕێتە گەڵای بەرپێ.***
***لەو ساتەدا هەوای وەشتێ بۆن و بەرامەی یادگار***
***لەبیرەوەری دوورەوە، زۆر دوورەوە،***
***بۆئەو دێنێ. بەبێ ئەوەی پێ بزانێ،***
***زەردەخەنەیەك ئەیگرێ وبەبێ ئەوەی پێ بزانێ،***
***چەند دڵۆپێکی سەرگەردان دێنە خوارێ و***
***خەو تەڕ ئەبێ،***
***ئەو هەڵناسێ،***
***تا ئەوکاتەی زەردەپەڕی دەستە خوشکی***
***دەستێ ئەخاتە سەرشانی و تا ئەوساتەی،***
***بە برووسکە پەڵە هەورێ، هەڕەشەکەر***
***دائەچڵەکێ!*** [٨٩]

شاعیر ئەم شیعرەی لە کۆتایی مایسی (٢٠١١) لە سلێمانی نووسیووە، ئەمەش (٣) ئاماژەی شاراوەی تێدایە:

[٨٩]) شێرکۆ بێکەس، خێراکە مردن خەریکە بگات، چاپخانەی کارۆ، سلێمانی، ٢٠١٣، ل ١٦٢ ـ ١٦٤

١) شاعیر لە زێدی خۆیدا، لە بێداکیدا، خۆی بە غەریب دەزانێ و هەست دەکات لەو غەریبییەدا یەکجار عەوجە بە دایکییەتی.

٢) شاعیر تەواو پەرێشانە بۆ دایکی کە ئەویش لە غەریبایییەتییەکی حەقیقیدا دوا ڕۆژەکانی تەمەنی لە ئەمەریکا، بەسەر دەبا.

٣) ئەم ئاماژەیان لە هەمووان جەرگبڕترە، کە شاعیر دەترسێ مەرگ ڕێی لێ بگرێ و نەهێڵێ بۆ دوایین جار دایکی ببینێتەوە، هەر واش بوو ئەم قەسیدەیەشی لە دیوانی (*خێراکە مردن خەریکە بگات*) بڵاوکردەوە.

شاعیر لەم قەسیدەیەدا، بەهەستێکی قوڵەوە وەسفی دووری و پیربوونی دایکی دەکات. سەرەتای شیعرەکە سێ جار ناوی دایکی دێنێ، کە ئەوەش ڕەنگدانەوەی بارە دەروونییەکەی شاعیرە بۆ دایکی، لەم شیعرە کورتەدا، دیارە بۆ لە ناونیشانەکەی، هیچ شتێکی دیکەی شك نەبردووە مەزنی و پیرۆزی و جوانی بکاتە ئەم وشە چوار پیتییە، کە هەشت جار پاتی دەکاتەوە، پێنج جاریش ڕاناوی سەربەخۆی کەسی دووەمی تاك، (ئەو)ی بۆ بەکاردەهێنێ. پیربوونی دایکی بە وەرزی پاییز وەسف دەکات و دایکی دەکاتە کرێچی پاییز، شۆڕەبی سەرلەرزۆك، بەو مانایەی لەنێو خانووی پاییزدا دەژێت و یادگاری زەمانی گەنجی وەك گەڵای دار هەڵدەوەرێنێ، لە گوتەی (*دایکم هەر لەوێیە*) دا، جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە،کە دایکی هەر لەوێ دەمێنێتەوە. کە لەبەر نەخۆشی و پەیوەست بوونی بە داو دەرمان و دکتۆرەکانی ناتوانێ بەیەکجاری بێتەوە. لە گوتەی (*ڕەنگی بێ ڕەنگی/ بۆنی بێ بۆنی گرتووە*)، شاعیر هەر خۆی دەزانێت ئەمە چ جۆرە ڕەنگێکی نامۆییە. لەو غەریبییەو دوورە وڵاتەدا. دەقنووس هاوڕێ و کوڕ و کچ بۆ دایکی دەدۆزێتەوە، کە (*تەنیایی*) دەکاتە کچی و (*نامۆی*)یش دەکاتە کوڕی. هەوای وەشتێك وەك پۆستەچی و نامەبەر زۆر لەدوورەوە هەڵدەکا. ئەم نەرمە بایە سرووە و شەماڵێکی ئاسایی نییە، بەڵکو بیرکردنەوەیەکی قوڵ و بێدەنگی دایکییەتی کە ناوەناوە یادگارییەکان دێنێتەوە زەینی و بزەیەکی پێدەبەخشێ. لێرەداشاعیر سێ کەسایەتی لەیەك کەسایەتی چڕ دەکاتەوە:

کەسایەتی یەکەم: خودی دایکی/ کەسایەتی دووەم: پیری کـە بەشـێکە لـەدایکی و لێـی جـودا نابێتەوە/کەسـایەتی سـێیەم: دایکییـەتی خـەونی بینیـوە، یادگارییـە شـیرییـنەکان زەردەخەنەیەکی پێدەبەخشن، کەچی باجی ئەو زەردەخەنەیەش دەدات و فرمێسـکی بۆدەڕێـژێ. دەوترێ یادگارییە خۆش و بەسەرچووەکانیش زۆر جار دەبنەوە مایـەی خـەم، چـونکە لەدەسـت چووین و دووبارە نابنەوە.

دەقنووس، غەریبی و نەخۆشی و مەینەتییەکانی خۆشی ئاوێتەی ئەم شیعرە کردووە، نەك هەر ئەم شیعرە، بەشێکی زۆری ئەو شیعرانەی لە دوا دیـوانی خـۆی دیـوانی، (*خێراکـە مـردن خەریکە بگات*)، بڵاو کردۆتەوە، بۆنی ڕەشبینی و نامۆییان لێدێ. لـەنێو شـیعرەکە دا وشـەی بوڵێڵ هاتووە، واتا تاریك و روونی بەیانی، لەدوا دێڕیشدا وشەی زەردەپەڕ هاتووە، کە ئاماژەیە بەو ڕۆژەی دایکی دەمرێت و وەك خۆر ئاوا دەبێت. چونکە زەردەپەڕی کردووە بەدەستە خوشکی دایك و دەست لەسەر شانی دادەنێ. داچڵەکانی بروسـکەی پەڵـە هـەورێکیش مردنـی دایکـی ڕادەگەێنێ.

ئەگەر دایك بکەین بە هێشوەترێیەك، دەبینین لەم دەقەدا دنکەکانی شـێوەیان جیایـە و تـامی جیان لێدێ. بڕوانە ئەم هێڵکارییەی خوارەوە:




## کەژاڵ ئیبراهیم خدر و دایك:

کەژاڵ ئیبراهیم خدر (١٩٦٨ – ٢٠١٨) ئەم قەسیدەیەی بۆ دایکی خۆی نووسیوە و دەڵێ:

***دڵی دایکم ڕەنگی سوورە،***
***جۆگەڵەی خوێنی ڕەنگێکی درێژ***
***بەوەیدا ڕەتدەبێ***
***خوێنی کوڕ لە شەڕی براکان و***
***خوێنی کچ لە جەنگی بووکێنی دایکم سوورە***
***بەردەوام دوکەڵی سوور***
***لە جەرگی سووتاوی هەڵدەستا.***
***دڵی دایکم ڕەنگی ڕەشە،***

*لە پرسەیەکی هەمیشەیی و*

*لە لافیتەی ژێر باڵی مزگەوت دەچێ.*

*دایکم ڕەشە.. ڕەش ڕەش لە گومان دەچێ*

*ڕەشیەتی چارەنووس، ڕەشیەتی بەخت و*

*ڕەشیەتی ژیان.*

*دڵی خاکم چەند بەر تەسکە*

*لە کۆڵانەکانی ئاوایی ئەنفال دەکا*

*لە ئازادییەکانی ژنێك دەچێ*

*کە بە قانونی تەماشا*

*ناتوانێ باکوور و باشوور و ڕۆژهەڵات و*

*ڕۆژئاوای*

*جەستەی خۆی سەیر بکا*

*لە ژنێك دەچێ*

*کە دەبێ دەست نوێژ بە خوێنێ*

*خۆی بشوا.*

*(چییە دنیا زوو بە خوێنی جەرگی ئەهلی دڵ*

*دەکا بێزوو!)* [٩٠]

کەژاڵ ئیبراهیم خدر، وەك دایك، دەیەوێ بچێتە ناو دنیای خەمەکانی دایکییەوە، ڕەنگ و دەنگی ئەوان بکاتە ئەو مەراقەی لە دڵی دایە و هەرچی خەم و حەسرەت لە ناخیدا هەیە هەڵیان ڕێژێت و بە جیهان بڵێ خەڵکینە ئەوە دایکی منە، لەگەڵ ئەم داخانە ژیا و بەم

---

[٩٠] )https://www.facebook.com/kazhal.ibrahim(٢٦/ ٩/ ٢٠١٧)

داخانەوەش سەری نایەوە. کاتێك ئەو دەیەوێ خۆشەویستی و وەفاداری خۆی بو دایکی دەربڕێ، هەموو شتەکانی لێ تێکدەچێت و نازانی خۆی کچی ئەو دایکەیە یان ئەو ژنە دایکی ئەوە، دوو دایك لە یەك دایکدا دەبینێتەوە و زۆر بە وەستایی ئەو دوو ڕۆحە دەکاتە بلّندگۆیەك تا لە ڕێی ئەوەوە پەیامە ئاگرینەکەی خۆی بکاتە مانەفێستی شیعرەکەی و بە دنیا بلّێ لەوەتەی ئێمەی (دایك = ژن) بوونمان هەیە لەم ولاّتەدا کراوین بە کۆیلە و چەوسێندراوینەتەوە. لە ڕووی ئابووری و کەمەلاّیەتی و ڕۆشنبیری و سیاسی و کەلتووری و فەرهەنگیدا لە ژێری ژێرەوەدا پۆلینکراوین.

ئەو، دایکی بە دوو ڕەنگ دەشوبهێنێ: ڕەنگی سوور و ڕەنگی ڕەش. لەو هونەرەشدا لایەنە نەرێنیێ و ناشیرین و نەفرەتلێکراوەکانی ئەو دوو ڕەنگە بەرجەستەدەکات (*جۆگەلّەی خوێن/ خوێنی کوڕ / شەڕی براکان / خوێنی کچ / جەنگ/ دوکەلّی سوور/ جەرگی سووتاو/ پرسەیەکی هەمیشەیی/ لافیتەی ژێر بالّی مزگەوت/ رەش ڕەش لە گومان دەچێ/ ڕەشیەتی چارەنووس/ ڕەشیەتی بەخت / ڕەشیەتی ژیان/.بەر تەسکە/ ئەنفال* ). بڕوانن ئەم هەموو سوور و ڕەشە ناشیرینە بەرچاوی شاعیریان گرتووە و هیچ بوارێکی بۆ نەماوەتە ئاماژەیەکی سەر پێیی بە جوانییەکانی دایك بکات. لە ڕاستیدا پەیامگرنازانێ ئەو باسی خۆی دەکا وەك دایك، یان باسی دایکی دەکات وەك ڕەمزێك بۆ کۆی دایکانی ولاّتەکەی.

***لە ژنێك دەچێ***
***کە دەبێ دەست نوێژ بە خوێنێ***
***خۆی بشووا.***

ئەمە بەلّگەیەکی مێژووییە بۆ ئەو چەقۆتیژەی خراوەتە سەر گەردنی ناسکی ئەو بونەوەرە ئێسك سووکە. کوشتنی بێ پسانەوەی ئەوان. وایکردووە کەژاڵ ئیبراهیم وەك ژنێك باشتر هەست بەوەبکات کە خوێن ڕشتنەکە زۆر جۆگەلّەی گەورەی بەدوای خوێدا هێناوە. ڕۆژ بە ڕۆژ (کێرڤی) ژنکوشتن و تەلاّقدان و دەستدرێژیکردنە سەر نامووسی ئەوان لە هەلّکشان دایە. دەکرێ ئەم دەقەشیعرە ناوبنێین بە هاواری دایك بۆ دایك، لێ هاوارێك کە هەر خۆی دەیبیستێ و گوێی خەلّکانی دیکە لەئاست ئەو هاوارەدا کەڕن، کەڕتر لە کەڕ، کەڕتر لە بەرد.

دەقەکە سیخناخە بە وێنەی هونەی، موزیکی خۆشئاوازی نـاوەوە و دەرەوە، بـە زمـانێکی ڕەوان و پاك و شیرینی ژنانە داڕشتراوە. سەرنج لەم گوزارشتانە بدە: *(جـەنگی بـووکێنی دایکـم سوورە/ دوکەڵی سوور/ لە لافیتەی ژێر باڵی مزگەوت دەچـێ./ دایکـم ڕەشـە.. ڕەش ڕەش لـە گومان دەچێ/ دڵی خاکم چەند بەر تەسکە/ کۆڵانەکانی ئاوایی ئـەنفال / بـە قـانونی تەماشـا/ دەبێ دەست نوێژبە خوێنێ خۆی بشووا).*

نووسـەری ئەمـەریکی( ڕۆبـەرت فولگـەم Robert Fulghum ١٩٣٧ ـ ٢٠١٠) دەڵـێ: ((خۆشەویستی وەك ئەو قوماشەیە چەندە لە ئاراوی خەم و پـەژارەی بگرییـەوە، ئەوەنـدەی دی گەشتر و گەشاوەتر دێتە بەر چاو.))[٩١]

**قوبادی جەلیزادە و دایك:**

چەند مانگێك دوای کۆچی دوایی دایکی، قوبادی جەلیزادە ئەم دەقەشیعرەی نووسی:

***(الصلاة خیر من النوم)***
***باڵی پێکدادا ـ کەڵەباب***
***لە ناو نوێنی شەو هاتەدەر ـ سپێدە***
***درەختی لە شیرین خەو، ڕاچڵەکاند ـ الصلاة خیر من النوم***
***کەچی،***
***وەك سبحەینەکانی تر***
***گوێم: لە خشپەخشپی سۆلەکانی نەبوو...***
***گوێم: لە خوڕەخوڕی ئاوی دەستنوێژەکەی نەبوو...***
***گوێم: لە چرپەچرپی قلە تەسبیحەکانی نەبوو...***

---

[٩١]http://www.robertleefulghum.com/aboutrobert/

*ئەمدیت: بەسەر بەرماڵەکەیدا، بنوشتێتەوە.*

*ئەمدیت: دوو دەستی نزا هەڵبڕێت.*

*ئەمدیت: بە فوو، لێمان داتەکێنێت، قەزاو بەڵا .*

*نا...*

*دایکم نووستووە.*

*نووستووە دایکم،*

*نووستنێکی ئەبەدی.*[٩٢]

تێکستەکە وەك گوڵدانێك، چەپکە گوڵێکی باغەکانی سەردەمی منداڵی قوبادی لە ئامێزی خۆیدا گرتووە، تاکە شت کە لێرە وێنەی قوبادی جەلیزادەی تێدا ببینرێت دەقەشیعرەکەیە، بەدەر لەمە، هەموو ئاماژەکان زیندووکردنەوەی یان بەخەبەرهێنانەوەی ئەو بیرەوەرییانەیە کە لە ئەقڵی بێئاگایی ئەودا بە ئەرشیفکراون. چونکە شاعیر دەمێکە بە جەستە لەباوەشی دایکیدا دەرهاتووە و ئامێزی ئازیزێکی دیکەی لەباوەشی خۆی گرتووە، نەیویستووە درۆ لەگەڵ خەیاڵیدا بکات. هەرچەندە تێکستەکە هەر (٦٤) وشەیە، بەڵام ئاوسە بە زانیاری ورد ورد:

ئاوڕدانەوەیەك لە کەلتووری جارانی گەڕەکەکەیان لە کۆیە: ماڵی دایکی قوبادی جەلیزادە، لە ڕۆژهەڵاتی گەڕەکی قونگرێ، بەسەر جوانترین باغ و باغاتی (شیوی ڕەزان)ی دا دەیڕوانی و چیای هەیبەسولتان وەك ئاوێنە، بەرامبەریان بوو، بۆیە یەکەم گزنگی خۆری ئاسۆ، ڕەنگ بێ لە پەنجەری ئەوانی دابێ، مزگەوتی باپیرە گەورەشیان ـ مزگەوتی مەلا ئەسعەدی ـ هەر چەند هەنگاوێك لە دەستە راستی ماڵەوەیان دووربوو، جا ئەو *(الصلاة خیر من النوم)*ە لەگەرووی موئەزینەکانی ئەو مزگەوتەوە ڕژاوەتە ناو سینەی بیرەوەریی ئەو شاعیرە. ڕێك بەرانبەر ماڵیان، ئەو باغچەوانانە بوون کە لەوبەری ڕووبار و لە شاخی مشکە ڕەزو باغچەیان هەبوو، جا ئەو

---

[٩٢]) https://www.facebook.com/naz.ahmad.٩٨٤٩٩١٢٣

کەڵەشێرانەی قوقەیان ئێستا دەگاتە گوێی ئێمە، هی ئەو ماڵە باغچەوانانە بــوون، دڵنیــام کــە شاعیر بۆخۆی ئەم دەقە دەخوێنێتەوە، دەچێتەوە ئەو گەڕەکەی جاران، هەر بویە دەمانــەوێ بــۆ پەیامگر وێنەی ژینگەی ئەو دەقە بکێشین.

لە دەقەکەدا، دیارە کە دایکی شاعیر هەر لەو ژوورە نوێژی کردووە کە قوباد تێیدا دەخەوت. لێرەشدا، شاعیر لە پێشدا ئەو یادەوەریانەی باسکردووە کە هەستی بیستنی ئــەمباری کــردوون ئەوجا هاتۆتە سەر هەستی بینین، چونکە مرۆڤی خەوتوو حەز ناکات زوو چاوەکانی بکاتەوە. لە وشەکاندا بۆنوبەرامەی ژیانێکی کوردەواری ئاسایی دەکرێت، هیچ سیمای ئەرستۆکراتییەت بــە دایکی و بــە ماڵەکەیانــەوە دیــار نییــە: ســۆلی کۆیانــە و بــەرماڵی جۆلایــەکان و تەســبیحی مەکەومەدینان(بە گوێرەی دەنگی قلەکانی) و خوڕەخوڕی ئاو. شاعیر (بەرەبەیانی) بە کەڵەباب و لەخەوهەستانی شەو ڕاچڵەکاندنی درەختەکان، بەیانکردووە، جا لەو سەحەرەدا جگە لە دەنگی موئەزین و کەڵەباب، هەست بە بیستنی چەند نەرمە دەنگێکی کاریگەر دەکەیت، چــونکە لــە بێدەنگی شەودا دەنگ باشتر دەبیسترێ، بۆیە هەمووومان گوێمان لــە خشپەخشــپی ســۆلەکان و خوڕەخوڕی ئاوەکە و دەنگی بەریەك کــەوتنی دنکــە تەزبیحــەکانی نێودەســتی دایکــی دەبــێ، ئەوەشمان لەبیر نەچێ کە منداڵ هەم گوێی زۆر سووکە و هەم چاویشی زۆر تیژە.

ئاوڕدانەوەیەك لە فەرهەنگی کۆیەی جاران: وەك گوتمان شاعیر لە سلێمانی گەڕاوەتەوە کۆیــە و بووەتەوە منداڵی شەش حەوت ساڵی جــاری جــاران، بۆیــە فەرهــەنگی بنــزاری(بێچــوەزاری) کۆییان، دەنگ و سەدای خۆی لە دەقەکەدا هەیە، وەك:(*کەڵەباب/ سبحەینەکانی / خشپەخشپی سۆلەکانی / خوڕەخوڕی ئاو/ قلە تەسبیحەکانی)*.

شەشەمین سەرکۆماری ئەمەریکا (ئەبرەهام لینکۆن ١٨٠٩ ـ ١٨٦٥) دەڵێ: ((قەت ئەو پیاوە نەدار و هەژار نییە، کە لە ماڵی دایکێکی خوداپەرست، گەورەبوو بێت.))[٩٣]

---

[٩٣] https://www.biography.com/people/abraham-lincoln-٩٣٨٢٥٤٠

بێگومان لێرەدا ئـەو مەبەسـتی ئەوەیـە، کـە ئـەو دایکـە خواپەرسـتە، خۆشەویسـتی و ڕاستگۆیی و میهرەبانی و ڕەحم و شەفەقەت و مرۆڤدۆستی حـەقیقی لـە نـاخی منداڵەکانیـدا دەچێنێ و هەژارییەکە لێرە پەیوەندی بە پـارە وپـوول و سـەروەت و سـامانەوە نییـە. شـاعیر ڕاسـتگۆیانە کـەلتووری ڕابـردووی مـاڵی دایکـی بەرجەسـتەکردووە، ئەمـەش وادەکـات خۆشەویستمان بۆ ئەو دایکە زۆرتر و شکۆدارتر بێ. دەزانین کە جـەرگی دایـك بـۆ کۆرپـەکانی چۆنە، بڕوانە ئەو کەلتووره جوانەی جاران، لەکاتێکدا هەموو منداڵەکانی خەوتوون، ئەو دایکـە و نزایان بۆ دەکاو دوای خوێندنی فاتیحە و دوای نوێژکردنەکە، دەکەوتە سەلەوات لێدان و فـوو لەوان و لە ماڵەکەدا دەکا. ئەمەیش بەشێکە لە تقووسی نوێژکردن لە لای موسـڵمانان. ئیمـڕۆ زانستییانە سەلمێندراوە کە ئەم جۆرە دوعا و نزاکردنە، جۆرە ڕژێنێك لە مێشکدا دەڕژێـنن کـە هەستی بەرگری و هیوا و ئومێدێك بەو دایکە دەبەخشێت، بەو هیوایەی کە ئەوان بێمزەڕەت بن و ژیانی ئاسایی ڕۆژنەیان بەسەر بەرن.

بیرۆکەی مـردن نووسـتنە، زۆر کۆنـە، بـە چـەندان کتـێبی لەسـەر نووسـراوە، لـە کتێبـە پیرۆزەکاندا ئاماژەی بۆ کراوە، لە زانستی لاهووت و فەلسەفە و تەسەوف و ئەدەب زۆری لەسەر نووسراوە. شاعیر دەیەوێ هەم نەمریی بە دایکی ببەخشێ کە ئەو نووستوە بۆیە ئەو بەیانییە بۆ نوێژ لە خەو هەڵنەستاوە. دەیەوێ خۆشی دڵنیا بکات، کە سەفەرەکەی ئەو وەك نووسـتن وایـە. هیچ ئاماژەیەك نییە کە شاعیر لەو نووستنە مەبەستی لە هەڵسانەوەی ڕۆژی حەشر بێ، بـەڵکو نوستنەکەی نووستنێکی ئاساییە بەڵام ئەبەدییە.

ئەوەی کە دەبێ فەرامۆش نەکرێت، لە دەقەکەدا خۆشەویستییەکی شاراوەی یەکتربڕ هەیـە، خۆشەویستی شاعیر بۆ دایکی بە یادکردنـەوەی یادەوەرییـەکانی و تاسـە و خۆزگـەی بـۆ ئـەو ڕۆژانە، وە خۆشەویستی دایك بۆ منداڵەکانی بە نزا و دوعا و فوو لێکردنەکەی بـەو ئومێـدەی خوا بیانپارێزێ.

---

**نەزەند بەگیخانی و دایك:**

نەزەند بەگیخانی لە بەشێکی قەسیدەی *(دەنگی ژنانی گەرمیان)* دا دەڵێ:

***من لێرە***

***لە ناخی بێدەنگی گەرمیان***

***کە دەنگی شمشێری شەڕی براکان ڕایدەچڵەکێنێ***

***بیرەوەرییەکانی پاریسم دەنێژم و***

***قاقای پێکەنینم کپ دەکەم و***

***گوێ لە قوڵپی گریانی ژنانی ئەنفال دەگرم***

***کە لەناو گەرداوی ئەو خاکە سەردەکا و***

***وەك هێڵێکی باریك***

***بەرەوە سەربان و گردەکان تەکان دەدا***

***با بێدەنگ بین***

***دەستت بخەرە سەر ناوچەوانم ئەی دایکی***

***جەرگسووتاو***

***با ناوچەوانم گڕ بگرێ بە پشکۆی پەنجەکانت***

***با بۆنی مردووەکان بکەین***

***کاتێ چەکەکان ڕادەکێشن***

***لاشەی براکانمان هەڵمێکی سووریان لێ هەڵدەستێ***

***لە قوڵایی ڕۆحیاندا***

***تروسکاییەك هەڵدەچێ***

***وەك بوراق باڵ دەگرێ***

***بەرەو ناخی ئەستێرەکان***

***دەنگی دڵی ژنەکان دەبیستم***

***تێکەڵ بە دەنگی بانگدەری سپێدان دەبێ***

***شین و ڕۆڕۆیە تێکەڵ بە***

***بەحەی ئەڵڵای دەروێشان دەبێ***

***هاوار، هاوار، هاوار***

***بێدادیی ژنانی گەرمەسێر***

***لەسەر ئەم خاکە سووتاوە***

***تێکەڵ بە بێباکی سەردەم دەبی.***[٩٤]

ژنــە ئەکتــەری بــەریتانی (ئــۆدرێی هیبیــورن Audrey Hepburn ١٩٢٩ ـ ١٩٩٣ )دەربارەی سۆزی ژن دەبێژێ: ((هیچ شتێك نییە خاڵی بێ لە جوانی، لــێ هــەموو چــاوێك ئــەو جوانییانە نابینن. ژن جوانییەکەی لە سیمای ڕوخساریدا نییە، بەڵکو جوانی حــەقیقی ئــەو لــە ڕۆحی دا دەدرەوشێتەوە. ئەو ســۆزەی کــە نیشــانی دەدات، ڕاســتگۆیانە بــە خۆشەویســتییەوە دەیبەخشێتەوە، بۆیە جوانی ژن ساڵ بە ساڵ پتر دەگەشێتەوە.))[٩٥]

لە کۆبەرهەمەکانی ژنە شاعیری کورد، نەزەند بەگیخانی، ڕاستگۆیی ئەدەبی، بەو واتایەی کاتێك شیعرەکانی وەك گوێز دەشکێنی و کاکڵەکەی دەردەهێنێ و پەلکی خەیاڵی لێدەکەیتەوە، جەوهەرێکی درەوشاوەی بێ غەلوغەش بەدیار دەکەوێ، بۆیە وشەی (دایك) کــە لــەم دەقــەدا، شاعیر وەك فریــادڕەس هــاواری دەکــاتێ، ڕوخســارە حەقیقەکــەی ئــەو دایکــە و ئــەو ســۆز و خۆشەویستییە نیشاندەدا.

---

[٩٤]) پیاسەیەك لەگەڵ جۆن دۆن دا، نەزەند بەگیخانی، بڵاوکراوەی ناوەندی غەزەلنووس، سلێمانی، ٢٠١٧، ل ٢٢

[٩٥])https://www.biography.com/news/audrey-hepburn-facts-biography

**فەزای خۆشەیستیی دایك پانتاییەکی چوار ڕەهەندی هەیە:**

- **ڕەهەندی مێژوویی:** زۆر پێش هاتنەخوارەوەی کتێبە ئاسمانییەکان و سەرهەڵدانی چاخی یەکتا پەرستی (خودا)، دایك پەرستی لە زۆر کۆمەڵگاکاندا باو بووە، ئیمڕۆ نزیکەی (١٠٠) لە پەیکەری دایکە ـ خوداکان، لە مۆزەخانەکانی جیهاندا نمایش کراون. جا تاکو ئێستا، تقووسی ئەو خۆشەویستییە بۆمەمانان ماوەتەوە، بە شێوەی ڕێزگرتن و خزمەتکردنی ئەو کائینە ڕۆحسووکەڵەیە. ئەوەی لێرەدا ئاماژەی پێدەدرێ درێژەپێدەری ئەو خۆشەویستییە بەردەوام و نەپچڕاوەیە.

- **ڕەهەندی جوگرافیایی:** هەرچەندە ماڵ و گۆڕستان، وەك دوو مەنزڵی دایك، پێگەیەکی جوگرافیایی زۆر سنووردار و قەوارە بچووکیان هەیە، بەڵام مەودا ڕاستییەکەی بوون و ماهییەتی دایك، هەموو ئەو شوێنانەیە کە تۆ لەوێ مەوجوودی. ئەو خۆشەویستییەی ئێرە، لە دڵی بەگیخانیدا کوژانەوەی نییە لەسەر زەوی یان ئاسمان یان دەریا بێ. لەهەر شوێنێ ئەو لەوێ بێ دایکیشی لەوێیە.

- **ڕەهەندی بایەلۆژیی:** دوای بڕینی ناوکی کۆرپەڵە، پەیوەندی بایەلۆژیی و جەستەیی لە (جیینات) و (کرۆموسۆمات) و پێکچوونەکانی شکڵ و شێوە و ڕوخسار و جووڵە، لە نێوان دایك و منداڵەکەی دا هەر بەردەوامە و ڕەنگ بێ بپەڕنەوە بۆ چەندان پشت لە نەوەکانیان. کەواتە ئاساییە لە ئاوێنەی چاوی بەگیخانیدا، خۆشەویستی دایك بە ڕەوانی بخوێنینەوە.

- **ڕەهەندی ڕۆحی:** ڕەنگ بێ ئەوەیان بۆ بەگیخانی، گۆشە هەرە چڕ و پڕ و خەست و خۆڵەکەی خۆشەویستی دایك بێ، چۆن؟ ئەو کائینە ڕۆحسووکەی بە نازناوی (دایك) بانگی دەکەین، لە دیدو ڕۆحی بەگیخانیدا، کائینێکی ئاسمانی، پەریزادەیی، موعەزەب، غەدرلێکراو، مەحرومکراو، گۆشەگیرکراو، سووتێنراو بە چزی (٣) تازە بەمەرگی خودی شاعیر، ناوی بزرنابێ، چونکە شیعرەکانی نەمرییان بەو بەخشیووە.

وشەی (دایك) لێرەدا، ئاماژەیە بۆ شاعیر و دایكی شاعیر و كـۆی ژنـانی گـەرمیان ـ كـە ڕەمزە بۆ كۆی ژنانی كورد، جا سدقە ئەدەبییەكە لەوەدا دەبینرێ، كە دایكی شـاعیر بەڕاسـتی (٣) جار، بە لەسێدارەدانی (٣) لە كوڕەكانی جەرگی سووتاوە، كە ئەمـەش ڕاسـتەخۆ جـەرگ سوتانی شاعیرە، هەستكردنی شاعیریش لێرەدا بە جەرگ سوتانی ژنـانی گـەرمییان، خـەیاڵ و فانتازیا و خەون نییە، بەڵكو ئاوێتەكردنێكی واقیعی و مێژوویی و ئەدەبییە بە زمـانی شـیعر. ئەوەی كە زۆر سەرنجڕاكێشە لەم دونیا گەورەدا، لەم میحنەتە بەسۆیەدا، شاعیر لە غەیری دایك كەسێك نابینێتەوە ئەو هاوارەی بۆ بەرێت، ئەمـەش نیشـانەی مـەزنی و پـیرۆزی و پایـەداری مەقامی دایكە لە دیدی شاعیردا .(پاریس) كە شاری جوانی و ژیان و ئەڤینە، لەو شاعیرە بۆتە دۆزەخ و بە چاوتروكاندنێك خۆی دەگەێنتە ناو دۆزەخەكەی ئەنفالی گەرمیان. ئا لێرەدا پانتـای جوگرافیای و مێژووی سۆزی دایك بەدیاردەكەوێ.

دەقەشیعرەكە، ئەو زوڵمە گەورەییەی كـە مرۆڤایـەتی دەرحـەق بـە كـورد دەینـوێنن، بـە ئەرشیف دەكات، كە هەموویان لـە بێـدەنگی بوونیـان و چاوپۆشـینیان لـەو تاوانانـەی لێمـان دەكـرێ، كـۆك و تـەبان. لـە چـاوی دایكێكـەوە چـاوی هـەموو ژنـانی ئـەنفالكراوی كـورد دەخوێنینەوە، كە شاعیر كارامانە گوزارشتی لە خەمەكانی كردوون.

"هۆنەرانی كورد لە قۆناغە جیاجیاكانی مێژوودا، خاكی نیشتمانەكەی خۆیان خۆشویسـتووە، شانازییان پێوەكردووە، زۆر بەتوندی بەخاكی كوردستانەكەیانەوە نووساون." [٩٦]

**عەبدوڵڵا جەوهەر و دایك:**

عەبدوڵڵا جەوهەر، دیوانێكی شیعری بەناوی *(دایە گیـان)* لـە دووتـوێی كتێبێكـی (١٤٤) لاپەڕیی، لە ساڵی (٢٠١٣) چاپكردووە، كە سەراسیمەی شیعرەكان لاوانەون بۆ دایك و پـیرۆزی

---

[٩٦]) حوسێن محەمەد عەلی، یاقوت و زمروتی كوردی، (سروشت و جوانی)، چاپخانەی سیما، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل ١١

و مەزنی دایك ستایش دەكەن، بەرهەمەكە پتر لە بیست شیعرن و هێندێكیان ژمارەیان بۆ تۆماركراوە لە جیاتی ناونیشان، گەرچی هەر لەژێر ناونیشانی دایكن.، ئەمەش نموونەی مشتێك لەو ناونیشانانەن: (*دیمەنی دایك و زنجیرەیەك پرس و ڕا، لاشەی دایك بەرە و تاتە شۆر، لە سەر قەبران بەدیار تەرمەكەیەوە، بەجێ هێشتنی دایك پاش ناشتنی، سكاڵای یەكەم شەوی بێ دایكی، لەیەكەم سەردانی ئارامگای دایكا،لە بیرەوەرییەكانی دایك...تاد*). شاعیر، لە دەقەشیعری (*لەسەر قەبران بەدیار تەرمەكەیەوە*)دەڵێ:

***باوەڕم نەبوو دایە گیان هەرتۆ بیروباوەڕم بووی***

***ئایینم نەبوو دایە گیان تۆ ئایین و دەوارم بووی***

***ئەوا تۆشیان ڕاپێچ كردەووە بۆ گڵ لە باوەش گرتن***

***بەدوای تۆشا هەش گیرایەوە بۆسەر و دڵ تێنیشتن....***[97]

كاتێ كە شاعیر باسی یەكەم وێستگەی ناخۆش دەكات، ئەوساتەی كەوا لەسەر قەبران، بەدیار تەرمەكەی دایكییەوەیە، پۆپەی شكۆمەندی نیشاندانی شاعیر بو دایكی لەوەداچڕكراوەتەوە، كە ئەوی كردۆتە سونبولی باوەڕ و ئایینی خۆی، بەڵام نازانین دوای مەرگی ئەو سونبولە. ئاماژەكردن بۆ (هەش)، ئاوەردانەوەیە لە ڕابردوو و كەلتووری كوردەواری كە خەم و موعانات و بەدبەختی ژیانیان هەمیشە بە (هەش) ڕەنگرێژكردووە، ئێستاشی لەگەڵ دابێ بۆ تووك كردن دەڵێن: هەش بەسەرت! سەرت لە هەشێ نێی!

لە دەقەشیعری (سكاڵای یەكەم شەوی بێ دایكی) دا، دەقنووس لەسەر نەزمی شیعری كۆن، (ئەمشەو)ی كردۆتە پاش سەروا و هەرچی خەم و پەژارەی ژیان هەیە لەدوای مەرگی دایكیدا بۆتە میرات و دیاریی ئەو. لە تێكستەكەدا دەڵێ:

---

[97]) عەبدوڵلا جەوهەر، دایە گیان، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠١٣، ل ٧٨

***لە جێی خۆشی دایك، خەم وا بەدیارمەوە ئەمشەو***

***گریانی کڵۆڵی، وا بەژوور سەرمانەوە ئەمشەو***

***دەروازەی سوێبوونەوە، لەسەر گازی پشتە ئەمشەو***

***تروسکەی خۆشی، لەگەڵ ڕەشی خەما خشتە ئەمشەو***

***پەشێوی بەرپێشووی خەم دادراوەتەوە ئەمشەو***

***پەژارە لەدەروونا، دەم کراوەتەوە ئەمشەو***

***بێ نازە سۆزە، چاوی خۆشی، خەمی تێزاوە ئەمشەو***

***زامارە کۆست و کەساسی، سەری تێناوە ئەمشەو***

***گوێ ئاگردانی، خوشك و برایان، گەرمە ئەمشەو***

***تابوتت لەترئەدا، خانە تاریکی شەرمە ئەمشەو..***[98]

"دوا وێنە لە هیچ شتێك تەواو نەبووە، هەر شاعیرە و بەکامیرای زووم تیژوو بەسەرنجی وردی دەتوانێت وێنەی وابگرێت کە پێشتر کامیرای هیچ شاعیرێك وێنەی نەگرتبێت."[99] هەرئەمەشە وای کردووە شاعیران لە گۆشەنیگای جیاوازەوە بڕوانە جیهانبینی دایك و خۆێندنەوی بۆ بکەن.

***بەڵێن باقلانی لەشیعری (دایك) دا دەڵێ:***

***من ئەگەر مردم قەت بۆم مەکەن شین***

***نە تەعزیە دانێن نە گریان و شین***

***نەخزم و کەسان نەبراودۆستان***

---

[98]) سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٦

[99]) هاوژین سلێوە، خۆری دەق و ئاوێزەی رەخنە، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٣، ل ١٣١

***کەس لەدوام نەڕوا بۆسەر گۆڕستان***

***هەر تەنها دایکم بێت بۆسەر گۆڕم***

***هەر ئەو دەزانێت حاڵی کڵۆڵم***

***با تێر بگرییَ و بڵی بەڵێن گیان***

***لەدنیا نەتدیت خۆشی لەژیان***[100]

شاعیر تەمەنادەکات لەدوای مردنی، تەنها دایکی سەردانی گۆڕەکەی بکا، تەعزیەی ناویَ، شین و گریانی کەسی قبوڵ نییە، تەنها شین و گریانی دایك، لەنێو هەموو حزم و کەس و خۆشەیستان، تەنها دایکی هەڵبژاردووەو شیوەن و گریانی ئەوی دەویَ، ئەوەش مانای ئەوەیە دایك خۆشەویسترین و دڵسۆزترین کەسە بەلای شاعیرەوە.

**پووختەی تەوەرەکە:**

دەتوانین بڵێین لە ئەدەبدا دایك وەك (ئاو) وایە. کە بنکە هەنارێك ئاودەدەی هەناری شیرین، یان مزر، یان ترشت دەداتیَ، کە بە هەمان ئاو باغێك ئاودێر دەکەی، جۆرەها گوڵت دەداتیَ، خۆ کە بارانی پەڵەش بەسەر پارچە زەویەکی تۆکراودا دەباریَ، گێڵگەی گەنم و جۆی لیَ دێتە بەرهەم. کتومت (دایك)یش وایە، دەبینین لە بەراو و زەوی و باغی هەر شاعیرێك بە جۆرە بەرهەم دەهێنیَ کە جیاوازن لە یەکتری. لەڕاستیدا کەم زاراوە هەیە هێندەی زاراوەی دایك گەورە و فرەڕەهەند بیَ و ئاست و ئاراستەکانی کراوە بن و هیچ سنوور و شوورە و تەیمانێکیشی دیار نەبیَ. ئەوە بەهرە و ئەزموون و توانستی شاعیرە، کە بەهای ئەدەبی، دەق دەست نیشان دەکات و لێرەدا دەستڕەنگینی شاعیر لە سنعەتی شیعردا بەدیار دەکەویَ کە چۆن (دایك)ی تەوزیفکردووە، چونکە (دایك) دەقێکی ئەدەبی کراوەی ئەزەلی و ئەبەدییە، هەموو سنوورەکانی تێکشکاندوە و هەمیشەش بەدوای داهێنان و شاکاری مەزندا دەگەڕیَ

---

[100]) دەستنووس، شیعری: بەڵێن باقلانی، لە ١٥ / ٢ / ٢٠١٨ وەرگیراوە.

# بــەشی ســێیەم

# دایك لە جیهانبینیی شیعری (لەتیف هەڵمەت)دا

***هەر شتێ خۆش بێ... پیرۆز بێ... جوان بێ***

***تامی ماچێکی دایکمی لێ دێ***

(لەتیف هەڵمەت)

## ١- بۆ هــەر دایــك؟

پرسیارێکی ڕەوایە. لەتیف هەڵمەت شاعیرێکی قەڵەم بە بڕشتە و لەوەتەی یەکەم بەرهەمی شیعری لە ساڵی (١٩٧٠) بەناوی (خوا و شـارە بچـکۆڵەکەمان) بڵاوکردۆتـەوە، گەنجینەیـەکی دەوڵەمەند و بەنرخ و بەرچاوی خستۆتە کتێبخانەی کوردییەوە، کە شەن وکەوکردن و ڕاڤەکردن و شیتەڵ کاریکردنیان زەحمەتە بە تاقی تەنیا و لە ماوەیەکی کەمـدا بـە نووسـەرێك بکرێـت. لـە دیدی ئێمەدا، هەڵسەنگاندن و نرخاندنی بەرهەمــەکانی ئـەو شـاعیرە ـ وەك هێنـدێك شـاعیری دیکەی کورد، تا لە چوارچێوەی لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی و ئەدەبی هاوچەرخدا بەرجەسـتەبکرێن، پێویســتیان بــەو نووســەرانە هەیــە، کــە ســەرەڕای شــارەزایی و لێزانــی و بەهەرەمەنــدی و دەستڕەنگینیان لە ئەدەب و ڕەخنەدا، وەك (لـەتیف هەڵمەتناس)یشـدا پێویسـتە کارامەییـەکی تایبەتیان تێدا هەبێ.

تاکو (٢٠١٨) کۆی بەرهەمە چـاپکراوەکانی ئـەم شـاعیرە ڕێـك (٢٤٠٠) لاپەڕەیـە. خـۆ زەحمەتە لە چـەند سـەرەقەڵەمێکدا بتوانرێـت هـەموو ئـەو تـەوەرە و ڕەهەنـد و گۆشـەنیگا و جیهـانبینی و فەلســەفە و شــێواز و گوزارشــت و دیدانــەی شــاعیر، کــە لــە بەهەمەکانیــدا ڕەنگیانداوەتەوە کورت بکرێنــەوە. ئـەوە چ جـای ئـەو قوتابخانـە ئـەدەبی و ڕێبـاز و میتـۆدە جیاوازانەی لە شیعرەکانیدا پـەیڕەویکردوون. لـە ئاکـامی خوێندنـەوی کۆبەرهەمــەکانی، ئـەم خاڵانەمان هەڵێنجا کە شاعیر:

- خاوەن گەنجینەیەکی زمانەوانی دەوڵەمەندە.
- پانتای و سنووری بابەتەکانی فراوان و واڵا و کـراوەن و بـە دەگمـەن بابـەت هەیـە بەسـەری نەکردبێتەوە.
- شێوازی نووسینی جیوە ئاسایە، زۆر مەراقییەتی هەمیشە گۆڕانکاریی لە دارشـتن و زمـانی شیعریی خویدا بکات.
- وەك مرۆڤێکـی مولتـەزیم، خـەتی فەلسـەفەی شـیعری و ئـەدەبی و جیهـانبینی خـۆی دیاریکردووە و دژی بەرەڵایی و سەرلێشێواوی و سەرگەردانی ئەدەبییە.

○ هەڵگری پەیامێکی (یان چەند پەیامێکی) ئەدەبی و ئەخلاقی و نەتەوەیی و مرۆڤانەیە کە تا سەر ئێسقان باوەڕی پێیەتی و کاری بۆ کردوون.

○ بەرهەمەکانی دەوڵەمەندن بە کەرەستەی فۆلکلۆری و کەلتووری و داستان و ئەفسانە و ڕەوانبێژی و پاشخانی مێژوویی و مەعریفەی هاوچەرخی هەمەچەشن. چونکە خوێنەرێکی باخەبەر و هۆشیارە و زانیارییەکانی فرە سەرچاوەن.

○ ئەزموونەکانی، سەرەڕای ئەوەی بەشێکن لە ئەزموونی ئەدەبی کوردی و جیهانی هاوچەرخ، مۆر و شەقڵی تایبەتی شاعیریان پێوەدیارە، کە دەکرێ بخرێنە ناو کەوانەی (ئەزمونگەرایی شیعریی لەتیف هەڵمەت).

کەواتە، دەیان و بگرە سەدان، ناونیشانی شاراوە، لە ناو دەقەکانی لەتیف هەڵمەتدا، خۆیان شاردۆتەوە و چاوەڕوانی قەڵەمی بە توانست و ڕەند و چەلەنگن، هاوشان بە مەعریفە نوێیەکانی سەردەم، شیتەڵکاریی و ڕەخنکاری و لێکۆڵینە و توێژینەوی نوێیان لەسەر بکرێت. بۆیە ئێمە لە ناو ئەو خەرمانە ناونیشانە، ناونیشانی (دایك لە جیهانبینی شیعری لەتیف هەڵمەت)مان هەڵبژارد و لە سایەییدا ئەم کتێبەمان نووسی.

لێتان ناشارینەوە، هەرچەندە سنووری لێکۆڵینەوەکەمان دیاریکراو و بازنەئاسایە، لێ لەسەرتاوە چەند ترسێکمان لێنیشت، کە ئاخۆ چەندە دەرەقەتی ئەو ناونیشانە دێین و دەتوانین نیشانەی مەبەست بپێکین، چونکە:

○ جیاکردنە و لەتکردنی دایك لە کۆبەرهەمەکانی شاعیر کتومت وەك ئەوە وایە کە تۆ کچێکی جوانت بەرانبەر بێ، بەڵام هەر چاوێکی یان دەستێکی یان مەمکێکی ببینی و نەتوانی هەموو جوانییەکەی ببینی. بە ڕاستی ناشکرێ دەست بۆ هەموو ئەو تەوەرانە بەرین کە شاعیر لەدەرگای داون و هەر ئەوەندەمان بۆ دەکرێ تەوەرە پەیوەندارەکان، بە دایك، بەسەر بکەینەوە.

o مامەڵەکردن لە گەڵ (ناونیشانی دایك) مامەڵەکردنێکی هاوچەرخانەیە لەگەڵ لایەنی دەروونی شاعیر و کۆمەڵناسی کوردەواری (Sociology) و دەروونشیکاری کۆمەڵگا(Psychosocialanalysis) و سایکۆلۆژی سۆز ( Psychology of sentiment) کە هەموویان پەیوەستن، بە شێوەیەك لە شێوەکان، بە ژیان شاعیر و دایکی شاعیر و ئاوێتەبوونی گاریگەرییەکانی نێوانیان. بۆیە هەوڵمانداوە، نوێترین کتێبی ئەم ڕشتانە بە زمانی دیکە وەدەست بێنین و زانیارییان لێوەهەڵێنجین، چونکە کتێبخانەی کوردی تا ڕادەیەك بەم چەشنە کتێبە هەژارە.

لەسەرەتای ئەم سەدەیەدا، کۆبەرهەمی شیعری چەند شاعیرێکی کورد، بە قەبارەی گەورە کەوتنە بەردەست خوێنەران، کە تاڕادەیەك، ئەمە وەك دیاردەیەکی نوێ سەیردەکرێت، چونکی پێشتر، بەرهەمی شیعری کوردی هەر شاعیرێك، لەچەند کتێبێ و دیوانێك پتر نەبوون. ئەگەر کۆبەرهەمی شیعری شێرکۆ بێکەس، کە نزیکەی (٦٨٥٧) لاپەڕەیە، بۆ کورد ڕووباری فورات بێ، ئەوا کۆبەرهەمەکەی لەتیف هەڵمەت، ڕووباری دیجلەیە، لە دەوڵەمەندییدا. جا ئەمە وایکردووە، کە هێندێك بابەت و تەوەری ئەو شیعرانەی ئەو شاعیرانە، ڕووبەر و پانتاییەکی ئەدەبی یەکجار فراوانیان هەبێ.

دایك لە کۆبەرهەمی لەتیف هەڵمەتدا، نموونەیەکی کەمنەزیرە لە ئەدەبی کوردیدا، کە شاعیر لە دووتوێی دیوانە شیعرەکانی شیعری زۆری بۆدایك نووسیوە، تەنانەت دیوانێکی شیعری ناونیشانی (ئەو نامانەی کە دایکم نایانخوێنێتەوە)، لە ساڵی (١٩٧٩) چاپکردووە. کە هیچ شاعیرێکی دیکەی کورد، پێشتر ئەمەی نەکردووە و ئەوەندە شیعرەی بۆدایك نەنووسیوە. بێگومان، ئەمە کردەیەکی هەمەڕەکی ناهۆشیاری بێئاگایانەی بێمەرام نییە، لەهەر گوتنەوەیەکی وشەکەدا، شاعیر مراز و پەیامی خۆی هەیە، با چاوێك لەم خشتەی خوارەوە بکەین و بزانین شاعیر چەندە گیرۆدە و شەیدای وشەی (دایك)ە لە کۆبەرهەمەکانی دا:

| وشە | جار | وشە | جار |
|---|---|---|---|
| دایك / دایە | 540 | باوك | 50 |
| خوشك | 38 | برا | 175 |
| باپیر | 18 | منداڵ | 502 |
| ژن | 556 | كچ | 1057 |
| هاوڕێ | 130 | شەهید | 78 |
| مانگ | 140 | چیا | 206 |
| دارستان | 96 | نیشتمان | 69 |
| دڵ | 1291 | گوڵ | 706 |

دووبارەبوونەوەی ئەم وشانە لەكۆبەرهەمی شیعری لەتیف هەڵمەتدا

دوو بژاردە وشەمان خستۆتە ڕوو، یەكیان تایبەتن بە مرۆڤ: (خوشك و برا و هاوڕێ و شەهید...تاد) و ئەوی دیكەیان بێگیانن:(چیا و دارستان و دڵ و گوڵ...تاد). بۆ ئەوەی بزانین سەنگ و قورسایی ئەم بژاردەیە وەك كەرەستەی شیعری، چەندە لەهزری شاعیر دەنگدانەوەیان هەیە و چەندە جێ پەنجەیان لە سەر كۆبەرهەكەیدا دیارە، دەبینین:

- وشەی (دایك - دایە) (١٠.٨)دە پۆینت هەشت، واتا نزیكەی یازدە هێندەی (باوك) بەكار هاتووە.
- كۆی ژمارەی وشەكانی (باوك و باپیر و خوشك و برا) دەگەنە (٣٩٣)جار، بەڵام بەتەنها دایك (٥٤٠) جار بەكار هاتووە.
- ڕێژەی ژمارەی هەر یەك لە (مانگ و چیا و دارستان)، دەكاتە (٤٤٢)جار.
- ژمارەی وشەی (گوڵ) بەڕێژەی (٣٨٪) لەسەروی ژمارەی (دایك/ دایە)ە.
- تەنیا ڕێژەی ژمارەی وشەی (دڵ) لە (٦٩٪) لەسەرووی ژمارەی (دایك/ دایە)ە.

بڕوانە ئەم هێڵكارییەی خوارەوە تا باشتر سەنگی دایك بە بەراوەرد لەگەڵ كەسەكانی دیكەدا ببینی:




## ٢- لەتیف هەڵمەت و دایە (سەعدییە) کێنە؟

پووختەیەك لە ژیاننامەی شاعیر ڕەنگ بێ باشتر ببێتە دەستگری ئەو خوێنەرانەی لە نزیکەوە بە ئەو ئاشنا نین. بۆیە ئەم مشتە زانیارییەتان بۆ تۆماردەکەین کە د. هاوژین سڵێوە لە دیمانەیەکیدا لەگەڵ لەتیف هەڵمەت لە ساڵی (٢٠١٢) وەدەستی هێناوە، زانیارییەکانیش ئاوێتەی چەند زانیارییەکی وەرگیراوی تر دەکەین.

لەتیف هەڵمەت لەساڵی (١٩٤٩؟ ١٩٥٠؟) لە شاری (کفری) لە دایك بووە، ـ هەرچەندە لە ناسنامەیدا ساڵی (١٩٤٧) تۆمارکراوە. ئەو لە خێزانێکی ئایین پەروەر گەورەبووە، باوکی کەسێکی خوداناس و ڕۆشنبیر بووە،((کاتێك کە لەتیف هەڵمەت چاوی کردۆتەوە، خۆی لەماڵێکدا دەبینێتەوە، کە پڕبووە لەکتێبی ئایینی و ئەدەبی، بۆیە لەوێوە فێری خۆشەویستی وشە بووە، بەڕادەیەك ئەو کەشەی بۆی خولقاوە، هەڵمەتی ئامادەکرد، بۆئەوەی ببێتە ئەو شاعیرەی کە سنووری کۆنی دەق بشکێنێ))[١٠١] لەتیف هەڵمەت گوتەنی: ((ماڵی ئێمە هەمووی باسی فریشتە و مەلەك و موعجیزەی پێغەمبەران و پیاوچاکان بوو، هەر لەو ماڵە ڕۆشنبیرەی خۆمان شەوانە باوکم ژیانی پێغەمبەرانی بۆ دەگێڕاینەوە، باسی حەزرەتی موسا و فیرعەون و

[١٠١]) سامان عیزەدین، بنیاتی هونەری لە شیعری لەتیف هەڵمەتدا، چاپخانەی کەمال، سلێمانی، ٢٠١٠، ل ٥٢

حەزرەتی عیسا و لەدایك بوونەكەی و باسی حەزرەتی (ئەیوب) و عەزابەكەی، بەجۆرێ لە جۆرەكان ئەمانەم هەموو وەردەگرت.))[١٠٢]

ئەو كتێبانەی كە باوكی لەماڵەوە هەیبوە، وەكو گوڵستانی سەعدی و دیوانی حافزی شیرازی شیعرەكانی(خەیام) و چەند دیوانە شیعرێكی دیكە و كتێبی دیكە دەبنە سەرچاوەی گەنجینەیەكی باشی ئەدەبی و كەلتووری و زمانەوانی بۆ ئەو، هاوكات لەگەڵ خوێندنەوە و موناقشەكردنی ئەو بابەتانە لەگەڵ مەلایەكان و گێڕانەوەی چیرۆك و سەرگوزشتە و داستانەكان لە لایەن دەروێش و ژن و پیاوی دەرودراوسێ و دەڤەرەكە، هەموویان وایان كرد ئەو باشتر چاوبكاتەوە و لەدەوروبەری تێبگات.(بروس كوئن)دەربارەی پەروەردە كردنی منداڵ و دروست بوونی كەسایەتییەكەی دەڵێ: "منالێك لەبنەماڵەیەكی كرێكاردا پەروەردە بووبێت، یەكێكی دیكە لەبنەماڵەیەكی پاشایەتی، رەنگە دوو پێگەی كۆمەلایەتی زۆر جیاوایان هەبێ، ئیمكاناتی ژیان و شێوەی پەروەردەو بارو دۆخی هەركامیان رۆڵ دەبینێ لە هەڵبژاردنی داهاتوو و پیشەو پێگەی كۆمەلایەتی"[١٠٣] لەتیف هەڵمەتیش لەبنەماڵەیەكی رۆشنبیرو باوك مەلاو دایك قسەزان و فۆلكلۆر زان پەروەردە بووە، ئەوە كاریگەری زۆری هەبووە لەسەر شاعیریەتی و دروست بوونی كەسایەتی ئەدەبی. چەندان نموونەی لەم شێوەمان هەیە، بۆنموونە (فایەق بێكەس) (شێركۆ بێكەس)ی هێنایە وجود، (گۆران)ی شاعیر (ئەژی) كوڕی بەرەو ئاراستەی شیعر برد...

لەتیف هەڵمەت سەردەمی منداڵی خۆی، لەگەڵ خوشك و براو هاوڕییانی گەڕەك، تا ڕادەیەك بە خۆشی و ئاسایی بەسەر بردووە و ناخۆشی و دڵتەنگی گرانی نەهاتۆتە ڕێ. تا ڕۆژی (٤/ ٤/ ١٩٦٧) كە لەو ڕۆژەدا، دایكی كۆچی دوایی دەكات. لەتیف هەڵمەت بەدەیان خەلاتی

---

[١٠٢]) دیدەنی هاوژین سڵیوە لەگەڵ لە تیف هەڵمەت، ١٩/ ٣/ ٢٠١٢

[١٠٣]) بروس كوئن، ترجمه و اقتباس دكتر غلامعباس توسلی ـ دكتر رضا فاضل، مبانی جامعه شناسی، چاپ بیست و هشتم، تهران، ١٣٩٥، ص٨١

ڕێزلێنانی وەرگرتووە دیارترینیان: خەڵاتی ئاپیك ـ وڵاتی سوید، بۆشیعری منداڵان، ساڵی ٢٠٠٠. خەڵاتی ڕێزلێنانی ئیبراهیم ئەحمەد، ساڵی ٢٠٠٨، خەڵاتی وەزارەتی رۆشنبیری عێراق...[١٠٤]

خاتوو(سەعدیە حوسێن حەسەن بەرزنجی)، دایکی شاعیر، ئامۆزای باوکی بووە و لە بنەماڵەیەکی ئایین پەروەر گەورەبووە. سەربەڕێبازی قادری بووە، باب و باپیریپیشی هەر سەر بەم ڕێبازە بووین. ئەگەرچی ئەو ژنە نەخوێندەوار بووە، بەڵام زۆر زرنگ و بە هۆش و بەئاگا بووە. زۆر تەواشیحی دینی و موناجاتی دینی لەبەربووە. لەتیف هەڵمەت دەڵێ: " لەو کاتەی کە دایکم مناڵەکانی خۆی، ئێمەی دەخەواند لەبرِی (گورگانە شەوێ) بەموناجات دەیخەواندین. ئەم شتانەش کاریگەری لەسەر دروست بوونی شاعیریەتی من هەبوو، بۆنموونە دەیوت:

***عەبدولقادر خەرقەی شینە***

***ئۆغر ئەکا بۆمەدینە***

***لائیلاهە ئیلالّا***

***عەبدولقادر خەرقەی سەوزە***

***دەست نوێژ دەشوا لەو حەوزە***

***لائیلاهە ئیلالّا***

لەو بابەتانەی زۆر لەبەر بوو، نازانم خۆی داینابوو، یان لە تەکیەکاندا گوێی لێ ببوو و لەبەری کردبوو."[١٠٥]

---

[١٠٤]) لەتیف هەڵمەت و داهێنان، لەبلاوکراوەکانی مەکتەبی راگەیاندن و ڕۆشنبیری حزبی شیوعی کوردستان، ٢٠١٣، ل ٢١ (خەرقە: قاپووت)

[١٠٥]) پەیوەندی تەلەفۆنی هاوژین سلێوە لەگەڵ لەتیف هەڵمەت، ٣/ ٦/ ٢٠١٧

کەواتە شاعیر لەتەمەنی (١٥ـ١٦) ساڵیدا ـ هەرەتی هەرزەکاری، خۆشەویسترین کەسی لەدەست دەدات و بەمەش قۆناغێکی نوێ، پڕ لە خەم و حەسرەت و نائارامی دەروونی و ڕۆحی لە ژیانی شاعیر دەست پێدەکات. تا ئەو ڕادەییەی کە دەتوانین بڵێین ئەو هەورەتریشقەیەی دومەڵانی شیعری لە بیابان و سەحرای دڵی ئەدا هەڵتۆقاند و نیشانیدا، کۆچە مەزنەکەی دایکی بوو، "مردن یەکێکە لەو بابەتانەی هەمیشە لە دنیابینی شاعیرانی ئێمە ئامادەگی هەبووە، کەم ئەزموونی شیعری شاعیرانی ئێمە هەیە لە گشت قۆناغەکانی شیعری کوردیدا، تێیدا باس لە مەرگ و مردن و ترس لەمردن نەکرابێ"[١٠٦]، بەڵام ئەو بابەتەی لەتیف هەڵمەت، تەنها شتێکی سەرپێیی نییە و بڵێین لە شیعرێك و دوان هاتبێ، بەڵکو بە قوڵی ڕۆچۆتە ناو ئەو بابەتە، ئەوەی لای لەتیف هەڵمەت دەبینرێ ئەوەیە: ئەو کەسێکی گەشبینە و تەمەنای مردن ناکات، بەڵام شیعر بۆئەو کەسانە دەنووسێ کە مردوون و لەبەین چووین. لەوانەش دایکی خۆشەویستییەتی. مەرگی دایك پرسیاری زۆری لا دروست کردووە. لەتیف هەڵمەت دەڵێ: "هەست کردن بەبێ دایکی زۆر پرسیار و ئیستفساری نوێی لەلا دروست کردم، ئەتوانم بڵێم زیاتر هانی دام بۆ ئەوەی هاوڕێیەکی دیکە بدۆزمەوە بۆ خۆم لەبری دایکم ئەویش شیعر بوو، ئەگەر چی لە ساڵی (١٩٦٣)وە، کاتێ بیست و هەشت پێشمەرگە لە زەمانی (زەعیم سدیق)دا شەهیدکران، یەکەم شیعرم بۆ وان نووسی، بەڵام جوانترین شیعرم لە خواو شارە بچکۆڵەکەماندا بۆ دایکم نووسیوە، خۆشەویستی من بۆ دایکم بێسنوورە، کە قەناعەتم نەدەکرد مردووە، شیعرم بۆ دەنووسی وەك ئەوە وابێ بۆ کەسێکی زیندووم دەنووسی." [١٠٧] لەتیف هەڵمەت "شیعرێکی زۆری لە ناخی دەروونێکی پڕ لە گڕو جۆشی بۆ دایکی نووسیوە" [١٠٨] ئەرستۆ وتوویەتی: "

---

[١٠٦]) سدیق سەعید ڕەواندزی، شاعیرێك لەنێوان مەرگ و ژیاندا، خوێندنەوەیەك بۆشیعرەکانی شەهید مەلا عەلی، چاپخانەی شەهاب، هەولێر، ٢٠١٢، ل١٥

[١٠٧]) دیدەنی هاوژین سلێوە لەگەڵ لە تیف هەڵمەت،١٩ / ٣ / ٢٠١٥

[١٠٨]) هاوژین سلێوە، ڕەهەندی دەروونی لە شیعرەکانی لەتیف هەڵمەتدا، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١٣، ل ٩٢

ئەگەر ویستت لەشتێ تێبگەی، دەبێ بگەڕێیتەوە سەر بناغە و سەرچاوەی ئەو شتە" [١٠٩]،
کەواتە بەدەر لە سۆز و خۆشەویستی دایك، ئەوەی کە بووە هۆکاری پتر پەرێشانی شاعیر بەم کۆچە، ئەوە بوو کە خاتوو سەعدییەی دایکی لە ڕووداوێکدا دەسووتێ و دوای چەند ڕۆژێك لە نەخۆشخانە گیان لە دەست دەدات.

دوای ڕوخانی ڕژێمی پاشایەتی و جێگرتنەوەی بە دەوڵەتی کۆماری لە ساڵی (١٩٥٨)، لە عیراقدا چەند بڵاوکراوەیەکی کوردی کەوتنە بازاڕ و لەتیف هەڵمەت ئەوەندەی دەستی پێڕاگەیشتبێ، ئەو گۆڤار و کتێبانەی خوێندۆتەوە وەك: گۆڤاری (بڵێسە) و (گەلاوێژ)، بێگومان، ئەو لە سایەی قورئان و کتێبە دینییەکانەوە، عەرەبییەکی باش فێربوو، کە هاندەر و ڕابەری بوو لە خۆ ڕۆشنبیرکردن و خۆ پێگەیاندنی فکری و فەلسەفی لە دواتردا. ئەو دەڵێ: "لەتەمەنی حەڤدە هەژدە ساڵی دا بڵێین لەساڵی (١٩٦٧ – ١٩٦٨ ) دوای مردنی دایکم دەستم کرد بەشیعر و بڕوام وابوو کە لە شیعردا لەنێو کوردا هاوتام نییە، بەم شێوەیە دەستم پێکرد ئەوجا نازانم لەو نەقسە بووە کە دایکم ناویەتەوە بۆ ئەوەی ئەم بۆشاییە پڕبکەمەوە." [١١٠]

لە ساڵی (١٩٧٠)، کاتێك شاعیر یەکەم بەرهەمی شیعری بە ناوی: (خوا و شارە بچکۆڵەکەمان) بڵاوکردەوە، قۆناغی ژیانی ئەدەبی ئەو دەستی پێکرد و بە چەندان وێستگەی جیاوازدا تێپەڕی تا گەیشتە ئیمڕۆ، بێگومان بزووتنەوەی (ڕوانگە) لە سەرەتای حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو لە تافی لاویەتی شاعیر سەری هەڵداو، شاعیریش لەگەڵ کۆمەڵێ لاوی ئەوسا گروپی کەرکوك ـ کفرییان دامەزراند، کە هەردوو گروپەکە ڕۆڵیان هەبوو لە پێشخستنی شیعرو ئەدەبیاتی کوردی دا.

---

[١٠٩]) حوسێن حەمەکەریم هەورامی، مەولەوی شاعیری ئازار و خەمە، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٣، ل ٣٣١

[١١٠]) پەیوەندی تەلەفۆنی ( هاوژین سڵیوە) لەگەڵ لەتیف هەڵمەت، ٣/ ٦ / ٢٠١٧

لەگەڵ ڕۆژگاردا، بە حوکمی تێکەڵ بوونی شاعیر بە ئەدیبانی کورد و تورکمـان و عـەرەب و نزیکی لە شاری بەغدا و زۆر خوێندنەوە و بەشداری کردنی لە چالاکییە ئەدەبییەکانی کوردستان و عیراق، پتر چاوی ئـەدەبی ئـەویان کـردەوە و زۆری پێنەچـوو، تـوانی نـاوێکی دیـار بۆخـۆی پەیدابکات.

شاعیر ئێستا(٢٠١٨) لە شاری سلێمانی نیشتەجێیە و خێزاندارە ـ تاکو ئێستا خـوا هـیچ منداڵی پێنەداون، لەگەڵ هاوژینەکەیدا بە خۆشەویستی و قەدرگرانی ژیان بەسەر دەبەن.

لە هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو. شاعیر ژیانێکی سەخت و دژوار بە سەردەبات، لـە لایـەك زۆر دەستکورت و نەدار دەبێت و لە لایەکی دیکەش شـەڕو مـاڵوێرانی ناوچـەکە و کوردسـتان شەپرزە دەکەن و مەراقی دەدەنێ. ئەو لە هەڵگیرسانەوەی شـەڕی نیـوان حکومـەتی عیراقـی و شۆڕشی کورد، لەساڵی (١٩٧٤) دەچێتە شاخ و دەبێتە پێشمەرگە، ئەمەیش ئەزموونی شاخ و پێشمەگایەتی و کوردایەتی دەمەزەرد دەکاتەوە.

## ٣- دایك لە جیهانبینیی شـیعری (لەتیف هەڵمەت)دا

لەتیف هەڵمەت، وەك هەر شاعیر و ئەدیبێکی ئەم دونیایە، لە سەرەتای ئاشـنا بوونییـەوە بە شیعر و نووسین تا ئێستای کاروانسەرای تەمـەنی، بـە چـەندان قۆنـاغ و هـەوراز و نشـێوی دونیای ئەدەب و ژیاندا گوزەری کردوە و لە هەر قۆناغ و سەردەم و پێگەیەکدا کە پێیدا تیپەڕی بووبیت، بەجۆرێك لە جۆرەکان، ئەزموونی هزری و بیروباوەڕ و خەیاڵ و دیدەکانی دەوەڵەمەندتر کردوە و هەمیشە لەبیری ئەوەشدا بووە، بەگوێرەی بۆچوون و لێکدانەوە و فەلسەفەی جیهانبینی خۆی، بتوانێ ببێتە خاوەن دەنگێکی جیاواز. بۆیە دەتوانین بڵێین شـیعرەکانی لـەتیف هەڵمـەت تێکەڵەیەکی هەڵشێلدراوی تایبەتن بە خودی شاعیر، کە وەسـتایانە، وەك پیشـەوەرێك سـەری خۆی لە پێشەی شیعردا سپی کردبێ، کاری لەسەر زمانی شیعری و هـزری شـیعری و خـەیاڵی شیعری و پەیامی شیعری کردووە و ئەوەندەی بۆی کرابێ هەوڵیداوە، لەتیف هەڵمەتانـە، خـۆی بەخوێنەر بناسێنێ. "زمان سیستمێکە لە نیشانە (sign)کان پێکهاتووە. هەرکام لە ئێمـە لـە

ڕێگەی بەکارهێنانی تایبەتی زمانەوە، واتە لە گوتاردا، کۆمەڵە نیشانەیەك هەڵدەبژێرین و لە بەشێك لە تواناکانی زمان کەڵك وەردەگرین و شێوەیەك وتەی تاکەکەس یا شێوەی دەربڕینی تایبەت بە خۆمان دەخولقێنین"[111] لەتیف هەڵمەت زیرەکانە سوودی لەو توانا و توانستە زمانوانییە وەرگرتووە. دەتوانین بڵێین سەرکەوتووانەش زوو بەو مەرامەی خۆی گەیشتووە دوای ئەوەی کە هەموو ژیان و ڕەنج و خەباتی خۆی بۆ ئەم مەرامە تەرخان کردو خۆی لە خۆشییەکانی دیکەی ژیان مەحروم کردووە و لە جیهانی ئەدەبیاتەوە خۆشییەکان دەبینێ و بەشیلە و شیرینی ئەدەبیات رۆحی خۆی پاراودەکات، هەر لە سەردەمی بزوتنەوەی ڕوانگە، لە سەرەتای حەفتاکانی سەدەی ڕابردووەوە، ستایل و تەکنیك و پەیامی شیعری جیاوازی خۆی خستۆتە ڕوو، بە شێوەیەك کە لەجێی خۆیەتی پێناسەی ئەو لە چەند وشەیەکدا چڕبکەینەوە و بڵێین: (لەتیف هەڵمەت شاعیرێکی شیعر جوان، بۆ هەموان). ڕەنگ بێ بۆ هێندێك لە خوێنەران، بەبێ خوێندنەوەی شیعرەکانی ئەو دەقنووسە و دواتریش شیکردنەویان، ئاسان نەبێ، ئەو سێ ڕایەڵەی پێناسەکە: شاعیر/ شیعری جوان/ بۆ هەموان، هەزم بکەن، ئاخر وەسفکردنی ماچ هەرگیز ناتوانێ تام و بون و چێژی ماچت پێببەخشێ، بۆیە کارەکە نەختێك قورسە. دەستەواژەی (بۆ هەموان)، هەموو خوێندەوار و نەخوێندەوارێکی کوردزمان دەگرێتەوە، لە منداڵێکی سێ چوار ساڵان تا پیری سەرووی سەد ساڵان ـ بە هەموو جیاوازییەکان و تایبەتمەندییەکانیانەوە ـ ڕێ بە خۆشمان دەدەین بڵێین کە بەشێکی زۆری شیعرەکانی ئەم خەسڵەتە لەدەست نادەن ئەگەر موتەرجیمی بەتوانا وەریاگێڕێتە سەر زمانی دیکە. قسەکردن لە سەر (دایك لە جیهانبینی لەتیف هەڵمەتدا)، زۆر تایبەتمەند و بێنەزیرە، لەبەر ئەو هۆکارانەی خوارەوە:

- **سۆزداریی نێوان شاعیر و دایك، بەدەرە لە سۆزداریی ئاسایی کەسانی دیکە:**

---

[111]) بابك احمدی، ساختار و تأویل متن، چاپ پنجم، نشر مرکز، تهران، ١٣٨٠، ص ٧

○ به پەنابردن بۆ زانستی دەروونی سۆز بۆ هەردوو کەسەکە، دەگەینە ئەو ئاکامە، کە سۆزی ڕۆحی لە نێوانیاندا چەند بار لە سۆزی دەروونی خەستتر و چڕتر و گەرم وگوڕتر بووە. کاتێ بەهای ژیان گۆڕانی بەسەردادێ، جۆرە سۆزێك بەرپادەبێ، ژیان دەگۆڕێت [112]. مەرگی دایك جۆرە ژیان گۆڕانێکی بۆ شاعیر دروست کردووە. قوڵبوونەوەی ئەو بۆدایك، جیاوازە لە قوڵبوونەوەی مرۆڤی دیکە.

○ **شێوەی دەربڕینی سۆز لە لای ئەم شاعیرە لە چوارچێوە باوە ئاساییەکەی نێو کۆمەڵی کوردەواری دەرچووە و بووە بە حاڵەتێکی دەروونی پێیدەوترێت سۆزی بەجێماو:**

که خاوەنەکەی ناتوانێت خۆی لێدەربازبکات و هەمیشە بەدواوەیەتی. سۆزی دایك هەوێنی دەربڕینی بیرۆکەکانیەتی. لە زمانی یۆنانییەکاندا (idea)جگە لە بیرۆکە هەم بەمانای دیتن دێت، هەمیش بەمانای زانین. واتا بیرۆکە تەئویلی دیتن و زانین دەکات.

○ **چەندە دایکی شاعیر قەرزاری ئەو خۆشیی و موتکە و ئەڤینداریییەیە کە کوڕەکەی لە سەردەمی منداڵیدا پێیبەخشیوە، (لەتیف هەڵمەت)یش، چەند بار پتر قەرزاری دایکییەتی:**

کە پێوەندی خۆشەویستی و سۆزی نێوانیان، سروش و خەیاڵ و بیرۆکەی دەیان و سەدان دەقە شیعری جوانی پێبەخشیوە، ئەوە جگە لەو زمانە پاراو و گەنجینە دەوڵەمەندەی لە هەواری فۆلکلۆر و کەلتووری ئەوەوە سەرچاوەیان گرتووە.

○ **شاعیر بازنەی چەمکی دایك و جیهانی دایکی خۆی و دایکانی دیکەی فراوانکردووە:**

و کردویەتی بە کلیل و قوفڵی چەندان کایەی هزری و فەلسەفی و ئەدەبی کە پێشتر بەم شێوەیە پێیان ئاشنا نەبووین، لە لایەك دایکی خۆی دەکاتە دایکی هەموو منداڵانی دونیا و لە لایەکی دیکە وا هەست دەکات، دایکەکانی جیهان و مێژوو، لە قەلب و قالبی جیاواز، دایکی ئەون.

---

[112] ) محمد رضا شفيعي كدكني، ادوار شعر فارسي، تهران، ١٣٨٠، ص ١٠٤

- **له ئەدەبی کوردیدا، شاعیرێکی دیکەمان پێ شك نایەت، بە قەد لەتیف هەڵمەت دەقی شیعری لەبارەی دایك (بەهەموو شێوەکانییەوە) داڕشتبێ:**

بەدرێژایی قۆناغەکانی تەمەنی ئەدەبی خۆی بەبێ پسانەوە هاوڕێ و برادەری بوویێت و بەردەوامیش بێ، تا چرکەساتی تۆمارکردنی ئەم دێڕانە.

مەحرووم بوونی لەتیف هەڵمەت لە منداڵ، وەك باوك، باڵی سیبەرێکی تەمومژاوی بەسەر سۆزداری و جیهانی بێئاگایی ئەودا کێشاوە، کە هەمیشە جۆرە مەراق و حەسرەت و نامورادییەك لە دەقەکانیدا شاردراوەتەوە کە نامۆن لە دەقی شاعیرانی هاوچەرخی خۆیدا. ئەو زۆر جار دەچیتەوە جیهانی نەست و واهەست دەکا گەورە نەبووە و بەڵکو هەرمنداڵە. بۆیە هەمیشە پێویستی بەدایکیەتی بۆئەوەی یارمەتی بدات و سۆزی پێببەخشێت. کەریم دەشتی دەڵێ: "ژیان وا دەستی پێکردووە، دونیای شیعر ئاڵۆز و پڕ نهێنییە، هەمان ئەو نهێنییانەن تاوەکو ئێستا گێنگڵی داهێنانی شاعیرەکانن، لە نێو باوەشی نادیاری خۆیان شاردۆتەوە."[١١٣] نادیاری، بەومانایەی کە زۆر جار سەرچاوەکانی دەربڕین و داڕشتنی شیعری، بنەوان لە زۆر وردە سەرچاوەی تر هەڵدەبەستن، دایك تەنها تاکە وێنەیەکی نییە لەلای لەتیف هەڵمەت، بەڵکو هەزارەها وێنەی هەیە. " شیعریەت لێکۆڵینەوەیە لەو هەل و مەرجانەی کە زمان دەخەنە ئەرکی ئەدەبییەوە."[١١٤]، ئەرکی نووسینەوە و نەقڵکردنی وێنەکانی ژیان و ڕەنگڕێژکردنیان بەجیهانبینی خودی، ئەو جیهانبینییە خودیەش ئەگەر چی تایبەتە بە شاعیرێك، بەڵام کۆمەڵگاش تێیدا بەشدارە، چونکە کاتێ شاعیر باسی دایکی خۆی دەکا، منێکی خوێنەر

---

[١١٣]) کەریم دەشتی، کۆکردنەوەی شەونمی شیعر، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ٢٠١٧، ل ٩

[١١٤]) محەمەد عەبدولکەریم ئیبراهیم، پێکهاتەی زمانی شیعری لە ڕوانەگەی ڕەخنەی ئەدەبی نوێوە، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، ل٢٠

دایکی خۆم لە وێنە و دەربڕینەکانـدا دەدۆزمــەوە. حەمــە ســەعید حەســەن دەڵێــت: "شـاعیر بۆئەوەی کانیاوی بەهرەی چۆڕبڕنەبێت، پێویستی بەوە هەیــە کەسـێکی زۆر خـۆش بـووێ، یـا ڕقێکی زۆری لە دیاردەیەك یان دەستەڵاتێك بێـت."[115] لــەتیف هەڵمــەتیش دایکــی خـۆی زۆر خۆش دەوێ و ئەو ئەوینەی بەردەوامە، بۆیە لە هەموو دیوانە شیعرێکی کە بـڵاوی دەکاتــەوە، دایك بەشێوەیەکی بەرچاو حزور و وجـوودی هەیــە. سـایکۆلۆژیا لــە هەڵوێســتەکانی نووســەر بەرامبەر بە ئەدەب ڕەچاوی چـەند خاڵێــك دەکـات: "ڕەچـاوی ئەوکاریگەریانــەی چـواردەوری کەســەکە، کــە سەرچــاوەکەیان بریتییــە لــە پەیوەنــدی داهێنــەر بەخێزانــەوە، بــە ژینگــەی کۆمەڵایەتییەکەیەوە، بە پەیوەندییە سۆزدارەکەی بەپێی قۆناغەکانی گەشەکردنی لە منداڵییەوە بۆ هەرزەکاری و گەنجی پێگەیشتنی و تا پیری."[116] هەڵبەتە ئەم زنجیر بەندییە، کاریگەرییەکی زۆری بەژیانی ئەدیبەوە هەیە. "شوێن و فەترەیەکی زەمەنی هەر میللەتێك وەربگرین ئەو فەترە زەمەنیە لە خۆڕا ناڕوات، بەڵکو دەبێت بە مێژوو و شتی لێدروست دەبێت."[117] ئەمە بۆ تاکـە کەسیش هەروایە، ئەو کاتە بەسەرچووانە و ئــەو ئــێش و ئازارانــە، جـارێکی دی دێنــەوە نێــو خەیاڵی شاعیر و خۆیان ڕەنگڕێژ دەکەنەوە. د. محمد رضا شفیعی کدکنی دەربارەی خەیاڵ دەڵێ:

---

[115]) پەیوەندی حەمە سەعید حەسەن، لە هەیڤێکدا بۆ ڕووی تۆ و لە پەیڤێکدا بۆخۆم دەگەڕێم، بڵاوکراوەی ئاراس، ٢٠١٠، ل١٢٠

[116]) وەرگێڕانی پ. ی. د. محەمەد تاتانی، د. ئیبراهیم مەولود خەلیل، ڕەخنەی ئەدەبی نوێ، چاپخانەی کارۆ، ٢٠١٧، ل ٧٨

[117]) [illegible] ، ٢٠٠٦، ص٣

"خەیاڵ گەوهەری سەرەکی و توخمی نەگۆڕی شیعرە، شتێکە کە لە وزەی خەیاڵ کردنەوە بەرهەم دێ."[118]

واقیع هەمیشە خۆی لە قاوغی خەیاڵ لوول دەدات. "بـەڕای کەسـانێکی ڕەخنـەگری وەك سارتەر شیعر هەر ئەو زمانەیە کە خۆی لە بازنەی خۆی دایەو لە ئاکـامی تێکشـکانی زمـانی باودا لەدایك بووە."[119]

تێکشکاندنی ئەو زمانە باوە لە ئەنجامی خەیاڵ فراوانی شاعیرەوە بەرهەم دێت، کە تێکـەڵ و ئاوێتەی کەتواریەتی ژیانی شاعیر دەبێت. لە کارخانەی شیعردا، ئێمە مەکینەیەکی دورمانمان نییە تاوەکو کاڵاو پۆشاکمان بۆبدورێت، شیعر سنعەتێکی دەستی نییە، سنعەتێکی سۆزداری و خەیاڵاوی و ڕۆحییە، بۆیە ڕاستەوخۆ چۆنیەتی ژیانی شاعیر و کارەسـات و نەهامەتییـەکان لـە نێو جیهانی شیعردا ڕەنگدانـەوەی دەبێـت، مردنـی دایکـی لـەتیف هەڵمـەتیش کارەسـاتێکی دڵتەزێن بووە کاریگـەری زۆری بەسـەر شـاعیرەوە هـەبوو و گـەرای ژان و فرمێسـکێکی زۆری لــەناخی شــاعیر حەشــارداوە، ئــەوەتا بەدرێــژایی تەمــەنی هــەر لێــی هەڵــدەهێنجێ. گوزارشتکردنەکانی لەتیف هەڵمەت لە بازنەی "لاوانـەوە و باسـی مـردن و چـۆنیەتی مـردن و زمانی دڵتەنگی و مەینەت."[120] تاڕادەیەکی زۆر ڕەت دەکاتەوە دونیایەك مانای فراوانتری بـە دایك دەبەخشێت. لە هەمانکاتیش "لەبەر ئەوە شاعیران کەسانێکی هەست ناسـکترو عـاتیفی ترن لەچاو کەسانی ئاسایی دا، زیاتر کاریگەردەبن بـەمردنی کەسـێکی خۆشەویسـتیان، بۆیـە

---

[118]) د. محمد رضا شفیعی کدکنی، صور خیال در شیعر فارسی تحقیق انتقای در تطور ایماژ های شعر پارسی وسیر نظریة بلاغت در اسلام وایران، ص ١٨

[119]) دکتر کاوس حسن لی، گونەهای نوأوری در شعر معاصر ایران، ض(١)، انتشارات ثالث، تهران، ١٣٨٣، ص ١٠٤ ـ ١٠٥

[120])عەلائەدین سەجادی، ئەدەبی کوردی و لێکۆڵینەوە لەئەدەبی کوردی، چاپخانەی مەعارف، بەغدا، ١٩٦٨، ل١٥٧

دەبینین بەرامبەر بەم دیاردەیە وەستاون و بەشیعر هەست و سۆزی خۆیان دەربڕیوە و گوزارشتیان لەم کارەساتە کردووە و بۆکەسە ئازیزەکانیان لاواندۆتەوە."[121]، بەلاّم لەتیف هەڵمەت هەر شین و واوەیلای نەکردووە، بەڵکو لایەنی گەشبینی و لە دیوە جوانەکەی ژیانیشدا باسی دایکی کردووە، زۆر جار لەتیف هەڵمەت دەڵێ: من هەست ناکەم دایکم مردووە. کەواتە "ئەرکی دەروونی بۆ ڕەفتاری داهێنەرانە و ئەنجامەکەی، بەتاڵکردنەوەی هەڵچوونی پەنگخواردووە، کە لەئاکامی ململانێدا دروست بووە."[122]، ئەو ململانێ دەروونییە و خۆخواردنەوە و بیرکردنەوەش لە ڕێی خەیاڵەوە دەخرێتە ڕوو و دواتر هاوسەنگییەکی دەروونی دروست دەبێت. "مرۆڤ هەرچەندە لەدەرەوەی خۆیی و خێزانەکەی ماندووبێت کارەسات و ڕووداوێك کاری تێبکات، کە هاتەوە ناو ماڵ و خیزانەکەی هەست بەحەوانەوەی دەروونی دەکات و زووتر خەمەکانی دەرەوەی دەڕەوێنەوە، بەلاّم گەر خەمەکانی پێوەندییان بەخودی خۆیی و خێزان و کەس و کار و ئازیزانەوە هەبێت، ئەوا چ لەناو خێزانی و چ لەدەرەوەی دا هەست بەحەوانەوەی دەروونی ناکات." [123] لەتیف هەڵمەت لە ڕێی شیعریشەوە ئەو هەستەی دەربڕیوە، کە ئەو وای بەدەردەخات کە چ لە واجیبی سەربازی بێ، چ لە ئوتێلێك و بۆ ئەو یەك شتە، چونکە دایکی نییە ئامێزی سۆز و میهرەبانی بۆبکاتەوە. ئەم خەم و مەینەتییانەی شاعیر لە ڕێی قوڵبوونەوە لەبارە دەروونییەکەی شاعیر دەمانگەێنێتە کۆمەڵێ ئامانج "چونکە ڕەخنەی

---

[121]) ئاشنا جەلال رەفیق، لاواندنەوە لە شیعری کوردی کرمانجی خواروودا، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٤، ل ١٧

[122]) ثامر حسن جاسم،، و. حەمەی ئەحمەد مەلا، توێژینەوی سایکۆجی لە داهێنانی شیعردا، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠١٠، ل ٥٤

[123]) د. تانیا ئەسعەد محەمەد، دیاردەی غەم لە شیعری حەسیب قەرەداغیدا، دەزگای چاپ و بلاّوکردنەوی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٢، ل ٨٧ ـ ٨٨

دەروونی یەك لە وەرچەرخانە نوێیــەکانی رەخنــەی ئەدەبییــە، کــە ڕەخنــەگر لەســەر بنچــینەی بنەماکانی دەروونزانی دەقە ئەدەبییەکان لێکدەداتەوە." [124]

[124]) https://jalit.ut.ac.ir/article_٥٠٣٢٣_٤٥٩٤.html فارسی

## بـەشی چـوارەم

# شـیکردنەوەی دەقە شیعرەکانی دایك

# لە کۆبەرهەمی (لەتیف هەڵمەت)دا

*بۆچی هەرچەند خۆر دەبینم*

*خەندەی دایکم دەبارێتە ناو برینم*

*ئەرێ بشێ هی ئەوە بێ*

*دایکم هێندە دڵی پاك بوو*

*بزەی لێوی وەك لقی هەتاو ڕووناك بوو*

*(لەتیف هەڵمەت)*

ڕێبوار سیوەیلی دەنووسێ: " شۆڕشی یەکەمی شاعیری باش، شۆڕشە بە سەر شیعری خۆیدا، کاتێك شیعر دەبێتە بەشێك لە سیستەمێکی تایبەت و قالبێکی جێگر وەردەگرێت. ئەم شۆڕشە هەمیشە تاکەکەسییە و لە شۆڕشی عەشق بەوەدا جیادەکرێتەوە، کە ئەمیان تاکەکەسی و شۆڕشی عەشق پێویستی بە کەسێك یان زیاتر هەیە. هەرکات لەم ڕوانگەیەوە لە پرۆسەی شیعر نووسینمان ڕوانی. خودی شیعر دەگۆڕین بەر لەوەی لە ڕێگەی شیعرەوە مرۆڤەکان و جیهان بگۆڕین." [١٢٥]

بەرلەوەی دەست بکەین بە پۆلینکردن و شیتەڵکاریی دەقە شیعرەکان، لە ڕوانگەی ئەم گوتەیەی سەرەوەی (سیوەیلی) هەوڵدەدەین یەکەمین دەقی شاعیر لەسەر دایك هەڵسەنگێنین و بیکەین بە دەلاقەیەك بۆ چوونە نێو جیهانە فراوانەکەی (دایك و لەتیف هەڵمەت)، تا وردتر وەڵامی ئەم پرسیارانەمان چەنگ کەوێ:

- ئایا تەوزیفکردنی دایك بەم شێوە چڕوپڕ و خەست و خۆڵە، کارێکی هەرمەکی ڕەشکردنەوی کاغەزە، یان ئاکامی بارێکی نائاسایی دەروونی و ڕۆحییە؟
- ئایا شاعیر لە مامەڵەکردنی لەگەڵ دایك، توانیویەتی داهێنان بکات. یان هەر لە بازنەیەکی داخراوی چووکەڵە خەریکی خولانەوە و سوڕانەوە بووە؟
- ئایا شاعیر توانیویەتی دایکی بکاتە کەسێکی یان ڕەمزێکی نەمر بۆ خۆی و بۆ منداڵ و کەسانی دیکە؟

---

[١٢٥]) ڕیبوار سیوەیلی/ فێیس بووك ٣٠/ ٥ / ٢٠١٧

http://www.facebook.com/rebwar.siwayli/posts/١٠٢١٣٠٨٣٥٤٠١١٢٠١٣

○ شاعیر لە یەکەمین دەقە شیعری خۆی بۆ دایکی، چەندە سەرکەوتوو بووە لە دەربڕینی هەست و سۆز و خۆشەویستی خۆی، ئایا بەم دەقە گەیشتۆتە ئاکامی هێورکردنەوەی دەروون و ڕۆح؟

لە یەکەم کۆمەڵە شیعری چاپکراوی لە ساڵی (١٩٧٠) بە ناونیشانی (خوا و شارە بچکۆڵەکەمان)، شاعیر لە ژێر ناونیشانی (سێ هۆنراوە بۆ دایکم) لە دەقەشیعرێکی دا دابەشکراو بەسەر (٣) کۆپلە، خەم و خەون و خەیاڵی خۆی چڕدەکاتەوە و سێ جیهانی سەربەخۆ: (جیهانی شاعیر و دایك و شیعر) لە یەك جیهانی شیعرییدا کۆدەکاتەوە، کە بێئاگایانە، لە ئایندەی شیعری ئەودا، دەبنە نەخشەڕێگا و ڕێکاریی چەندان دەقە شیعری دیکەی دایکئامێز. فەرموون ئەمە دەقە شیعرەکەیە:

***(سێ هۆنراوە بۆ دایکم)***

**١**

***نیگای ئازار وەکو باران***

***سۆسەی ژینمی تەڕ ئەکرد***

***پەپولەی ناو ئاواتی ژان***

***وەك پەلکە زێڕینە ئەمرد***

***لە بروسکەی پشکۆی زاما***

***هاواری دەم ئەتەزی***

***لە لافاوی هەوری ساما***

***ئەژنۆی تەمەن ئەلەرزی***

***لە باوەشی تەنیاییدا***

***ژوورەکانم پشکنی***

***خەم لە تاریکاییدا***

***هەڵی مژیم هەتا بنی***

٢

بەیانی بوو چاوی یادم

بە تەزووی ئاخ کرایەوە

هەستم پێ کرد کە ناشادم

کڵۆی خەمم توایەوە

چەند پیتێکم لێ دروست کرد

لە دڵما بوون بە هەڵبەستێ

گریا وەکو مناڵی ورد

کەس نەبوو زامی بەستێ

هەرچەن خامەم لکان پێوە

دەستم بۆ برد وەك ناسکە سێو

بۆم نەخرایە ناو چوار چێوە

لەرەی نەهاتە سەر لێو

وەکو چۆلەکەیەکی تینوو

لە قوڵایی دڵما ون بوو

ئەی ئەو دایکەی کە لەدڵمای

وا چۆلەکەیەکی تینوو

بە شاباڵی ئارەزوو

گیانی منی بۆ هێنای

٣

باوێشکی شەوی ناو دڵم

خەمێك ئەگرێ وەکو گۆگرد

گرێکی بێ ڕەنگ و هەڵم

*ئەکاتەوە*

*لێی ئەوەرێ پشکۆی ورد ورد*

*کەفی چاوی نوقمی سڵم*

*وەکو دەریایەکی بێ پرد*

*ئاسۆی دوورم ئەخواتەوە*

*بۆ ئەم ژانەی تەمەنم*

*ڕەنگە بگری گۆڕ هەڵکەنم*

*ئەی خۆم چۆن نەگریم دایە*

*بۆ ئەوەی کەس بڕوای نایە*

*بڵێم دایکم نەمردووە*

*هەر زیندووە*

*لە ژینایە*

*لە قوڵایی*

*پڕ لە هەستی*

*خۆشەویستی*

*بێ کۆتایی*

*دڵم دایە.* [126]

لەخوورد کردنەوەی ڕەخنەکاریی و دەروونشیکاریی بۆ دەقەکە، دەگەینە ئەو ئەنجامانە:

دایك، بەمانا فراوانەکەی، ڕایەڵەیەکی بەهێز و تۆکمەی فرە ڕەنگ و ڕەهەند و پەیامە لە دەروون و ڕۆحی شاعیردا، ئەو بۆ خاتری پڕکردنەوەی لاپەڕەکانی کۆمەڵە شیعرەکە، هانای بۆ دایك نەبردووە، بەڵکو هەر لەسەرەتاوە بە پێکهاتەیەکی بنەڕەتی شیعرەکانی خۆی زانیووە.

---

[126] ) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٣٦ ـ ٣٨

لەتیف هەڵمەت دەڵێت:"لە ڕاستیدا ژیان خۆی بەڕەنگاربوونەوەیە، شیعریش ئەگەر کۆمەڵێ شت بێ ئەوە لەپێشدا بەڕەنگاربوونەوەی ژیانە." [127] بەرەنگار بوونەوەش ڕووبەڕووبوونەوەی نەهامەتییەکانە، مەرگ یەکێکە لەو نەهامەتییانە. "مردن یەکێکە لەو پرسیارانەی کە هەردەم مرۆڤ بیری لێکردۆتەوە و تێڕاماوە و هەوڵی داوە کە نهێنییەکان بزانێت." [128] وە مرۆڤ هەوڵیداوە، نەمری بەکەسە خۆشەویستەکان ببەخشێت. "دەکرێ ئازار لەبڕی ئەوەی لاواز و بێ جوڵەمان بکات، بەهێز و چالاکمان بکات." [129] ئەم هاوکێشەیە بۆ لەتیف هەڵمەت ڕاست دێتەوە، ئازار و نەهامەتی و لەدەستدانی دایك هێز و چالاکی و ئیلهامی پێبەخشیوە، کەواتە " ئەدەب پەیوەندییەکی قوڵی بە ژیانەوە هەیە." [130]

بیرۆکە و وێنە هونەرییەکان و زمانی دەقەکە، ئاوێنەی ڕاستگۆیی و عیشقی سۆفیگەریانەی دوور لە ڕییای و تەسەنوع و وتاربێژی دڵ و دەروونی شاعیرە.

دەکرێ ئەم دەقە شیعرە وەك وەسیەتنامەی شاعیر سەیربکرێت کە بۆ ڕۆح و دیدیگەی خۆی نووسیبێ، کە بەنەمریی کردنی دایکی. ئەرکێکی پیرۆز و موقەدەسی سەرشانیەتی و دەبێ هەوڵبدات بۆ هێنانەدی.

لە دەروونشیکاری دەقەکە درك بەوە دەکرێت کە سۆز و ئەڤینی شاعیر بۆ دایکە سووتاوە کۆچکردووەکەی، بە شێوەیەك لە ناخیدا جێگیر و وابەستەیە، کە دەربازبوون و خۆلێدزیینەوەی زەحمەتە و شاعیر هیچ پەرێشان و بێقەرار نییە لەوەی مەرگی دایکی بۆتە تۆقێك لەگەردەنی،

---

[127]) ئا: هەڵۆ بەرزنجی، پرسیارەکان هێشتا تینووی وەرامن، باسەکانی زمان و بیرو فەرهەنگ لە روانگەی (مارف خەزنەدار، لەتیف هەڵمەت و فەرهاد شاکەلی)یەوە، چاپەمەنی چوارچرا، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل ٦٥

[128]) ناسح حوسێن سلێمان، دارمانی مردن لە ئێستێکای رامانە شیعرییەکانی پەشێودا، عەبدوڵڵا پەشێو شاعیرێك لە رەگەزی سەربزێوی، زیاد نادر عالڵایی، چاپخانەی شەهاب، هەولێر، ٢٠١٣، ل ٢٠

[129]) هەرێم عوسمان، نالی ـ شیکاری فەلسەفی دەروونی، چاپخانەی حەمدی، ٢٠١٧، ل ٥٥

[130]) د. ئەحمەد شەریف عەلی، ئەنفال لە رۆمانی کوردیدا، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠١٠، ل ٨٩

تا مردن لەگەڵ خۆیدا دەیگێڕێ. دەقەکە سکێچی ژیاننامەی شاعیر دەکێشێ بەوەی کە فەرهەنگی خەم و زمانی نیگەرانی، وەك دوو پەڵە هەوری ڕەش تا هەتایە بەسەر سەری شیعرەکانی سیبەریان کردووە.

دەقەشیعرەکە هەر (١٩٣) وشەیە، لە فەرهەنگی مانایەکانیدا، (٧٠) وشە دەکرێ بخرێنە نێو هیزەبانەی خەم و پەژارە و سروشت و یاد و ئاواتەوە، وەك لەم پۆلین کردنەدا دیارە:

*(خەم٣، ژان ٢، زام٢، گریا، ئەگرێ، هاوار، ئاخ، ئازار، ناشاد، تەنیایی، بێ ڕەنگ، تەزوو/ دڵ ٦، دایك ٢، دایە، مناڵی، من، تۆ، گیان، خۆشەویستی، باوەش، لێو، چاو/ چۆلەکە ٢، پەلکەزێڕینە، باران، دەریا، ئاسۆ، بەیانی، شاباڵ، لافاو، هەڵم، هەور، سێو/ پشکۆ ٢، بروسکە، گڕ/ زیندووە، نەمردووە، بێ کۆتایی، دوور/ یاد، ئارەزوو، هەست، ئاوات، تەمەن/ ژوورەکان، تاریکایی، گۆڕهەڵکەن، ئەمرد، نوقم، سام/ تەمەن، تینوو ٢/ خەو، باوێشك، نەگریم).*

هەرچەندە شیعرەکە لەنێوان ساڵەکانی (١٩٦٨ و ١٩٧٠) دا نووسراوە، کە سەرەتای ئاشنایەتی شاعیرە بە شیعر و ماوەیەکی کەم دوای کۆچی دایکی، دەبینین چەندان فۆرمی شیعری بە زمانێکی ڕەوان و ساکار، ناوەرۆکی پەیامەکانیان ڕازاندۆتەوە، وەك: *(نیگای ئازار/ پەپولەی ناو ئاواتی ژان/ پەلکە زێڕینە ئەمرد/ بروسکەی پشکۆی زام/ هاواری دەم ئەتەزی/ لافاوی هەوری ساما/ ئەژنۆی تەمەن/ باوەشی تەنیایی/ خەو چاومی پۆشی/ چاوی یادم/ تەزووی ئاخ/ کلۆی خەم/ چۆلەکەی تینوو/ شاباڵی ئارەزوو/ باوێشکی شەوی ناو دڵ / گڕێکی بێ ڕەنگ / کەفی چاو/ ژانی تەمەن ).*

ئەم (٣) کۆپلە شیعرە، (٣) بیروکەی سەربەخۆی تێکئالاو لە خۆ دەگرن، وەك خیوەتێکە کە ئەستوندگەکەی (دایك)ە، بەڵام بە (٣) ڕایەڵە بەستراوەتەوە: (تۆ/ هی خۆم) و (من/ هی خۆت) و(من و تۆ/ هی خۆم و خۆت). لە کۆپلەی یەکەمدا، شاعیر لە ژینگە و کەش و هەوایەکی زۆر دژواردا بەدوای دایکیدا دەگەڕێ، دوای هیلاکی و ماندوو بوون کە چاوەکانی

لێکدەنێ، دەبینی سۆراغ و گەڕانەکەی هەڵە بووە، چونکە ئەو لە ناو دڵی کوڕەکەی خۆیەتی (دڵی شاعیر)، بۆیە دەڵێ:

***کە خەو چاومی پۆشیەوە***

***تۆم لە دڵما دۆزیەوە***

لە کۆپلەی دووەمدا، چونکە شاعیر وا هەست دەکات، بەندکردنی دایکی لە قەفەزی سینەی خۆیدا، تەیمان و دیوار و بەربەستێك لە نێوانیاندا دروست دەکات کە دایکی پێی نیگەران دەبێ، بۆیە گیانی خۆی ڕادەستی چۆلەکەیەك دەکات تا بۆ دایکی بەرێ و بەوە شاعیر سوکنایی دڵی دادەکەوێ کە باوەشی دایکی چۆل نییە، دەڵێ:

***وا چۆلەکەیەکی تینوو***

***بە شاباڵی ئارەزوو***

***گیانی منی بۆ هێنای***

هەرچی بیرۆکەی کۆپلەی سێیەمە، هەردوو بیرۆکەکەی پێشتر ئاوێتەی یەکتری دەکات و دایکەکە وەك نەمرێکی هەمیشەیی و شاعیر وەك کائینێکی زیندوو، یەکتر لەباوەش دەگرن و تاهەتایە لە ئامێزی یەکتردا دەمێننەوە. بۆیە دەڵێ:

***دایکم نەمردووە***

***هەر زیندووە***

***لە ژینایە***

***لە قوڵایی***

***پڕ لە هەستی***

***خۆشەویستی***

***بێ کۆتایی***

***دڵم دایە.***

بڕوانە ئەم هێڵکارییە، کە ئاویتە بوونی ئەو دوو گیانە لە دەقەکەدا نیشان دەدات:




هێکاری (3) نامەکە

دوای (٤٩) ساڵ شیعر نووسین، لە دیقەت دەنێ لەو شیعرانەی، کە لەتیف هەڵمەت بۆ(دایك)ی نووسیوە، دەتوانین بڵێین: کە بیرۆکەکەی ڕێبوار سیوەیلی، دەربارەی (شۆڕشی یەکەمی شاعیر) بە پۆشینی بە شیعرەکانی ئەم شاعیرە ئەم ڕاڤەیە هەڵدەگرێ:

- شیعرەکانی دەقنووس، بووە بە بەشێك لە سیستەمێکی تایبەت و قالبێکی جێگریان وەردەگرتووە لە نوێگەریدا.
- شۆڕشەکەی لەتیف هەڵمەت هەرچەندە تاکەکەسییە ـ کە دەبێ تاکەکەسیبێ، سێبەری عەشقێکی شاراوەی بەسەردا زاڵە، کە عیشقی دایکە.
- ئەو هەوڵی داوە قەلب و قالبی شیعرەکانی بگۆڕێ پێش ئەوەی هەوڵی گۆڕینی ئێمەی دابێ.

ئێستا، پرۆگرامی لێکۆڵینەوەکەمان ئەوە دەخوازێ هەموو دەقەشیعرەکانی دەقنووس کە پەیوەستن بە دایك، بەسەر ئەم (٢٠) تەوەرەی خوارەوەدا پۆلین بکەین و ڕاڤە و شیتەڵکارییان بۆ ئەنجام بدەین:

( ١ )

## دایــکی زینــدوو

کورد دەڵێ:"ئەوەی بوو، مرد." بەو واتایەی کە بوونی هەموو بوونەوەرێك کۆتا ئاکـامی نەمان و فەنابوونە، مرۆڤـ هەر لە کۆنەوە کۆمەڵێ پرسیاری لا گەڵاڵە بووە، مردن چییە؟ بۆچی دەمرین؟ دوای مردن زیندوو بوونەوە هەیە؟ تەنها مرۆڤـ زیندوو دەبێتــەوە یـان بوونــەوەرەکانی تریش؟ بۆچی؟ کەی زیندوو دەبینەوە؟ ئایین لەوبارەیەوە دەڵێ چی؟ ئەفسـانە دەڵـێ چـی؟ ئایـە ژیان لەپێناوی مردنە؟ بۆچی فیرعەونەکان زۆرتر ژیاون؟ مردن دیوەکەی تری ژیانە...؟ لەهەمان کاتیشدا لەوەتەی مرۆڤـ هەیە لە بیر و خەیاڵی ئەوەدایە چۆن ڕووبەڕووی ئەو مردن و فانابوونـە ببێتەوە، لە ئەفسانە و داستانە کۆنەکانـدا سەیروسـەمەرەی عــەجایب و نـاوازە دەبیــنین، کـە هانایان بۆ بردوون، بەو ئومێدەی بتوانن ڕێگری لەمردن بکەن، یان نــەمریی بـە مردووەکانیــان ببەخشن. ئاوی حەیات و ئاوی کەوسەر و خدری زینــدە و سـیحر و تەلیسـمی سەرنجڕاکێشـیان داهێناوە و لە ئەزموونەکانیان فێربوون، کە مردن دیاردەیەکی بــەدەر لــە ئـیرادە و قــودرەت و تەفکیری ئەواندایە و هیچ دەرفەتێك لەبەر دەمیاندا بــۆ خۆلێــدەربازکردن نەماوەتــەوە. لێــرەدا مرۆڤـ تەسلیمی مردن دەبێت، بەڵام وەسوەسەی نەمریی لە کەڵکەڵەیدا دانەمرکاوەتەوە و هــەر لە هەوڵی داهێنانی (شتێك)دابووە هەر نەبێ زیندوویی بە (ناو)ی مردووەکە ببەخشێ. جـارێ، کەوتووتە هەڵکۆڵین و داتاشینی شاخ و داخ و دار وبەرد، جارێ، خەریکی بونیاتنان و هەڵێنانی گومەز و کۆشك و سەراو قەیسەری و تاق و قەڵای مەزن مەزن بووە، خـۆ راسـتە هەرەمــەکانی میسر، وەك گۆڕ بۆ چەند مەلیکێکی فیرعەونەکانی میسری کۆن دروستکراون، بـەڵام شـێوازی بونیاتنانیان، ئەوە ناشارنەوە کە بیرۆکەی بە نەمری کردنی ئەو مەلیکە مردووانەیان هــەر لــە کەللەدا بووە. خۆ پێش ئەوانیش، (نەمرود) ـ وەك لەناوەکەی دیارە و لە تــەورات و قورئانــدا

ئاماژەی پێدراوە، کە داوای خوایەتی کردووە، هیچ نەما نەیکات بەو ئومێدەی خۆی لـە مـردن دەرباز بکات.[131] بەناوباگترین داستانیش، پەیوەست بە نەمریی، داستانی گلگامێشی سۆمەرییە کە بۆ (٢٥٠٠) ساڵ پێش زایین دەگەڕێتەوە.

کاتێك مرۆڤ دەرکی بەوەکرد، کە شاکاری ئەدەبی، بە هەردوو شێوەی زارەکی و نووسراو، دەتوانێ مێژوو لەگەڵ خۆیدا هەڵگرێ، زۆر لە کەڵە نووسەر و ئەدیبان، ئەدەبیان کردە ئـامرازی بـە نـەمریی کـردن و تـا ئـەم سـاتە وەختـەش لـە لاسـاییکردنەوەکە بـەردەوامن. ڕەنگـبێ، (Publius Ovidius Naso)، کە لە ئەدەبی ئینگلیزیدا بە (Ovid) ناسراوە و لە سـاڵی (٤٣) پێش زایین لەدایك بووە، یەکەمین شاعیر ڕۆمانی کۆن بێ، هەوڵی دابێ بە سـایەی دەقـە شیعرێکیدا نەمریی بە خۆشەویستەکەی ببەخشێ.

ئەوەتا، چەندان سەدە دواتر، (وەلیـەم شێکسـپیر)ی شـاعیر و شانۆنووسـی ئینگلیـز، لـە سۆنێتی ژمارە(١٨)، بەم شێوەیە باسی دڵدارەکەی دەکات و نەمریی پێدەبەخشێ و دەڵێ:

***ئایا دەکرێ تۆ بشوبهێنم بە ڕۆژێکی بەهاری؟***
***تۆ کە جوانتر و ناسکتر و سازگارتری لەو ڕۆژە***
***هێندەی پێناچێ بایە توونەوتیژەکان***
***شکۆفە پشکووتووەکانی مانگی گوڵان دەشمزێنن***
***ماوەی بەهار فرەکورتە و زوو دێت و تیژ تێدەپەڕێ***
***کاتی وایە، چاوی ئاسمان زۆر گەش دەدرەوشێتەوە و***
***زۆربەی جاریش ڕەنگ و ڕوخساری زێڕینی ڕەش و تاریك دادەگەڕێ***

---

[131]) موسي خورين، روبرت تومسون، سلالة ارمينيا الكبرى، تاريخ الارمن، دار نشر جامعة هارفرد، ١٩٧٨، ص. ٨٨

*ئەوەی جوانە هەندێ جاران لە جوانی کورتی دەهێنێ*

*جا یان لەبەر هەڵکەوت و ڕێکەوتی جیهان*

*یان گۆڕان و لە ڕێگالادانی سروشت*

*تەڕوبڕ و پڕوپڕاوی نامینێ*

*بەڵام بەهارستانی هەرمانی ئەتۆ*

*هەرگیز ناژاکێ و سیس نابێ*

*ئەو جوانییەی کەتۆ بۆیتە خاوەنی قەد نامرێ و لەکیس ناچێ*

*مەرگیش لەوەی بکەوێتە ژێر نسێی باڵەکانی*

*شانازی ناکات و شایی بە خۆ نایە*

*چونکی تۆ لە دێڕە هەرەمانەکانی هۆنراوەی مندا*

*دەبیتە پاژێك لە زەمەن، کەرتێك لە کات*

*کەواتە تا ئەو چرکەساتەی مرۆ هەناسە دەدات و*

*تا ئەو کاتەی چاو دەبینی و*

*تا ئەو دەمەی ئەو هونراوەیەم زیندووە*

*ئەم شیعرانەم ژیان بە تۆ دەبەخشن و*

*لە سۆنگەیان، هەتا هەتا بوونی تۆ، دەست دەدەن.*[١٣٢]

لەتیف هەڵمەتی دایك کۆچکردوو، هەر لە لاپەڕەکانی پێشەوەی یەکەم بەرهەمی شیعریی چاپکراویدا، تا دواین هونراوەی بەردەست، چرکەیەك بەنەمری کردنی ئەو دایکەی لەبیر نەچۆتەوە و چەندان دەقە شیعری بۆ نووسیوە، هەر بەو ئۆمێدەی جۆرە زیندووییەك بە ڕۆحی ئەو ببەخشێت.

[١٣٢])چلچرای غەزەلە عاشقانەکانی شێکسپیر، شیعری جیهان، شێکسپیر، وەلیام، وەرگێڕ لە ئینگلیزییەوە عەبدولخالق یەعقوبی، چاپەمەنی مانگ، تاران، ٢٠١٤، ل ١٨ ـ ١٩

بۆ شیتەڵکاری ئەم تەوەرە، (٥) لە دەقەشیعرەکانی شاعیرمان بۆ هەڵبژاردوون، کە تایبەتن بە بیرۆکەی (The Theme) دایکی نەمر یان زیندوو.

دەقنووس لە دیدەندییەکدا دەڵێ: " خۆشەویستی من بۆ دایکم جیاواز بوو، قەت قەناعەتم نەدەکرد مردووە، شیعرم بۆ دەنووسی وەك ئەوە وابێ بۆ کەسێکی زیندووم دەنووسی، ئێستاش ڕەنگە زۆرجار باوەڕ نەکەم کە مردووە، هەر بەکەسێکی زیندوو بێتە پێش چاوم، وە لەڕاستیشدا لای من هەرگیز نەمردووە، شتە جوانەکان هەرگیز نامرن، هیچ شتێکی جوان نامرێ، لای من دایکم ئەو شتەیە نامرێت."[١٣٣]

بە لێکدانەوەی دەروونناسی، قەناعەت نەکردنی هێندێ کەس بە لەدەستدانی خۆشەویستێك، دیاردەیەکی دەروونییە، دایکێك هەبووە بۆ ماوەی (٢٠) ساڵ چاوەڕوانی گەڕانەوەی کوڕە جوانەمەرگەکەی کردووە، ئەگەرچی بە بەردەوامیش سەردانی گۆڕەکەی دەکات. لە نێو ئەو جیهانەی کە لەناخی مرۆڤەکاندا جێگرە: لە جیهانی بە ئاگایی هۆش و جیهانی بێئاگاییدا. زۆر جار وەك زیندەخەو، جیهانە بێئاگاییەکە باڵدەکێشێ بەسەر جیهانی بەئاگاو کەسەکە دەکەوێتە حاڵەتێکی دەروونی نائاسایی، کە واقیع قبوڵ ناکات، چونکە ئەو لە دەرەوەی ئەو جیهانی بەئاگاییدا شتەکان دەبینێ و دەبیستێ. ئەم دیاردەیە پێیدەگوترێت سایکۆلۆژیای بوونایەتی (Existential psychotherapy) کە دەروونناسی ئەمەریکایی تەمەن (٨٥) ساڵ، ئیریڤن د. یالوم (Irvin D. Yalom)، بەم شێوەیە ڕاڤەی دەکات: "دیاردەیەکە لەو کەسانەی کە لەئاکامی بگرەوبەردەیەکی ئاڵۆزی دەروونییەوە هەست بە بوونی کەسێك یان شتێك دەکەن، کە لەو چرکەساتەدا لەبەردەستدا بوونی نییە، بۆ نموونە کەسێکی زیندانی، ئەگەرچی لە نێو زیندان دایە، وا هەست دەکات کەسێکی ئازادە و گرتووخانەکەی بە زیندان نایەتە پێش چاو، ئەم دیاردەیە لەتێکەڵەیەکی (٤) ڕەگەزی دروست دەبێ یان دێتەکایەوە، کە سەرچاوە لە وزە و دەسەڵاتی ئەم (٤) بنەمایە وەردەگرێت: بنەمای جەستە و

[١٣٣]) دیدەنی هاوژین سڵێوە لەگەڵ لەتیف هەڵمەت، سلێمانی، دووشەممە، ١٩ / ٣ / ٢٠١٢

کۆمەڵ و کەسێتی و ڕۆح، کە لە ئان و ساتێکی تایبەتدا، بەهۆی ڕووداوێکی پێشتر، واهەست دەکەن، بەبێ بوونی ئەو کەسە یان ئەو شتە لەدەستچووە، ژیان هیچ مانایەکی نییە." [١٣٤]

کەسەکان بە شێوەی جیاواز، زیندوویی کەسی خۆشەویستی لەدەستچوویان، لەبەرچاوە، بڕوانن لە لای خاتوو کاترین مانسفیلد(Catherine Mansfield ١٨٨٨ – ١٩٢٣)، ئەو بێدەنگییەی دایکی کۆچکردووی لەماڵەکەیدا، لەدوای خۆی بەجێیهێشتووە، بۆتە زیندووکەرەوەی هەمیشەیی دایکی لەبەرچاوی ئەودا، ئەو دەڵێ: " کۆچی دایکم تا بڵێت کارەساتێکی جەرگبڕبوو بۆ من. تێمبگەن! مەبەستم ئەو بێدەنگییەیە کە لەدوای خۆیدا بەجێیهێشت، کە هەمیشە و هەمیشە زیندووە و بێدەنگییەك سەدا و دەنگدانەوەکەی کۆتایی نییە." [١٣٥]

جا یەکێك لەو فاکتەرانەی بیرۆکەی زیندوویەتی ئەو دایکەی لە هزر و هۆشی لەتیف هەڵمەتدا چەسپاندووە، خۆشەویستییەکەی دایکییەتی، وەك چۆن (بێدەنگی)یەکە، لە لای (کاترین مانسفیلد) بۆتە وەبیرهێنەرەوەی ئەو دایکە.

لە خووردکردنەوەی دەقە شیعرەکاندا، دەبینین دەقنووس وەستاکاری و هونەرکاری نواندوە لە خولقاندنی بیرۆکەی (نەمریی دایك) بە شێواز و گوزارشتی جیاواز. بڕوانن لەم دەقەی خوارەوەدا، بە ستایلێکی زۆر سادە و ساکاری داڕشتن ئاسا و ڕاستەوخۆ، بیرۆکەکەی

---

[134] Yalom. Irvin D. Yalom) *Existential psychotherapy*. New York: Basic Books، (1980). p. 9 . (کتێب)

[١٣٥]) https://www.katherinemansfield.com/about-katherine-mansfield/index.cfm

سۆنێتی(١٨) وەلیەم شێکسپیر دووبارە دەکاتەوە، بەڵام لەتیف هەڵمەت بە تەوزیفکردنی دەستەواژەی (لەنجەی وشەی منداڵەکان/ هۆنراوەی جوان) ڕەنگ و بۆنێکی تایبەت بە شیعرەکە و بیرۆکەکە دەدات، کە دەیەوێ بڵێ: بەقەد ژمارەی لەنجە و لاری هەموو ئەو وشانەی منداڵانی دونیا دەیڵێنەوە، بە قەد ئەو دەقە شیعرە جوانانەی کە نووسراون و دەنووسرێن، ناوی تۆ دەمێنێتەوە، بێگومان، ژمارەکە کراوەیەوە دەتوانی سەدان سفری بۆ دانێین، ئەوە جگەلەو نزیك کردنە و تێکەڵکردنی جیهانی خۆشەویستی دایکی بە جیهانی پاك و بێگەردی پڕ بەرائەتی منداڵ و جیهانی شیعری جوان، ئەو دەڵێ:

***هەتا هەتایە دایە گیان ناوت***
***ئەمێنێتەوە و ئەمێنێتەوە***
***لە لەنجەی وشەی مناڵەکاندا***
***لە هەزار... هەزار هۆنراوەی جواندا***[١٣٦]

لە سێیەمین نامەیدا لە دەقی (سێ نامە بۆ دایکم)، دەقنووس ئەو کەسانە دەئاخێوێ کە ڕەنگ بێ باوەڕیان بە نەمردنی خاتوو (سەعدییە)ی دایکی ئەو نەبێ، جا شاعیر هێندە جنگڕانە بیرۆکەکە دەکوتێتەوە، کە پەیامگر وا هەست دەکات، ئەو تەواو نیگەرانە لەو بۆچوونەی خەڵکەکە، یان وەك بڵێت، ئەوان گومانیان لە (تەندروستی ئەقڵ و هۆشی) شاعیر کردبێ. بۆیە بەوە ناوەستێ پێیان بڵێ: دایکم نەمردووە، بەڵکو ڕیزبەندێك لە وشە بۆ سەلماندنی بیرۆکەکەی تۆماردەکات، وەك *(هەر زیندووە/ لەژینایە/ بێ کۆتاییە/ لە... دڵم دایە)*، لەڕووی دەروونییەوە، ئەمانە هەمووی هاوار و موناجات و مرازی شاعیرن. ئەو دەڵێ:

***بۆ ئەوەی کەس بڕوای نایە***
***بڵێم دایکم نەمردووە***
***هەر زیندووە***

---

[١٣٦] ) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٣٤٩

*لە ژینایە*

*لە قوڵایی*

*پڕ لە هەستی*

*خۆشەویستی*

*بێ کۆتایی*

*دڵم دایە.*[137]

لە دەقێکی دیکەدا، شاعیر بەبێ ئەوەی هانا بۆ وشەی (زیندوو) یان وشەی (نەمردوو) ببات، زیندوویی دایکیمان وەبیر دێنێتەوە و بەوەش دڵی خۆی دەداتەوە، کە دایکی تەنیا نەختێك لێی دوورکەوتۆتەوە، ئەم بیرۆکەیە (مردنی ئەو) ڕەفزدەکاتەوە، چونکە دووری مانای مردن نییە، ئەوجا شاعیر دەیەوێ پردێك، هێڵێك، دەرگایەك بدۆزێتەوە، بۆئەوەی بیگەێنێتە دایکی، یان هەر نەبێ لێی نزیك بکاتەوە و ڕۆژانە هەواڵی بزانێ. شاعیر دەیەوێ زامەکانی بکاتە ئەو ئامرازە و لە دەقی (هاتووچۆ)دا دەڵێ:

**باکان: تك تك**

**تۆوی زامیان تیا چێنراوە**

**بست بە بستی ئەم زەوییە**

**گۆڕ و داوە**

**بۆ شاعیرێك ئەوینی تۆ**

**دڵی کردووە بە هێلانەی**

**پۆلە کوکوختی هۆنراوە**

**دە ئەی زامە قووڵەکەم تۆ**

**لە نێوانی من و دایکە دوورەکەمدا**

---

[137] ) دیوانی لەتیف هەڵمەت ل ٣٦ ـ ٣٨

**بۆ نابیتە دەرگایەك بۆ**

**خۆشەویستیو**

**خەوبینین و**

**هاتووچۆ؟** [138]

(٣) وشە لەم دەقەدا، دیوی ناوەوەی دەروون و لێکدانەوەی شاعیرمان بۆ دەست نیشان دەکەنن، وشەکان: (زام/خۆشەویستی/خەوبینین)، کە بە سەدان جار لە کۆبەرهەمەکەیدا دووبارە بوونەتەوە، زۆر جارانیش ئەم وشانە دەکاتە کۆڵەکەی ئەو ماڵەی لەگەڵ دایکیدا سەردەمی منداڵی و هەرزەکاری تێدا بەسەر بردووە. بە کوردی و کرمانجی، دەقنووس ئەم وشانەی بۆ جوانکاری و ئارایشتکردن نمایش نەکردووە، بەڵکو کەرەستەی خاوی هزر و خەیاڵی شیعریی ئەون.

ئەگەر بەنەمریی کردنی کەسەکان، لەلای هێندێکان بۆ دڵئارامی و دڵنەوایی و ئارامیی ڕۆح بێ، ئەوە لەتیف هەڵمەت، ئەو تخوبانە دەبەزێنێ، دەیەوێ خۆشەویستی و عیشقی سۆفیگەرانەی خۆی بۆ دایکی بکاتە ئامرازێك بیسووتێنێ، بیخنکێنێ، بیکوژێت، گرنگ ئەوەیە دەستی ئیزراعیل و ئەغیار ڕۆحی ئەو نەکێشن، چونکە لەو مردنە خۆشتر نییە، کە عیشق دایدەهێنێ و خۆشەویستی وەك خەڵات و دیاری پێشکێشی دەکا. شاعیر دەیەوێ زامەکەی بکاتە دەرگایەك بۆخۆشەویستی و خەوبینین. بەومانایەی شێك زۆر بیری لێبکەیتەوە، یاخوت ئازار و ژانی زۆربێت و مرۆڤی زامدار کردبێ و لەگەڵی بژییێت، ئەوا ئەم شتە دەبێتە دەروازەیەك بۆبیرکردنەوە و خەوبینین، شاعیر دەیەوێ لەو دەرگای زامەوە، لە بەئاگایدا هەر دایکی خۆش بووێ، بەدەلیلی ئەوەی نووسیویە ئەم دەرگایە ببێت بە دەرگای خۆشەویستی، لەهەمان کاتیش لەکاتی بێئاگایی و نووستنیش دا، ئەوا خەون ببینێت و سیمای دایکی ببینێ. چونکە دەرگاکە بۆکاتی بەئاگایی و بێئاگاییە. ئەو لە دەقێکی دیکەدا کە بەناوی (بۆ دایکم)ە دەڵێ:

---

[138] ) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٤٣٥

***ئەی دایە گیان***

***وەك خەنجەرێکی بێ کالان***

***لە دڵمدا هەڵت دەگرم***

***چی خۆشترە:***

***لەوەی بە عەشقی تۆ بمرم...![139]***

شاعیر دڵی خۆی دەکاتە کالانی خەنجەرێك، دەزانین کالان تا مشتووی خەنجەر ختم دەبێت، کەواتە کاتێ کە شاعیر دڵی خۆی دەکاتە کالانی خەنجەرێك، ئەوا خەنجەرەکە بەتەواوەتی لەنێو دڵی دەچەقێت، ئامادەشە لەپێناو دایکی، لە پێناو ئەو خۆشەویستییە گەورەیە بمرێت، دایك بە خەنجەرێك شوبهێندراوە، دڵ، کالان. بەو مانایەی ئازارەکانی بێ دایکی وەك ئەو خەنجەرەیە کە لە دڵی شاعیر چەقیوە. حەزیش دەکات بەو عیشقەوە بمرێت.

لەم دەقەی خوارەوە، کە شاکارێکە لە هونەر و داڕشتن، شاعیر بە زمانێکی دیکە، (زیندوویی) دایکیمان پێدەسەلمێنێ، دایکێك کە لە کوڕەکەی دوور کەوتۆتەوە، بەڵام هەرگیز یەکتریان لەبیر نەکردوو. شاعیر لە ڕێی کۆترێکەوە دوو نامە، کە لەسەر ڕەشێنەی چاوەکانی نووسیویەتی، دەنێرێت یەکیان بۆ دایکی و ئەوی دیکەیان بۆ منداڵێك کە نایناسێ و هێشتا لەدایك نەبووە. ئەو دەڵێ:

***هەموو شەوێ شیعر دەبێ***

***بە کۆترێ سپی سپی***

***ختوکەی پێڵوم دەدات و دەڵێ: دەڕۆم***

***- بۆ کوێ دەڕۆی هاوڕێکەی خۆم***

***ئەی باڵداری دەم پڕ لە چەمی جریوە***

***- بۆ ئەو شارەی کە یەکەم جار***

---

[139]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٤٣٦

*تیایدا وشەت کەوتە سەر زار*

*نامەت نییە؟ بۆکەس بۆ یار؟*

*- با دوو نامەم لە گلارەی*

*هەردوو چاومدا نوسیووە*

*یەکێکیان بۆ گیانی سەوزی دایکم بەرە*

*ئەوی تریان بۆ منداڵێك*

*ناناسمو هێشتا خۆری نەبینیوە...!* [140]

لەم دەقەدا، ئەم هونەرکارییانەی شاعیر دەخوێنینەوە: شەو نییە شاعیر بیر لە دایکی نەکاتەوە، ئەو نامەبەری شیاوەی ئەوەیە ببێتە تەتەر و بچێتە خزمەت دایکی، کۆترێکی سپی سپییە. ئەمەش نیشانەی پیرۆزیی و بەرائەتی هەردووکیانە (کۆتر و دایك). نووسینی نامە لەسەر گلارەی چاو، جوانترین و بەنرخترین و پرسۆزترین نامەیە کە شاعیر تاکو ئێستا دایهێنابێت. چونکە هاوێنەی چاوی مرۆڤ وێنە و حەرف و شتەکانی وەك تابلۆ تیا دەبینرێت. ئەوەی شاعیر دەینێرێ، نامە نییە، بەڵکو چاوەکانی خۆیەتی، خۆ ئەگەر گلارەی چاوی خۆی دامالێ و بیپێچێتەوە و بیکاتە نامە، ئەوە کوێرایی و نابینایی بۆ شاعیر بەجێ دەهێڵێ، کە لەلای ئەو ئاساییە مادام نامەکان بۆ دایك و منداڵن. دەستەواژەی (گیانی سەوز) لە ڕستەی (بۆ گیانی سەوزی دایکم بەرێ)، خەرمانەیەکی تەقدیسکردن و نەمری و بەخشندەیی بە دەوری سەری دایکیدا دروست دەکات. ڕەنگی سەوز. هێمای ئایینی ئیسلام و ڕەمزیی نەمریی و بەخشندەییە، بۆیە بەهار و گەڵای گیا وداروودرەخت کەسکن. پێناسەکردنی منداڵەکان بە نەناسیاو و خۆر نەدیوو، ئیحای ئەوەمان دەداتێ کە چاوی شاعیر لە ئایندەشدا هەمیشە گەش و ڕۆشنە، چونکە ئەوان ئەو نامە (کە چاوی شاعیرە) لەلای خۆیان هەڵدەگرن و دەپارێزن. دەقەکە دایەلۆگێکی زۆر پاراو وخۆشئاواز و پڕە لە یاد و حەنینە بۆ زێدو شارەکەی.هەروەها لە گوتەی: (***ئەوی تریان بۆ منداڵێك ناناسمو هێشتا خۆری نەبینیوە.***) ئەشێ ئاماژەبێ بۆ ئەو

[140] ) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٣٩٦

چەند مندالەی خۆی، کە بەهۆی نەخۆشییەکەوە خێزانەکەی، چەند جار منالی لەبار چووەو خۆریان نەبینیوەو مردوون، تاکو ئێستاش هیچ منالێکیان نییە. شاعیر دەڵێ: " خێزانەکەم شەش جار هاتووتە ئەوەی منالی ببێ، هەر شەش جارەکە منالەکەمان مردووە و هیچ دکتۆرێك نەیتوانیووە چارەسەری بکات"[١٤١]

پووختەی تەوەرە:

بیرۆکەی بەنەمریکردن لە ڕێی ئەدەبەوە، بەتایبەتی شیعر، زۆر کۆنە، شاعیر لە (٣) وێستگەی جیاوازدا، گومبەزی نەمری لە سەر گۆڕەکەی دایکیدا بونیاتناوە: لەسەرەتادا ڕاستەوخۆ بە وشەی سادە باسی زیندوویی ئەو دەکات، لە وێستگەی دووەمیدا، بەبێ ئەوەی هانا بۆ وشەی (زیندوو و نەمردوو) ببات، دایکی لە جیهانی کۆتر و کوکوختی و باڵندە و منالٌ دەبینێ و هەمیشە لەسۆراغ و گەڕاندایە بەدوای ئەودا، هەرچی وێستگەی سێیەمە، کە لەم بارەیەوە، شاعیر عیشقی نەمری سۆفیگەریانەی خۆی دەکاتە مرازێك بۆ مردنی خۆی و گەیشتن بە باوەشی دایکە زیندووەکەی. لە پێناو دایکی ئامادەیە ئەندامە زۆر بەنرخەکانی پارپارە بن و لەناویش بچێت، وەك چەقاندنی خەنجەر لەنێو دڵی و نووسینی نامە لەسەر گلارەی چاوی. لە هەموو وێستگەکاندا، زمانی شیعری دەقەکان سادە و ڕەوانن. خالی بوونی دەقەکان لە ئەفسانە و داستان و خەونی فانتازییایی بۆ ئەوەدەگەڕێتەوە کە خودی دایك پڕە لەو شتانە، مانگەشەو عەوجە بە ئەنگوست ناکات. لەجوانترین (٢) وێنەی هونەری دەقەکاندا، لە یەکێکیان شاعیر دڵی خۆی دەکاتە کالان بۆ خەنجەری خۆشەویستی و حەزیش دەکات هەر بەو خەنجەرە بکوژرێت، هەرچی وێنەی دووەمە، نووسینی نامەیە لەسەر گلێنەی چاو و نامەبەریش کۆترێکی سپی سپییە. دەکرێ، جیهانی(نەمریی دایك) لەم (٥) دەقەشیعرەدا، بەم شێوەیە بخەینە ڕوو:

---

[١٤١] - دیدەنی هاوژین سلێوە لەگەڵ لەتیف هەڵمەت، ١٩/ ٣ / ٢٠١٢


جیهانی شاعیر
شەو، هاوڕێ، نامە، هۆنراوە،
باڵدار، دڵ، با، زام،
خەوبینین، دووری، هێلانە،
وشە، منداڵ، گۆڕ، داو، یار
جیهانی هاوبەشی (شاعیر ودایک)
ناو، گیان، هەست، ، مانەوە،
منداڵ، جوانی، کۆتر،
کوکوختی، شار، خەنجەر،
عێشقی تۆ، نەوینی تۆ،
خۆشەویستی، نەمریی، زیندوو

( ٢ )

## دایك لە بیرەوەریی سـەردەمی منداڵیدا

(ئۆتاڤیۆ پاز Ottavio Paz) ـ نووسەر ـ وەرگری خەڵاتی نۆبل لە ئەدەب (١٩٩٠)، بـەم شێوەیە پێناسەی شیعر دەكات و دەڵـێ:" شـیعر بیرەوەرییـە دەبێتـە وێنـە و وێنـەش دەبێتـە دەنگ." [١٤٢] جا لەهەموو قۆناغ و وێستگەكانی تەمەنیشدا، سەردەمی منداڵی، بـە خۆشـی و ترشییەكانیانەوە، دەوڵەمەندترین گەنجینەی بـیرەوەری و یادەوەرییەكانـە. لـە ڕوومـاڵ كردنـی سەردەمی منداڵی لەتیف هەڵمەت و خوێندنـەوەی كۆبەرهەمـە شـیعرییەكەی، دەگەینـە ئـەو ئاكامە كە هێز و وزە و دەسەڵاتی بیرەوەرییەكانی ئەو قۆناغەی تەمەنی ئەو هێندە كاریگـەر و باڵادەست و چالاكن، كە تەواوی ژیانی ئەدەبی ئەویان خستۆتە ژێر ركێفی خۆیانەوە، وەك بڵێین، شاعیر بەلەمێكی بچكۆڵەیە و بیرەوەریی سەردەمی منداڵیشی دەریایەكی فراوانە، شەپۆڵەكانی بە ئارەزووی خۆیان یاری پێدەكەن و دەیهێنن و دەیبەن.

هەرچەندە لەتیف هەڵمەت سەردەمی منـداڵی خـۆی بەخۆشـترین وێسـتگەی تەمـەنی خـۆی دەزانێ، دەبینین ڕەنگدانەوەی ئـەو سـەردەمە لـە شـیعرەكانیدا زۆر جـار بـە پێچـەوانەی ئـەو واقیعەیە، هەرچی نیگەرانی و پەرۆشی و زەبوونی هەیـە ئـەو لـەوێوە هـەڵیهێنجاون. بۆخـۆی

[١٤٢] )Kissing the Dark، Mark Patrick Hederman، Criterion Press:td.، Dublin، Ireland، ١٩٩٩، P. ٩٨ (كتێب)

دەڵێ: " بە منداڵی کاتی خۆشم لەناو ماڵ و خێزانێکی ئایینپەروەر بەسەر بردووە... تا (٤/ ٤/ ١٩٦٧ ) قۆناغێکی ناخۆش دەستی پێکرد، هەست کردن بەبێ دایکی زۆر پرسیار و ئیستفساری نوێی لەلا دروست کردم، ئەتوانم بڵێم زیاتر هانی دام بۆ ئەوەی هاوڕێیەك بدۆزمەوە بۆ خۆم لەبری دایکم، ئەویش شیعر بوو."[١٤٣]

لە بەشی دووەمی بەندی یەکەمدا، لەبڕگەکانی پەیوەندی نێوان دایك وکوڕ، بە وردی ئاماژەمان بەو هۆکار و ژینگە و کارەکتەرانە کرد کە لە کێشانی وێنەکانی ناخی منداڵ ڕۆڵی سەرەکییان هەیە و ئەوەشمان شیکردەوە بۆ خۆشەویستی نێوان دایك و منداڵ لە پەیوەندی نێوان باوك منداڵ بەهێزترە، (دێبرا ئومبرسن Debra Umberson) گۆڕینی شێوەی دایك لە ڕوخساری بنیادەمێکی ئاسایی بۆ سومبڵ و ڕەمز بەم شێوەیە شیدەکاتەوە و دەڵێ: "وێنەی دایك لە مێشکی هەرزەکاردا، ڕەگ و ڕیشەی بۆ سەردەمی منداڵی دەگەڕێتەوە، دواتر بە شێوازی جیاواز جیاواز ئەو سومبڵە، لە دەربڕیندا شێوەی خۆی دەگۆڕێت، بەڵام دایك هەر وەك خۆی دەمێنێتەوە. ڕەمزەکانیش بێ ژمارەن."[١٤٤] لێرەدا (٢) خاڵی بایەخدار هەیە کە نەخشە ڕێگای بیرکردنەوەی شاعیرمان نیشاندەدەن:

**یەك:** هەموومان دایکمان خۆش دەوێ، بەڵام هەموومان ناتوانین ڕۆحی دایك بەبەرخۆماندا بکەین، هونەرمەند و ئەدیبەکان ئەو توانستەیان تێدایە .((پێویستە بە ڕۆح بڵێین (بەڵێ) تەنانەت گەر نەشزانین چییە ـ هەروەك نازانین، بەڵام لەناو ڕۆحماندا ڕۆحێکی دیکە هەیە کە باش دەماننناسێ، جا هەر وەختێك باوەشمان بۆ ئەو ڕۆحە کردەوە، ئەوا (ئەو) تاڤگەیە دەڕژێتە ناخمانەوە." [١٤٥]

---

[١٤٣]) دیدەنی هاوژین سلێوە لەگەڵ لەتیف هەڵمەت، ١٩ / ٣ / ٢٠١٢

[١٤٤] ) Death of Parent، ISBN-١٣: ٩٧٨-٠٥٢١٠١٢٩٦٦

[١٤٥])Ulanov Barr، Mysticism and Negative Presence، Vol ٥، Colombia University، 1973، P. 411

هونەرمەند و ئەدیبەکان ئامرازی خواکردەی خۆیان هەیە بۆ گەیشتن بەو ڕۆحە. جا لێرەدا بۆ لەتیف هەڵمەت، ئەو ڕۆحە، ڕۆحی دایکیەتی.

**دوو:** " هونەرمەند کەسێکە پارسەنگی دەروونی لار و لاسەنگە، وەك کەسێك وایە بەسەر پردێکی یەکجار باریك و بەرزدا بپەڕێتەوە، هەمیشە مەترسی هەڵخلیسکان و ڕەتبردنی هەیە، لێ ئەوەی کە ناهێڵێ قەت بکەوێتە خوارەوە، هونەرەکەیەتی."[146]

جا ئەوەی لێرەشدا، بۆ لەتیف هەڵمەتی دەروون لار و لاسەنگ، دەگوترێت ئەوەیە، ئەوەی، نەك نەیهێشتوە لەسەر ئەو پردە ترسناکە بکەوێتە خوارەوە، بەڵکو وای کردوە سەرکەوتووانەش بەسەریدا بپەڕێتەوە، شیعرەکانیەتی، کە تا سەر ئێسقان لەودا قەرزاری دایکییەتی.

وەك ئاماژەمان پێدا، سێبەری دایك لە سەردەمی منداڵیدا، هێندە بە پڕوچڕی و خەست و خۆڵییەوە بوونی هەیە، وەك بڵێی (ئەو دایکە و کۆچی ئەو دایکە) لە ناخی ئەودا بۆتە نەخۆشییەکی دەروونی. هەرواشە! (مارك پاتریك هێدرمان Mark Patrick Hederman) بەم شێوەیە ئەم خاڵەمان بۆ شیدەکاتەوەو دەڵێ: " هونەر نمایشکردن و نیشاندانی نیشانەیەکی نەخۆشی دەروونی هونەرمەندە، کە هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ نیشانەکانی نەخۆشییەکانی جەستەیی، تاکە جیاوازیی ئەوەیە ئەو نەخۆشییە لە جیهانی کەلتووری بێئاگایدا جێگیرە، بۆیە دەبێ ئێمە لەو نیشانانە تێبگەین و لێیان فێربین، چونکە گوزارشتەکانی هونەرمەندان

---

[146]) Kissing the Dark، Mark Patrick Hederma، Criterion Press:td.، Dublin، Ireland، 1999، P. 13، (کتێب)

سەرچاوەکانیان ئەو دۆخە دەروونیانەیە و ئەوان (دۆخەکان) هونەرمەند بەرەوە ئەو ئاقارە دەبەن کە مرازیەتی."[147]

بۆ ئاشناکردنی خوێنەر بە کرۆکی بابەتی ئەم تەوەرە، (٩) دەقەشیعرمان بۆ هەڵبژاردوون کە هەموویان بۆنوبەرامەی هەواری سەردەمی منداڵی شاعیریان لێدێ و بە ستایل و تەکنیکی شیعریی جیاواز دارِشتراون:

*من لەیادەوەریی دایکمدا*

*کۆچ دەکەم بۆ:*

*یاریگاکانی منالّیم و (مەبەستم لووتکەی باوە شاسوارە)*

*شوێن پێی کچێك بۆن دەکەم*

*کەناوی... بالّندەی*

*بێدەنگییە*

*کوا ئەو پردانەی*

*لەنێوانی من و کچە نەناسراوەکاندا بوون؟*[148]

شاعیر یادەورییەکانی دایکی بەبیردێتەوە، لە جیاتی ئاماژەکردن بە مرچوماچ و باوەش و لایەلایە و لاواندنەوە، دەچێتەوە (باوەشاسوار)ی زێدی خۆی و لەگەڵ منداڵەکان دەکەوێتەوە یاری کردن، لە هەمان کاتدا ئەو یادەوەریانە، شاعیر رادەستی جۆرە بێدەنگی و کپ و خامۆشییەك دەکەن، کە ئاوێنەی ناخی ئەو نیشاندەدەن. ئەو بێدەنگییە، ئاماژەیە بۆ ئەو بێدەنگییەیی کە کۆچی دایکی بۆ شاعیری کردۆتە میرات. لێرەدا بازنەی یادەوەرییەکان هێندە

[147] ) سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣١

[148] ) دیوانی لە تیف هەڵمەت، ل ٧٩٥ ـ ٧٩٦

فراوانن زۆر شتیان لەخۆ گرتووە، وەك: (یاری منداڵی/ لووتکەی باوەشاسوار/ شوێن پێی کچێك/ باڵندە/ بیدەنگی/ پرد/ نیشانەی پرسیار).

لە دەقی (کتێب) دا شاعیر دەڵێ:

***دایکم دەیووت: بەمناڵیش***

***کتێبێك و***

***شەقشەقەیە زێڕمان دایتێ***

***شەقشەقەکەت***

***بە پێ شکان***

***کتێبەکەت:***

***توند. توند. توند. توند***

***بە سینگی خۆتەوە. نووسان!***[١٤٩]

خۆشەویستیی شاعیر بۆکتێب و خوێندنەوە، لە هەرزەکارییەوە دەبێتە هیوایەت و تێکەڵ بەیادەوەری منداڵی دەبێت و جارێکی تر یادی دایکی دەکاتەوە و دێتەوە پێش چاوی، شاعیر لە شوێنێك دا دەڵێ، من دڵداریم زیاتر لەگەڵ نووسین و کتێب کردووە. نەك لەگەڵ کچ، ئەمە لە تەمەنی گەنجیدا، بەهەمان پێودانیش لە منداڵیش دا حەزی زیاتر لەکتێب بووە، هەڵبەتە ئێستاش هەر هۆگری خوێندنەوەی کتێبە. بۆیە ژیانی (لەتیف هەڵمەت + خوێندنەوەی کتێب = نووسینی کتێب). شاعیر سەدای دەنگی دایکی دێتەگوێیی و سەردەمانێك دەگێڕێتەوە کە خۆشی بەبیر نایەتەوە. لەنێوان وشەکانی ئەو دەقەدا دوو خاڵی شاراوە خۆیان حەشارداوە: یەکێکیان ئەوەیە، کە زیرەکانە دیاردەیەکی ئێستا ـ کە کتێب خۆشویستنە، بە ڕووداوێکی تەمەنی دوو سێ ساڵی خۆیەوە گرێدەدات. خاڵی دووەمیش ئەوەیە کە ئەوەی وایکردوە کتێبی خۆشی بوویت وەك خۆی دەڵێ. پاشخانە کەلتووریەکەی ماڵەکەیانە، ئەو دەڵێ:" هەمیشە من

---

[١٤٩]) سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٨٥

گوێگرێکی باش بووم لەناو ماڵی خۆمـان، خـەڵکیش دەروێشـی ژن دەروێشـی پیـاو چـیرۆك و سەرگوزشتە و داستانیان دەگێڕایەوە، من گوێم لەوانە دەگرت زۆرباشم لەبیرە پورە (ڕەعنا)یـەك هەبوو دەهات بۆ ماڵمان و هەمیشە چـیرۆکی گـوێ ئـاگردانی بـۆ دەگێڕاینـەوە، مـن زۆر لای دادەنیشتم بۆ ئەوەی گوێ لەو حیکایەتانە بگرم، یا (ئامینێك) هەبوو گـوێم لێـدەگرت، بـاجی (کافیە) یەك هەبوو، خەڵکی شاری کفری بوو دراوسێ بـوو چـیرۆکی بۆدەگێڕاینـەوە، مـن زۆر بەوردی گوێم لێدەگرتن." [150]

دەقنووس نیشانمان دەدا کە ئەو هەمیشە بێزی لە زێڕ و زیوو بۆتەوە، کەچی بۆ کتێبەکـە، (٤) جاران وشەی (توند)ی بەکار هێناوە، تا هەست بەوە بکەین کتێب چەندە لە دڵێ (سینگی) ئەوە نزیکە و ئاشنایەتی نێوانیان چەندە قەدیمە.

لە شەن وکەوکردنی قۆناغەکانی تەمەنی شاعیردا (ڕابردوو/ ئێستا/ ئایینـدە)، دەتـوانین بڵـێن، پەیوەست بە جیهانبینی دایك، ئەوەندەی ئەو لە ڕابردوودا دەژیێ هێندە لـە ئێسـتا و ئایینـدەدا ناژیێ.

ئەوەی لە ژیانی دەقنووسدا نییـە، هـێمنی و خۆشـگوزەرانییە، کـە بەشـێکی زۆری لەگـەڵ مەرگی دایکیدا زیندەبەچاڵ کراوە. وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا ئەم بارودۆخە دەروونییەی شاعیر نائاساییە، بەدەگمەن لە بەرهەمی شاعیر و ئەدیبانی دیکـە بـەم فراوانـی و گەورەییـە هەیـە، تەنانەت لە کۆبەرهەمەکەی (شێرکۆ بێکەس)ی هـاوڕێی (لـەتیف هەڵمـەت)یشـدا، بیرەوەریـی منداڵی و یادی دایك، ئەوەندی خەم و ئازار و موعاناتی دەروونییان بە شاعیر بەخشیووە، نیـو هێندە خەندە و گۆرانی و دڵنەواییان پێنەبەخشیووە، بـەڵام شـتێك هەیـە کـە لـە شـیعرەکانی لەتیف هەڵمەت هەستی پێدەکرێ، ئەویش ئەوەیە لـەپاڵ خـەم و ئـازارە رەگێکـی شـیعرەکەش

---

[150]) دیدەنی هاوژین سلێوە لەگەڵ لە تیف هەڵمەت، ١٩/ ٣ / ٢٠١٢

دەچێتەوە جیهانی گەشبینی و ئیرادەبەخۆبوون و بێ هیوانەبوون. جا گرفتەکەی ئەو لەوە دایـە، کە واهەست دەکات، سەیران و ئاهەنگ گێڕان و کۆبەندی خۆش، خیانەتکردنە لە یـادی کۆچـی دایکی. بۆیە لە تەعلیل کردنی نامەحروومی خۆی لە خۆشییەکان، زۆرجـاران بەسـەر دایکیـدا دەشکێنتێتەوە، ئەوەتا دەڵێ:

**هەندێ خەوم پاشەکەوت کرد بۆ کاتی**
***بێخەوی: گریانی مناڵێك لێی دزیم/ هەندێ پێکەنینم***
***پاشەکەوت کرد بۆ کاتی دڵتەنگی/ یادی دایکم لێی***
***دزیم هەندێ ماچم پاشەکەوت کرد بۆ کاتی پیری/***
***کچۆڵەیەك قەپاڵی پیادا کردو بردی/***
***قسەی زۆرم ماوە***
***لەگەڵ ئەو کچەدا بیکەم (مەبەستم ـ شالا ـ یە)***
***پردی زۆر ماوە لەنێوانماندا دروستی بکەم!***[151]

لەتیف هەڵمەت، وەك شاعیرێکی ئەزمووندار، پیشەوەرێکی دەستڕەنگینی بـازاڕی شـیعرە، هەمیشـە خـەریکی وەسـتاکاریی نوێیـە، جـا سـەردەمی منـداڵی خـۆی وەك قـوڕی سـناعی هەڵدەشێلێتەوە و ئەوەی بەخەیاڵی دادێ لێی دروستدەکات. ئەوەتا بەبێ ئەوەی تاکە وشـەیەکی سەردەمی منداڵی بەکار بێنێ، بـە ئـارامی دەسـتمان دەگـرێ و دەمانباتـەوە ئـەو ڕۆژگـارەی ڕوخساری دایکی هەموو جیهانی ئەوی داگیرکردبوو و لە ئەو بەولاوە کەسی دیکەی نەدەناسـی، دیسان دەبینین ڕابـردوو دەبێتـە ئێسـتای شـاعیر، بـەڵام ئێسـتایەك ژەهراویکـرا و ڕەشـکراو و ناشیرینکراو بە دیمەنەجوانەکانی ڕابردوو. هەوڵدان بـۆ هـەڵکۆڵینی وێنـەی دایـك، بـە پەنجـەی شێتانە، لەسەر هـەموو دارەکـانی جیهـان، هاوارێکـە بـەگوێی هـەموو خەڵکـدا، کـە خـاتوو

[151] ) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٧٩٤ ـ ٧٩٥

سەعدییەی دایکی، جوانێکە لە جیهانێکی نەفرەت لێکـراو دەبـێ هـەمووان بیبیـنن. بـڕوانن، شاعیر لە وێستگەیەکی دیکەدا دەڵێ:

***نا دایە گیان هەرگیز مردن ڕوخساری تۆ***
***کۆن ناکات و***
***لە منی ناشارێتەوە و***
***بزری ناکات...***
***تۆ هەر تۆیت و***
***منیش هەر خۆشتم دەوێ و***
***ڕوخسارە لە ئەلبووم دەرکراوەکەت***
***بە پەنجە شێتەکانم لەسەر دارەکانی***
***هەموو جیهان.. هەڵدەکۆڵم و***
***دەستی لە زنجیر ڕاکردووم***
***لە نێوانی هەردووکماندا***
***دەکەم بە پردێکی نهێنی و***
***سای کێلی لاشە زیندە بەچاڵ کراوەکەت***
***دەکەم بە هێلانەی کۆتری***
***ئەوینە نەفرەت لێ کراوەکەم...!***[١٥٢]

شاعیر هەمیشە نەمری بەدایکی دەبەخشێت، واش دەزانێ کە دایکی زیندە بەچـاڵ کـراوە نەك مردبێت، دواتـر نێـژرابێت. ئـەو زینـدە بەچـاڵکردنەش وێنـەو روخسـارو جـوانی دایکـی لەبیرناکاتەوە.

[١٥٢] ) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٢٨٧

شاعیر دەیەوێ دڵنەوای خۆی بداتــەوە و دڵـی دایکـی ڕازی بکـات و پـەیامگر قەناعــەت پێبێنێ، کە دایکی زیندووە و ڕۆژگارەکانی منداڵی لەگەڵ ئەودا دەژین، ئاسنگەری، ڕیزبەندێك وشەمان بەبێ پسانەوە دەخاتە بەرچاو و دەڵێ:(کـۆن ناکـاتو/ لـە منـی ناشـارێتەوەو/ بـزری ناکات/ تۆ هەر تۆیت و/ منیش هەر خۆشتم دەوێ.

منداڵ هەر منداڵە و تەمەنی منـداڵێش بـەو یادگارییانـەوە خۆشـە، کـە بـە لاسـاریی و سەرەڕۆیی و شەیتانییەتی ئەو ڕەنگڕێژکراوەن، بەڵام کردار و ڕەفتارەکان بە دەستی پـاك و دڵـی پڕ بەرائەت ئەنجامدراون. یەکێك لە خەسڵەتە دیارەکانی شیعری لـەتیف هەڵمـەت (ڕاسـتگۆیی ئەدەبییە)، کە زۆر شارەزایانە کاری لەسەر کردووە و بە هونەر و شێواز و زمانی شیعریی خـۆی بۆ گەیاندنی پەیامێك بەکاری هێنـاوە، کـە هـەردوو زەمەنەکـە (ڕابـردوو و ئێسـتا) لـە تـای تەرازوویێکی واقیعانەدا هاوسەنگ دەکات. بڕوانن چۆن لاسارییەکی سەردەمی منداڵی خۆی بـۆ دەربڕینێکی سەردەمییانە تەوزیفکردووە، ئەو دەڵێ:

***به منداڵی پەیینی ئاژەڵ و خوێ و تووتنم***
***تێکەڵ دەکردو***
***جگەرەم لێ هەڵدەبەست و***
***دەمدا بە پیرەژنە دراوسێکەمان***
***کە لەو کەین و بەینە تێ گەیشت..***
***ئیتر پیرەژنی تایین***
***لە هەموو جگەرەیەك سڵی دەکردو***
***لێی بە گومان بوو..***
***لە هەموو جگەرەیەك دەترسا..***
***لە جگەرەی دایکم..***
***لە جگەرەی باوکم***
***تا وەکو لە جگەرەکانی ناو قوتووی***

*جگەرەکەی گیرفانی خۆیشی*

*هەر دەترسا..*

*دەیووت: (ئەشێ شێخ لەتیف دەسکاری*

*کردبێ، بەخوا منداڵێکی لاسارو ناعالە ئەرێ*

*خاتوو سەعدیە ئەم کوڕەی تۆ بۆ وا نارەحەتە)*

*منیش ئەمرۆ: لە هەموو وشەیەك*

*دەترسم..*

*لە هەموو وشەیەك سڵ دەکەم..*

*دەشێ: نەختێ پەیین*

*یا دەمە چەقۆیەك*

*یا، کلۆیە باڕووتی تیابێ...!*[153]

لەبەراوردکردنیێکی ئەم دەقە بە دەقێکی شێرکۆ بێکەس، کە ئەویش یادەوەری سەردەمی منداڵییە، دە بینین، شێرکۆ بێکەس یادەوەرییەکە وەك یادەوەری دەگێڕێتەوە و حەنین و تامەزرۆیی خۆی بۆ ئەو کات نیشاندەدات، هەرچی (لەتیف هەڵمەت)ە، یادەوەرییەکەی وەك ڕەخنەیەکی توند بۆ توانجێکی باری کۆمەڵایەتی کوردەواری تەوزیفکردووە. شێرکۆ بێکەس دەڵێ:

*لە کاتێکدا کە منداڵ بووم*

*دەستی چەپم حەزی ئەکرد*

*وەك دەستی منداڵی پۆشتەی*

*دراوسێمان*

*سەعاتێکی تیابێ و ئەویش*

---

[153]) سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٩٢ ـ ٢٩٣

***وركم ئەگرت***
***دایکم ناچار گازی ئەگرت***
***لە مەچەکم***
***بە جێگەی دان***
***سەعاتێکی بۆ ئەکردم***
***ئای... کە دڵخۆشی ئەکردم.*** [154]

شاعیر لەسەر شێوازی وەسف وێنەیەکی گشتی کێشاوە، کە خۆی لە پێنج وێنەی تاکدا دەبینێتەوە، ئەوانیش هەر لەسەر بنەمای وەسف کێشراون بە هەر پێنج وێنە تاکەکە کە وێنەیەکی گشتی پێکدێنن. لایەنێکی منداڵی شاعیر پیشان دەدات ئەویش هەژاری و حەز و ئارەزووی شاعیرە، شاعیر درێژە دەدات بە خستنەڕووی وێنەکانو دەڵێت:

***کە منداڵ بووم زۆر ئێوارە***
***ئەیان ناردم..***
***لە ماڵی پوورە مەنیجە***
***ترشیات بکڕم***
***کام تام لەو تامە خۆشتر بوو***
***لەدوای ئاوڕ***
***لە پێچی تەنگی کۆڵانا***
***کاتێ یەك دوو قوومی خێرام***
***ئەدا لە ترشیاتی ناوجام.*** [155]

---

[154]) شێرکۆ بێکەس، دیوانی شێرکۆ بێکەس، ب (١)، ل ٤٣٧

[155]) سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٣٨ ـ ٤٣٩

دەروونناس (کۆزۆلینۆ لویس Cozolino Louis) لە کتێبی (زانستی دەماریی لە پەیوەندیی مرۆیدا) دەربارەی هەستە سۆزدارەکانی دایك کە لە خودوێنەدا ڕەنگدەدەنەوە، ئەم خاڵانە تۆمار دەکات:

- **وشە:** لە لایەلایە و چیرۆك و حیکایەت و گۆرانی و ئامۆژکاری و پێکەنین و گریانی دایك.
- **بینین:** وەك دەم وچاو و گوڵ و باڵندە و ڕەنگ و وێنە و پۆشاك و شوێن...تاد.
- **بیستن:** وەك دەنگی باران و بروسکە و شەماڵ و لایەلایە و مۆزیك. دەنگی گیاندار و تەیروتوار. دەنگی کارکردن لە ماڵ وەك گەسکلێدان و لانك ڕاژاندن...تاد.
- **بۆنکردن:** وەك بۆنی چێشت، پۆشاك، جەستە، گوڵا و عەتر و مسك و عەنبەر، گیاندار، ژینگە...تاد.
- **دەستلێدان:** لە خۆڵ، لە هەویر، لە پرچ، لە سینگ و مەمك، لە دەست و پەنجە، لە کوڵم و لێو...تاد.[156]

خوێنەریش لێرەدا ئەو هەستەی لەلا دروست دەبێ، کە هەموو هەستەکان و شتەکانی لەتیف هەڵمەت، هی دایکەییێتی کە وەك میرات بۆی بەجێهێشتووە، بۆیە دەڵێ:

***زۆرجار کە برسیم دەبێ***
***حەز لە کۆلێرەیەکی گەرم گەرم دەکەم...***
***ئای بۆنی کۆلێرەی گەرم چەند خۆشە...؟***
***ڕۆژانی منالّیم بیر دەخاتەوە...***
***ئەو ڕۆژانەی کە دایکم نانی دەکردو***

[156] ) Cozolino Louis، The Neuroscience of HumanRelationship، New York، W. W. Norton and Company، ٢٠٠٦، P.١٢١(کتێب)

***حنە و مارمارۆکە و پەپکە بە کونجی و***

***کەلانەی بۆ دروست دەکردم...***

***ئای دایکم کوانێ...؟***

***هیچ نانێك ئەوەندەی نانی دەستی ئەو***

***خۆش نیە،.. و***

***هیچ نانێك برسێتیم تێر ناکا...***

***نانی دەستی دایکم نەبێ...![١٥٧]***

ئــەم دەقــە ســیخناخە بــە فەرهــەنگی فۆلکلــۆر و کــەلتووری کــوردەواری، هــەموو هەستەوەرەکانی شاعیر دەکەونــە کــار، بــۆن و ڕەنــگ و تــام و شــێوە و ژینگــەی ڕووداوێکــی سەردەمی منداڵی لە هزر و خەیاڵیدا بەخەبەر دێنەوە و تابلۆیەکی نازداری ئەو سەردەمەمان بۆ دەکێشێ. ئەو تامەی لە خواردنی دەستی دایکی چێشتوویەتی هــەرگیز دەســتی نەکەوتۆتــەوە، دەروونناس (کۆزۆلینۆ لویس) بۆخۆشی دەڵێ:" هەرگیز من وا هەست ناکەم کە بیرەوەرییــەکانی سەردەمی منداڵیم هی خۆم بــن، چــونکە کــە ئــەوانم وەبــیر دێتــەوە، هەمیشــە لــە نــاو هــەر وشەیەکیاندا، هەست بە بوونی دایکم دەکەم."[١٥٨]

شاعیری فەلەستینی (مەحمود دەروێش)لە قەسیدەی (بــۆ دایکــم) ئــەم حەنییــنــە حەزینــە نیشاندەدات کە دەڵێ:

***تامەزرۆی نانەکەی دایکم و***

***قاوەکەی دایکم و***

---

[١٥٧]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٣٠٨ ـ ٣٠٩

[١٥٨] (Cozolino Louis، The Neuroscience of HumanRelationship، New York، W. W. Norton and Company، ٢٠٠٦، P.٨١(کتێب)

**دەست بەسەرداهێنانی دایکم**[159]

"وێنەی دایك، بەهەردوو دیوەکەیەوە: ئەرینی و نەرێنی، ئەو هەستەیە کە لە سەردەمی منداڵیدا بێ ئاگایانە لە لایەن دایکەوە دەچێتە ناخی منداڵ و جێگیر دەبێ. جار هەیە بازنەکە لە جیهانی دایك فراوانتر دەبێ، نەنك و پوور و دایەوان و کەسانی دیکەی دەورەپشتی منداڵەکە دەگرێتەوە. دایکە وێنە شێوە و شێوازی جیاوازی هەیە، بەڵام هەموویان هەر لەو توخمانە پێکهاتوون کە لەلای هەموو منداڵێك سەرچاوەکەیان دەچێتەوە سەر دایك." [160]، جا ئەو دێو و درنجەی کە شاعیر لەم دەقەدا ئاماژەی پێداوە و بۆ پێناسەکردنی رۆژگاری ئێستای تەوزیفکردوو، سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە سەردەمی منداڵی شاعیر. لێرەدا شاعیر لە تەقولباب دەترسێ، چونکە دز و چەتە و پیاوکوژ زۆر بوون. لەلایەکی دیکە ترسێکی دەروونیشی لەلا دروستبووە، کە دڵی خۆی وەك کێوی ئاسنیین کلۆم داوەوە، تەنیا بۆ کچان دەیکاتەوە. چونکە لە بەنیئادەمەکانی دیکە ترساوە. لێرەدا ترسێك هەیە لە سەردەمی منداڵیەوە درێژەی هەیە، تا ئەو چرکەساتەی تەمەنی شاعیر، ئەو دەبێژێ:

***کە منداڵ بووم هەر نیوەشەوێك***
***لە دەرگاکەمانیان بدایە.. دەمووت:***
***- دایەگیان مەیکەرەوە.. دێو و درنجن هاتوون من بدزن...***
***ئێستاش لە چەرخێکداکە هەموو شەقامەکانی***
***شانەی زاوزێی دێوو درنجن..***

---

[159])http://www.adab.com/modules.php?name=Sh٢er&doWhat=shqas&qid=
عەرەبی ٦٤٧٦٧

[160])Cozolino Louis، The Neuroscience of HumanRelationship، New York، W. W. Norton and Company، ٢٠٠٦، P.٢٢٧

***دڵم وەکو کێوێکی ئاسنین***

***بەکۆڵمدا داوە و***

***لەدەرگای دڵی ئەو کچە جوانانە دەدەم***

***کە دەمناسن و نامناسن...!***[١٦١]

بڕوانە ئەم هێڵکارییەی هەردوو کەناری ژیانی شاعیر:




لەتیف هەڵمەت، ئەوەندەی بە ناخی بیرۆکە و کرۆکی پەیامەکاندا دەچـێتەوە خـوارەوە، بەو ئیعتبارەی کە بەهای هونەری تۆبۆگرۆافیای قەسیدە، بەشێکە لە تەواوی قەسیدەکە.

***بیر ئەکەمەوە لە بیرەوەری***

***ئەلەو ژیانەی کەوا تێ پەڕی***

***ئەلەو ڕۆژانەی کە لێمان گوم بوو***

***لە ناخی چەرخی ڕەشا نووقم بوو***

***دەروونی زەنگم پڕ ئەبێ لە خەم***

***دنیای ژیانم دائەپۆشێ تەم***

***ئەمرێ پرشنگی لێوی خەیاڵم***

***جریوەی هەستی شیرین و تاڵم***

---

[١٦١]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل٢٨٢

*هەڵاوی چڕی ئاخ و هەناسەم*
*تیایدا ئەخنکێ برووسکەی تاسەم*
*مانگی هیوام وەك مۆمی داگیرساو*
*ئەتاوێتەوە و ون ئەبێ لە چاو.*[162]

شاعیر لە جیاتی ئەوەی شاكارێك بۆ دایكی بهۆنێتەوە، (دایك)ی كردۆتە ناونیشانی كۆمەڵە دەقێكی سەربەخۆ بەناوی: *(ئەو نامانەی/ كە دایكم نایانخوێنێتەوە/ ١٩٧٩)*، ئەوجا قەسیدەیەكیان كە (٦) جووتە دێڕی جووت سەروایە بە ناوی *(لافاوی وشە لە هەڵبەستێكی كورتا یان بە یادی دایكم)* تۆمار دەكات. بۆ ئەم دەقە، دوو خاڵ شیدەكەینەوە:

مەرجە بۆ ئەوەی نووسینێك پێناسەی (نامە) وەرگرێت، لە نێوان نووسەر و خوێنەر یان خوێنەران بێت، كەچی لە نامەكانی لەتیف هەڵمەتدا، لێرە، ئەو خوێنەرەی نامەكانی بۆ نووسراوە بزرە، ئەو دەزانێ دایكی ناتوانێ بیانخوێنێتەوە، كەواتە، خوێنەرەكانی ئێمە و نووسەرەكەیەتی كە (شاعیر)ە، واتا ئەم نامانە بۆ ئێمە نووسراون، بەڵام ناوەرۆك و پەیامەكانیان، بابەتەكانی نێوان (كوڕ و دایكن) كە ئێمە خۆمان حەزدەكەین بیانخوێنینەوە.

یەكێك لە خەسڵەتەكانی ناونیشانی شیعرەكان لەتیف هەڵمەت، كە تایبەتمەندە، نەك زۆرجار كورتبڕ نین، بەڵكو دوور و درێژیشن لەچاو ناونیشانی ئاسایی، كە شاعیر بەئەنقەست ئەمەی كردووە، لێرەدا بە هەردوو ناونیشانەكە (١٥) وشە دەخوێنینەوە كە (٧٣) حەرفن. ئەمەیش نیشانەی ئەوەیە كە تینوویەتی ئەو بۆ وەسفكردنی هەر شتێك پەیوەست بێ بە دایك، بە وشەیك و دوو وشە تەواو نابێ.

دواین هەڵبژاردەی ئەم تەوەرە، دەقێكە كە بەشێوەیەكی جیاواز خۆی دەنوێنێ، خوێنەر وا هەستدەكات، كە شاعیر وەك مامۆستا لە پۆل وەستاوە و یان لە نێو كۆمەڵە منداڵێك

---

[162] ) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٣٤١

دانیشتووە، سەربوردەی خۆی دەگێڕێتەوە. سەرتا بە پەخشانە شیعر دەست پێدەکا، دواتر زمانی شیعری دێتە گۆ و قەسیدەکە لە قالبێکی جوان و ڕەوان و تۆکمە تەواو دەکات. لە دواین بەشی قەسیدەکە، ڕوو لەو کچە دەکات کە خۆشی دەوێ و جوانترین و پیرۆزترین و مەزنترین دیاری خۆی پێشکێش دەکات :(*ئەی کچە هەورەکە/ تۆ دایکم نیت و/ من ڕێزو بایەخی ئەندازەی پیرۆزی دایکمت/ دەدەمێ...*). ئەمەش قەسیدەکەیە:

***(وەك هەر ڕوەکە کێویلەیەك ڕۆژێ لەڕۆژان)***
***ڕوام و لەبیخی ئەم خاکە فێنکەدا بنجم گەلاڵە کرد...***
***مناڵێکی زۆر لاسارو چەمووش و بەختیار بووم..***
***مناڵ نەبووم...***
***شای جیهانی بێ سنووری خۆشی و ئاسوودەیی بووم...***
***دایکم لەڕادەبەدەر خۆشی دەویستم و نازی دەدامێ و***
***منیش بەجۆرێك دایکمم خۆشدەویست کاتێ کەنەخۆش دەکەوت***
***نانی دەستی ژنە دراوسێکەمانم نەدەخوارد...***
***هەرخواردنێك بۆنی دەستی دایکمی لێ نەهاتایە من بێزم لێ دەکردەوە...***
***کە دایکم مرد... ئەوجیهانە گەورەیە روخا کە من شای بووم و هەموو سووچێکی***
***لەژێر ركێفی دەستە بچکۆلەکانی مندابوو...***
***داری ئەو خەونە سەوزانە کەڕویان کردو هەڵپرووقان***
***کە من پیایاندا هەڵدەگژام و***
***بەرە ئەفسانەیی ومزرەکانیانم دەخوارد و***
***جۆرکەکانی دڵم لێ پردەکردن...***
***...***
***لە قولایی برینێکی گەورەدا وەك کۆڵەوژی ژان***
***چەقیم و جیهانە لە نەخشە دەرکراوەکەمم***

لاواندەوە و هوون هوون گریام... و
زەویم کرد بەدارستانی فرمێسك...
...
ئەی کچە هەورەکە
تۆ دایکم نیت و
من ڕێزو بایەخی ئەندازەی پیرۆزی دایکمت
دەدەمێ...
تۆ بۆنی بارانی ئەو کێوانەت لێ دێ و
منیش بارانە کێویلەم خۆش دەوێ و
هەرچەندێ شێتو تورەیە
حەز دەکەم هەر بباریٚ و هەر بباریٚ و
بۆنی هەموو لووتکە بەرز بەرزەکانم بۆ بێنێو
تەپو تۆزی دەربەدەری روخسارە ماندووەکەم
بکوژێنێتەوە...
ئای... دەرگا لەدڵم دامەخە... مە...
ئەم چۆلەکە پەرەوازەیە
لەخۆت دوور مەخەرەوە...!
کچێ ئەم چۆلەکە پەرەوازەیە...
دڵە... دڵ... خۆ مێش نیە...!
...
تۆ لە زمانی شەپۆلی وێڵی گیانی
شاعیرێکی سەرەڕۆ نازانی و
منیش ناتوانم گۆرانی دڵێك بکوژم
کە تامەزرۆی پەڵەهەورێکە

***بۆنی بای کوێستانی لێ دێ...*** [163]

خۆشەویستی و بەها و پیرۆزی دایك هێندە مەزنە، بە لەدەست دانی دایك توشی کەلێن و فراغێکی گەوری رۆحی بووە، نازانێ چۆنی پڕبکاتەوە، بۆیە هانا بۆ ئافرەتێك دەبات تاکو هێوری دەروونی بۆ بگەرێنێتەوە، بۆئەوەی بەشێك لەو سۆزو خۆشەویستییەی پێبداتەوە. لە وێستگەیەکی تریش هانا بۆسروشت دەبات. د. دلشاد عەلی دەڵێ: " ئاوڕدانەوەیەکی بەرەو دوا، بۆسەرەتای دروست بوونی مرۆڤ و سەرەتای دەست پێکردنی ژیانی ئادەمیزاد، لەسەر ڕووی ئەم زەوییەدا، بەئاشکرا ئەوەمان بۆدەرئەخات، کە مرۆڤ راستەوخۆ پەیوەندییەکی پتەوی بەستووە بە سروشتەوە." [164]

پووختەی تەوەرە:

شاعیر وەستاکاری زۆری کردووە تا سەردەمی منداڵی خۆی کارامانە لە دەقەکاندا تەوزیف بکات، مەبەستی بووە کە بە پەیامگر بڵێ:

- سەردەمی منداڵیم گەنجینەیەکی بە نرخە بۆ گوزارەی شیعرەکانم.
- هەمیشە ئێستا من، کە لە خەم پێچراوەتەوە، زادەی یادەوەرییەکانی سەردەمی منداڵیمە.
- دەکرێ ڕوودا و سەربووردەی سەردەمی منداڵی بۆ گەیاندنی مراز و پەیامی جیاواز تەوزیف بکرێن.
- ناڕاستەخۆ، بەهاو کاریگەری سەردەمی منداڵی، لەسەر پەروەردە و هەرزەکاری و ئایندەی کەسەکان. دەنرخێنێ، وەك بڵێی داوا دەکات، کە هەوڵ بدەن کەش و

---

[163]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٢٧٦ (جۆرك = گیرفان و بەرباخەڵ)

[164]) دلشاد عەلی، دیلان شاعیر و ئازادیخواز، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق، بەغدا، ١٩٨١، ل ٦

هەوایەکی ئارام بۆ منداڵەکان دەستەبەر بکەن، تا کەسی دیکە، وەك ئەو نەبنە قوربانی یادەوەرییە تفت و تاڵەکانی سەردەمی منداڵی.

## ( ٣ )

# بێدایکی

دابڕان و مەحروومکردنی منداڵ لە باوەشی دایك، لەبەر هەر هۆکار و قەدەرێك بێ، کەم تا زۆر، ئاساواری خۆی لەسەر ژیانی ئایندەیدا بەجێدەهێڵێ. گوتراوە سەردەمی منداڵی خەوە و خەونەکانی لە تەمەنی هەرزەکاریدا وەبیردێنەوە. لە کوردەواری زاراوەی (سێوێ) بەو منداڵە دەوترێت لەسەردەمی منداڵیدا دایکی یان باوکی لەدەست دابێ، هەرچی وشەی (هەتیوو) ە ـ کە (هەتیم و هێتیم)یشی پێدەڵێن و بەو منداڵە دەوترێ کە دایك و باوکی نەمابێ، ئەویش دوای تەمەنی هەرزەکاری ئەو ناوەی لێ دەسێندرێتەوە.[١٦٥] لە فەرهەنگی عەرەبیشدا (العجِيّ) ئەو منداڵە دایك مردووەیە شیری مەمکی ژنانی دیکەی پێدرابێ و (الیتم) منداڵی باوك مردووە و هەرچی وشەی (اللطیم)ە بۆ منداڵێکە هەردوو باوانی نەمابێ.[١٦٦] بەڵام لە یاسای باریی کەسێتی ئەمەریکا زاراوەی (Orphan) بەو منداڵە دەوتریت، کە دایك و باوکی یان یەکێکیانی لە دەست دابێ، جا هۆکاری لە دەست دانەکە مردن بێ، یان لێکدابڕان و ترازانی خێزانی بێ، یان بەڕەلاکردنی منداڵەکە بێ بە بێ سەرپەرشتیاری، دوور لە دایك و باوك یان دوور لە یەکێکیان.[١٦٧]

---

[١٦٥]) هەنبانە بۆرینە، ل ٤٨٨، ٩٩٣، ١٠٤٢

[١٦٦]) http://www.aleqt.com/٢٠١٠/٠١/٠٣/article_٣٢٦٤٣٨

[١٦٧]) www.uscis.gov/tools/glossary/orphan

له کورده‌واری ده‌گوترێت: "منداڵ به‌بێ دایك، هه‌تیوو ده‌بێ، به‌بێ باوك زه‌لیـل ده‌بـێ." ڕه‌نگ بێ له‌به‌ر ئه‌وه بێ که دایك بۆ منداڵ جێگه‌ی هه‌مووان ده‌گرێته‌وه و که‌س جێگه‌ی ئـه‌و ناگرێته‌وه. باوکیش زیاتر ئه‌رکی په‌یداکردنی نانه بۆمنداڵه‌کانی.له دیدی منداڵی فـام کـردوو دا، ڕۆیشتنی دایك خه‌مه گه‌وره‌که‌یه. ئیمڕۆ له ئه‌ده‌بی جیهانیدا ده‌یان شاکاری ئه‌ده‌بی له‌سه‌ر بێدایکی نووسراون. هه‌موویان بـاس لـه سـه‌ربورده‌کانی قاره‌مانـه‌کانیان ده‌کـه‌ن لـه غیـابی که‌سێکی بێ نه‌زیری خه‌مخۆر و جه‌رگسۆزدا، ئه‌ویش دایکه.

له شـیته‌ڵکاری ده‌قـه شـیعره‌کانی لـه‌تیف هه‌ڵمـه‌ت دا، لـه ڕووی ده‌روونییـه‌وه، ئـه‌وه ده‌خوێنینه‌وه، که بێدایکی له ژیانی ئه‌ودا له سێ بازنه‌ی داخراودا، که هه‌ر سێکیان ئاویتـه و یه‌کتربڕی یه‌کدین، بوونی هه‌یه، ده‌کرێ به " غائیبـه هه‌میشـه حازره‌کـه و حـازره هه‌میشـه غائیبه‌که" پێناسه‌ی بکه‌ین. ئه‌مه‌ش بازنه‌کانن:

• **بازنه‌ی ناخی شاعیر:** کتومت وه‌ك ئه‌وه وایه که‌سێك وا هه‌ست بکات ئه‌ندامێکی جه‌سته‌ی له‌ده‌ستدابێ، وه‌ك گورجیلکه، چاو، ده‌ست، قاچ... تاد. بۆیه شاعیر هه‌رگیز ناتوانی، نـه‌مانی ئه‌و ئه‌ندامه‌ی جه‌سته‌ی، له‌بیر بکات. لێره‌دا، غیابه‌که، نه‌مانی ته‌له‌سمێکی پیرۆزه لـه ڕۆحـی شاعیردا، که بۆشاییه‌کی گه‌وره‌ی له ناخیدا جێ هێشتووه.

• **بازنه‌ی ماڵه‌وه‌ی شاعیر:** ماڵی سه‌رده‌می منداڵی له‌تیف هه‌ڵمه‌ت تابڵێـت، قه‌ڵـه‌باڵغ و پـڕ هات و بات و قۆمرغانه بـووه، هـه‌مووان سـه‌ریان بـه‌و ماڵـه‌دا گرتـووه و بـۆن و به‌رامـه و یاده‌وه‌ری خۆیان تێدا به‌جێهێشتووه، لێ بـۆ لـه‌تیف هه‌ڵمـه‌ت، سـه‌نگی هـه‌موویان لـه تـای ته‌رازووێك و سه‌نگی دایکی له تایه‌که‌ی دیکه، ئه‌مه‌یش بۆ ئـه‌و خۆشه‌ویسـتییه بێئه‌دازه‌ییـه ده‌گه‌ڕێته‌وه، که ئه‌و دایکه له دڵ و ده‌روونی ئه‌ودا چاندوویه‌تی .(دایـك)ی، هـه‌ر یـه‌ك تاکـه

کەس بوو، بەڵام کە ماڵئاوایی یەکجارەکی دەکات، شاعیر دەبینی ماڵەکەیان قەت کەسی تێدا نەماوە.

- **بازنەی کۆمەڵگای شاعیر:** ساتەوەختی ماڵئاوایی ئەو دایکە، تەواو جیاواز بوو، شاعیری لە بیابانێکی کاکی بەکاکی بە بێکەسی بەجێهێشت. چونکە ئەو کوڕە شەرمنە، لە تافی هەرزەکاریدا، دوور لە خۆشەویست و سەرپەرشتیار و تەگبیرکەر و مشوورگێڕ، خۆی بەتەنیایی لە گەرداو و گێژاوەیەکی چاوەڕوان نەکراو دبینێتەوە. ئەمەیش وایکردبوو هەموو دەورەبەری خۆی بە غەریب و بیگانە و غەوارە بزانێ.

بۆ ئەم تەوەرە چەند دەقە شیعرمان بۆ هەڵبژاردوون، کە هەموویان لە ناو ئەو سێ بازنەدا، کە لەسەرەوە ئاماژەمان پێدا، دەخوولێنەوە. هەوڵ دەدەین پێکهاتە و مراز و پەیامی شیعری هەریەکێکیان سەربەخۆیانە، شی بکەینەوە.

دەقنووس لە قەسیدەی (چنگی مەرگ) دا دەڵێ:

***کە لەرەی سۆمای دایکم نەمێنێ***
***ختوکەی پەنجەی***
***ناسکۆڵەی وشەی***
***دایکم دەماری دڵ نەبزوێنێ***
***هەستیم پڕ نەکا لە گەرای ئۆخەی***
***هێلانەی شیعرم نەوروژێنێ***
***کە بۆنی پرچی دایکم لە شنەی***
***لەرەی زیوینی بای شەوا... شادیم***
***لێ نەپرژێنێ***
***کە ئیتر دایکم بانگم نەکات و***
***ماچم نەکات و***
***ئاسودەیی و گوڵ***

*لە شانەی هەموو دڵما نەچێنێ*

*کە ئیتر بزەی فێنکی دایکم نەنۆشم بەچاو*

*خۆر لە بەر پێیدا ڕانەکشێ وەکو فەرشی ڕاخراو*

*دەبا تەمەنم هەر بێ بەهار بێ*

*ڕووباری گڕی پشکۆی ئازاربێ*

*تۆزقاڵێ خەندەی تیادا نەمێنێ*

*شـمشاڵی گیانم*

*چنگی ڕەشی مەرگ لە دڵما هاربێ*

*بکوژێتەوە چرای ژیانم.* [168]

پەیامی دەقەکە، ئەم کورتیلە هاوکێشەیە:

**ژیانێك بێ خاتوو سەعدیە = لەتیف هەڵمەتێکی بێ ژیان.**

هەرچەندە هەر (٣) جاران وشەی (دایکم) دووبارە بۆتەوە، لێ، هەر (٩٠) وشەی دەقەکە بە تریفە و پڕشەنگ و تیشکی ئەو دایکە دەبریسکێتەوە. دەقەکە داخراوە، بە وشەی (مـەرگ) دەست پێدەکات و بە وشەی (مەرگ) کۆتایی دێ، مەرگەکەشی بـە دڕەندەیـەکی زۆر کوشـندە شوبهێندراوە و (چەنگی ڕەشی) لە ئێمە دیارە، ئەمە ئیحایە کە شاعیر ناتوانێ ئـەو زاتـە لـەو چەنگە ڕەشە دەربێنێ. لێرەدا (٢) بازنە لە (٣) بازنەکەی سەرەوە وجودیان هەیە: بازنەی ناخ و بازنەیماڵەوەی شاعیر: لە ناخیدا (*سیما و وشە و بۆنی پرچ و بزەکانی دایـك*) دەدرەوشـێنەوە، لە ماڵەوە (*دەنگی دایك و ماچ کردن و ئاسوودەی و گوڵ*). ئێستا لـە جیهـانی بـێ دایکییـدا، هەموو شتەکان لە غەیب دان و تارمایی (نـــە) بەرچاوی ئەوی گرتووە: (*نەمێنێ، نـەبزوێنێ، نـەوروژێنێ، نـەپرژێنێ، نەچـێنێ، نەنۆشـم، نـەمێنێ، بکوژێتـەوە*). وا پێدەچـێ شـاعیر لـە ساتەوەختی ئیلهامی ئەم دەقە، خۆی وەك منداڵێکی چوار پێنج ساڵان نیشان دەدات و هەرچـی

---

[168] ) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٣٤٩ ـ ٣٥٠

ئاوەڵنا و وشەی ناسك و جوانە دەیبەخشێتە ئەو زاتە، بۆ ئەوەی هەم خۆی خۆی عەزاب بدات و هەم بۆ ئەوەی ئێمەش سۆزێك بەو بێدایکییەی ئەو پیشان بدەین. بڕوانە چۆن وشـەکانی بەسـەر دایك و خویدا دابەشکردووە:




ئاکامی هاوکێشەکە کۆژانەوەی چرای ژیانی دەقنووسە، لە غیابی سیما و ڕەنگ و دەنگ بۆن و بزەی دایکیدا، کۆچکردنێك کە بێدایکی بۆ شاعیر کردۆتە میرات، شـاعیری سـەر سـپی ڕادەستی سەردەمی منداڵی دەکاتەوە و بازنەکە دادەخات:

مەرگ = بە کوژانەوەی چراکان.

زۆرجار لە دەسـتدانی ئازیزێـك سـەرتاپای ژیـانی خۆشەویسـتەکانی تـاڵ دەکـات، "لـە سییەکانی سەدەی ڕابردوو دایکێك دوای جوانەمەرگ بوونی کچەکەی لە شاری کۆیە، بۆ مـاوی

(٢٠) ساڵ تەماشای ئاوێنەی نەکرد و پرچی خۆی شانە نەکرد" [١٦٩]، ئەوەتا شاعیر لێرە دەیەوێ هەمان شت دووبارە بکاتەوە، نەك بۆ (٢٠) ساڵ، بەڵکو بۆ هەموو تەمەنی:

***دەبا تەمەنم هەر بێ بەهار بێ*** ، ئەم شیعرەی شاعیر ئیش کردنە لەسەر زاکیرەی خودی و ئاوێتەی جیهانی بیرەوەی دەبێتەوە. خۆی دەبێتە سەرچاوەی سەرەکی ئیلهامەکەی " سەرچاوەی خودی لێرەدا شاعیر خۆی سەرچاوەی دروست بوون و هەڵقوڵانی وێنەکەیە، وێنە شیعرییەکە لە هەست و سۆز و ناخی شاعیر بەرهەم دێت" [١٧٠]

ژیان شیرینە، بۆیە لە زۆربەی بەرهەمی شاعیراندا، پەیوەندی و سۆز و خۆشەویستی نێوان ئەوان و دایکی کۆچکردوویان، پتر لە بازنەی بوون و ژیاندا نمایشکراون و کاریان لەسەرکراوە. وەلێ، لە شێوەننامەی لەتیف هەڵمەتدا، لەسەرەمەرگ و لە دوای مەرگی خویشیدا. ڕایەڵەکانی ئەو پەیوەندییە و سۆز و خۆشەویستییە هەردەمینێ، بەڵام بە ڕەنگ و ڕوخسارێکی دیکە، لە جیاتی ئەوەی حزووری دایك، دەقەکە بە ئەڤین و ئەمەکداری ئاوێزان بکات، بێدایکی ڕۆحی ئەو ئازار دەدات و برینەکانی هێندە بە سۆ دەکولێنێتەوە، "جیهانی منداڵ، جیهانێکی تایبەتەو گەورە ناتوانێ، بەسانایی بچێتە ناوی، ئەگەر شارەزایەکی باشی لەبارەی دەروونی و خەو و خەیاڵ و ئارەزووەکانی نەبێ و بە بنج و بنەوانی ژیان و هەڵس و کەوتی شۆڕنەبێتەوە" [١٧١] ئەمە بۆ ئەم کەسانەیە کەشیعری منداڵان دەنووسن، بەڵام لەتیف هەڵمەت شیعری منداڵان دەنووسێت، لەو جیهانە شارەزایە،"پێویستە مانای راستی ژیانکردن بە منداڵ بڵێین، بۆئەوەی منداڵ بزانێ بۆچی ئەفرێندراوە، دەیەوێ چی بکات، بۆچی لەو

---

[١٦٩]) دیدەنی، زبیدی حاجی عەبدوڵڵای کەبابچی، ژنی ماڵ، کۆیە، ٢٢/ ١ / ٢٠١٦

[١٧٠]) صافیە محەمەد ئەحمەد، شێوازی شیعرە کوردییەکانی پیرباڵ مەحموود،چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١٤، ل ٢٤٠

[١٧١]) کەمال غەمبار، ئەرخەوان حوسێن و ئەوانی دیکە، ئەدەبی منداڵان بۆپەیمانگای مەڵبەندی مامۆستایان و پەیمانگای پێگەیاندنی مامۆستایان، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٢، ل ٢

دونیایەدا دەژی، تاوەکو گەورەبوو ئەم دونیایە بەلایەوە ئالۆزو پالۆز نەبێ"[172] ئەمەش تەکنیك و هونەری دەربڕینی دەوێ، بۆئەوەی ئەو پەیامەی پێڕابگەێنی. "ئەمە خـالێکی بەدیهییــە کـە شیعر هەرچەندە بەئاهەنگتر و ریتمدارتربێ، قافیەکانی خۆش و سوك بن، زیاتر مەیلی منـدالان رادەکێشێ."[173] بۆیە لەشیعری مندالاندا زیاتر گرینگی بەو لایەنە دەدرێ. کەواتە دەبێ شیعری مندالان "تاحەدی ئیمکان سادەبێ، ئیقاعەکانی رێك و پێك و دووبارەبن، مەقتەعەکانی کورت بن، بۆئەوەی مندالْ بتوانێ لەکورترین کاتدا مۆسیقاکەی کەشف بکات."[174] بەلاّم لەشیعرەکانی تریشی لایەنی مۆسیقای فەرامۆش نەکردووە. شۆڕبوونەوەی لەتیف هەڵمەت بۆجیهانی منـداڵی تەنها شیعری مندالانی پێ تۆمارناکات، بـەڵکو شـیعری دیکـەی لـێ تۆماردەکـات و دەبێتـە هەوێنی دەیان شیعر، ئەم جیهانەی لەتیف هەڵمەت جیهانێکی کەتواری خۆڕسـکە، تـا قـوولتر شۆڕدەبێتەوە و وێنەی جوانتر هەڵدەهێنجێت. لەتیف هەڵمەتی سێوێ، هێندە بێکەسە، ئازیزێك شك نابات بەدەوری کۆتەڵەکەیدا سەردولکەیەکی بۆ بلێ و سەری بۆ لەهەش بگـرێ. ئـەو هــەر دایکی هەبوو ئەوەی بۆ بکات، لێ ئێستا لە بێ دایکیدا، لەوەش مەحروومکراوە. ئەوەتا دەڵێ:

***کە دارێکی سەوز دەبڕنەوە***
***هەزاران پاساری بەدوایدا***
***گریان دەبارێنن وخەمێکی چەور دایان دگرێ***
***بەلاّم کەمن دەمرم...***
***نەدایکم هەیە... پرچم بۆ برنێ و***

---

[172] ) https://niniban.com/fa/news/٣٢٣٥٤ فارسی

[173] ) کامران شرف شاهی، بخش اول، پێنج شەممە، ٢٩ مورداد
http://www.ettelaat.com/etiran/?p=١٤٢٨٣١١٣٩٦

[174] ) شیعری کەکودك دوست، ٢٦ فروووردین، ١٣٩٢
http://www.aftabir.com/articles/subcategory

*بلاوێنێتەوە...*

*نە وێنەیەکیشم لە جانتای کچێکی جواندا*

*بەجێ دەمێنێ...*

*هەموو ئەو کچانەی کە خۆشم دەوێن...*

*ڕوخسارە ناشیرینە جوانەکەم و*

*لەشە لاوازەکەم... لەیاد دەکەن و*

*شیعرەکانم دەخوێننەوە و*

*هەر ناویشم نازانن...* [١٧٥]

لەڕووی هونەری شیعرییەوە، شاعیر خۆی بە دارێکی سەوز دەشوبهێنی و بڕینەوەی دارەکـە، مەرگی خۆیەتی جا سووی لەوە دەبێتەوە کە بیٚ دایکـە و وەك دارەکـە نییـە هـەزاران چۆلەکەی دڵپاك لە خەمی دابن و فرمێسکی بـۆ ببـارێنن. دەسـتەواژەی (*ڕوخسـارە ناشـیرینە جوانەکەم*)، ئاماژەیەکی بێئاگایانەی شاعیر، بۆ هەستێك کە لە دەروونیـدا شـاراوەیە، ئـەویش ئەوەیە، کە لەبەر ئاوێنەدا خۆی بە کەسێکی لاواز و چکۆڵە و ناشیرین دێتە بەرچاو، ئەوەی ئەو ڕوخسارە ناشیرینەی ئەو جوان دەکات لە دڵـی کچـەکاندا شـیعرە ناسـکەکانیەتی، ئەمـە ئـەو ئیحایەشمان دەداتیٚ، کە دەقنووس لە چاوی دایکیدا هەر (جوان بووە و قەت ناشیرینییەکی تێدا نەبینراوە).

لە شاکارێکی دیکەدا، دەقنووس هێندە بەهرەدارانە، پایە و شێوە و جوانی خۆی و دایکی ئاوێتـەی یـەکتری دەکـات و لـە نێـو وشـەکانیدا هەناسـەی حەسـرەتێکی قـوولی بێـدایکی هەڵدەکێشیٚ، (گـوڵ)ی کردۆتە ناونیشانی دەقەکە، خۆی و دایکی خەرمانی گوڵە کێوییـەکانی ئەو شاخ و داخەن، کە پاییزی مەرگ دێت و هەموو ئەو گوڵانە دەژاکێنیٚ، سوورە گوڵێـك، کـە

[١٧٥] ) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٢٧٩

دەقنووسە، تەمەنادەکا لە دەمی داسی ئەو پاییزە ڕزگاری بێ، بەڵام دەمـە داس ئـەوەی وەبـیر دێنێتەوە، کە ژیانێك دوور لە بێ دایکی، هەڵکردن و بەسەربردنی زۆر ئەستەمە.

لێرەشدا دەقنووس ڕادەچڵەکێ و لە جیهانی بێئاگاییدا وەخەبەر دەبێتەوە، دەزانی کە تـازە دایکی ناگەڕێتەوە، دەمە داسی مەرگ سەری ئەو گوڵەی پەڕاندووە، بۆیە ئاواتەخوازە، ڕۆژێـك کچێك بێت و ئەو خۆشەویستییەی بداتەوە. دەقەکە ئاوازدار و ڕتمدار و پڕ جۆش و مۆسـیقایە، کێشـەکەی ئاسـان و سـوارە .("ئیقـاع (ڕتم) کۆمەڵـە دەنگێکـی پێکچـووە لـە نـاو شـیعر دەبینرێت"[176] و چێژ بەخوێنەر دەبەخشێت. شاعیر دەڵێ:

***پایز داسی نا لە ملی خەرمانی گوڵی چیا***
***لە بناری هەورازێکدا...***
***سوورە گوڵێ وتی: بریا***
***لەداسی شووم ڕزگار دەبووم...***
***داس چپەی سوورە گوڵی بیست***
***- گریان مایتەوە بە تەنیا...***
***چۆن هەڵدەکەی بەبێ دایك‌و بێ خۆشەویست ؟***
***گوڵ بزە کەوتە دەمی...***
**- خۆ هەر نەبێ کچێك دەمدا لە پەرچەمی.**[177]

مرۆڤـ هەر بە نان و ئاو ناژیێ ـ مەسیح گوتەنی ـ، هەمیشە گرێیەك لە دڵ و دەروونی ئەو کەسانەدا هەیە تەنیان و نهێنی پارێزێکی دڵسۆز و متمانە پێکراو شك نابەن تا ڕاز و نهێنییـە حەشاردراوەکانی دەروونی خۆیانیان بۆ باس بکەن. خاڵیکردنەوە دەروون لـە مـەراق و وەهـەم و خەیاڵات زۆر پێویستە، بۆیە دەروونناسان ئامۆژگاریمـان دەکـەن، لـە حاڵـەتی شـك نەبـەردنی

(176) [illegible] بغداد ۲۰۰۰، ص۹

(177) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ۱۰۹

کەسێکی گوێڕایەڵی دڵسۆز، بۆ دڵنەوایی، باشترە قسە و ڕازی دڵی خۆمان بۆ ئاوێنە بکەین. بی دایکی بۆ لەتیف هەڵمەت، هەر دابڕان و مەحرووم بوونی ئەو نییە لە باوەش و ماچ و گەمەکردن و قسەی خۆش و بەند و بالۆرەی کوردەواری، بەڵکو خەمە گەورەکە، بە تایبەتی لەم سەردەمە نەزۆك و بێ ئابڕوو و خۆپەرستە، نەبوونی کەسێکی جەرگسۆزە، کە بتوانی ڕازی دڵی لەلا بدرکێنی و نەختێ تەپوتۆزی خەفەتەکان لە دەرووندا داتەکێنێ. پێشتر دایکی نهێنی پارێزی بوو، لێ ئێستا کەسێك شك نابا نهێنییەکانی خۆی پێ بسپێرێ. لەم دەقەدا، کە بازنەکەی کۆمەڵگای شاعیرە، تێدەگەین کە پەیوەندی نێوان دەقنووس و دایکی چەندە توندوتۆڵ و تۆکمە بووە، بەتایبەتی لە نەریتی کوردەواریدا، کەمتر کوڕ بە پێچەوانەی کچ، گرێی ڕازی دڵی خۆی لەلای دایکی دەکاتەوە. ڕەنگ بێ هۆکارێکی ئەو پاڕانەوەی شاعیر لە (ئەستێرەی دوور) تەنیایی و بێکەسی بێ، ئەگەر لە باوەشی دایکی یان خۆشەویستەکەی دا بووایە، خەیاڵی ئەو سەفەرەی نەدەکەوتە کەللە. ئەو لە دەقی (ئەستێرەی دوور) دا دەڵێ:

***ئەی ئەستێرە دوورەکە لەگەڵ خۆتدا ممبە...***

***تا بەرە بەیان...***

***تیشکەکانت نادزم***

***ناگریم...***

***پێناکەنم***

***چۆلەکەی دارستانەکانت ناکوژم...***

***تۆوی بۆمبا لە ژێر پێتدا ناشارمەوە...***

***نهێنی یەکانت***

***بۆ زاناکان ئاشکرا ناکەم...***

***نەدایکم هەیە و***

***نە خۆشەویست***

***تا باسی سنووری تۆیان بۆ بکەم***

*ده لەگەڵ خۆتدا ببە*

*ئەی ئەستێرە دوورەکە...*

*لەو بەرزاییەوە*

*نەختێ سەیری لووتکەکانی*

*وڵاتە دوورەکەم دەکەم...* [178]

شاعیر کاتێ باسی ئەوەدەکات نەدایکی هەیەو نەخۆشەویست، لەو کاتەدا پەنا بۆسروشت دەبات بۆئەوەی بێ دایکی و بێ یارو بێ خۆشەویستی ئەو پڕبکاتەوە، ئەوەتا هانا بۆئەستێرەیەك دەبات و لێی دەپارێتەوە، کە بەهاورێ قبوولّی بکات. بۆئەوەی لەو بەرزییەوە سەیری وڵاتە دوورەکەی بکات، بۆئەوەی لەنێو تیشك و جوانی ئەستێرەکەدا کەمێك ئارام بێتەوە. فایەق بێکەس نزیك لەو بیرۆکەیە، ئەو پەنا بۆمانگ دەبات باسی بێکەسی و کەساسی خۆیو نەتەوەکەی بۆمانگ باس دەکات. بەلای رۆمانسییەکانیشەوە سروشت مامۆستایەکی گەورەیە بۆمرۆڤ.

شاعیری ڕەسەن، مامەڵەی دوڕڕ و مرواری و عەقیق و مەرجان و یاقوت و زمڕووت لەگەڵ وشەی نێو بەیتەکانیدا دەکات، کە سیحر و تەلەسمی نهێنییەکی یان پەیامێکی مەزنی ڕادەست دەکات. لە پیشەسازیی شیعردا، وشە هەیە کلیلە، وشە هەیە قوفڵە، وشە هەیە پەنجەرەیە، وشە هەیە دەریا و زەریایە. دەقنووس لە ئەزموونی شیعرنووسینیدا، تووشی ئەو حاڵەتە بووە، کە وشەیەکی زۆر زەروری لەبەر براوە، یان دەستی پێڕانەگەیشتووە. لەم دەقەدا، شاعیر بە تیرێك دوونیشانەی پێکاوە، یەکیان ئەوەیە، کە ئەو قەدرزانی وشەکانیەتی، لە سەرێکی دیکەشەوە، دەمانباتەوە جیهانی بێدایکی خۆی، کە دەبینین چەندە لە چاوەڕوانی گەڕانەوەی دایکیدا دەسووتێت و چەندە خەمبارە کە دەزانێ ڕۆیشتنەکەی گەڕانەوەی نییە! ئەوەتا لە دەقێکی دیکەدا دەڵێ:

---

[178] ) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ١٢٦

*ئەمڕۆ هەڵبەستێکم نووسی*

*جێی وشەیەك هەر مایەوە*

*هەرچەندم کرد*

*وشە نەهات*

*وشە نەدۆزرایەوە*

*ئەو وشەیە دایکم بوو*

*کە ڕۆی نەگەڕایەوە.* [179]

لەو (٣) بازنەی لەم تەوەرەدا ئاماژەمان پێدا، لە هێندێك دەقدا، دەبینین بازنەکان یەکتری قووت دەدەن، بۆ نموونە لەم دەقەی خوارەوە لە نێو بازنەی ناخی شاعیردا هەر دوو بازنەکەی دیکەی: (بازنەی ماڵەوە و بازنەی کۆمەڵگا) هەیە، چونکە ماڵی دایکی تەنیا لە خەیاڵی ئەودا پاشماوەی کەلاوەکەی ماوەتەوە و کۆمەڵگای دەوروبەریشی هەر لە یەك دوو کەسدا پێکهاتوون:(دەستگیران و کچێك)، ئەوانیش لە جیهانی خەیاڵی دەقنووسدا دەخولێنەوە.

لەم دەقەدا شاعیر دەرگای ئەو ماڵانەمان نیشاندەدات، کە حەز دەکات لەسەفەراندا سەردانیان بکات، لە ڕیزبەندیکەشدا ماڵی (دایك)ی بە یەکەم داناوە، ئەوجا ماڵی دەستگیرانەکەی. کە ئێستا هیچ کامیان لە ژیانی ئەودا نییە. ژیانێك کە ئەو تێیدا خۆی بە غەریب و ئاوارە دەزانێ و بە بۆنی مەرگ پوونگاوەتەوە.

هەر لەم دەقەدا، سەخاوەت و دڵفراوانی دەقنووس لە حەزێکی خنکاویدا دەخوێنینەوە. ئەو ئارەزوویەتی خۆی برسی بکات و شتێك پاشەکەوت بکات بۆ کڕینی دیارییەکی ناوازە، بۆ

---

[179]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٣٢٢

کەسێکی زۆر ئازیز، لێرەشدا سەرقافڵەی ڕیزبەندی کەسە ئازیزەکانی (دایک)ە، ئەوجا دەستگیران و ئەوجا کچێك، هەر کچێك بێ!

دەروونشیکاری دەقەکە، دوو حاڵەتی دەروونی مرۆڤ نمایش دەکات:

- لەکاتی نائارامی دەروونیدا، مرۆڤ هەمیشە حەزدەکات جوولە و هاتووچۆ و پیاسە و سەفەر بکات، ئەمەیش هەوڵێکە بۆ هەڵاتن لەو نائارامییەی کە لەناخیدا جێگیرە، بەجوانی لە شانۆ و سینەمادا ئەم دیمەنانە دەبینرێن.
- مرۆڤ کە شتێکی زۆر سەرنجڕاکێش و دەگمەن و بەهاداری ناوازە دەبینی، حەز دەکات بیکاتە دیاری بۆ ئازیزترین کەسی، وەك هێمایەك بۆ نیشاندانی ڕادەی خۆشەویستییەکەی.

ئەم دوو حاڵەتەش هۆشمەندی و بەئاگایی شاعیر لە کون و کەلەبەرەکانی دەروونی مرۆڤەکان نیشاندەدا.

دەقنووس لە قەسیدەیەکی درێژدا، کە پاژێکیمان بۆ هەڵبژاردوون، دەڵێ:

***هەر چەندێ خەم دامدەگرێ***
***حەز دەکەم سەفەر بکەم***
***بەڵام نازانم بۆکوێ...!***
***خۆ من نە دایکم هەیە و***
***نە دەسگیران...***
***تەم و مژی غەریبی و***
***تەپ و تۆزی ئاوارەیی پرچە ژاکاوەکەم***
***کە بۆنی مەرگی لێ دێ، بتەکێنێ...***
***کە شتێکی جوان دەبینم..***
***کە لەبەر کۆگایەکدا ڕادەوەستم و***
***شتێکی دەگمەن***

*سەرنجی شاعیرانەم، دەدزێ...*

*دەڵێم چەند ژەمێ نان ناخۆم و*

*پارە کۆ دەکەمەوە و دەیکڕم...*

*بەڵام ئای ئاخر بۆ کێی بکڕم...؟*

*خۆ من...*

*نە دایکم هەیەو...*

*نە دەسگیران...*

*نە کچێکیش داوای دیارییەکم*

*لێ دەکات...!* [180]

مامەڵەکردنی دەقنووس لە گەڵ وشەی(دایك)، سنووری سۆز و وەفاداری و دایکایەتی تەقلیدی کۆمەڵگا بەزاندووە، بەو واتایەی ئەو دایکی خۆش ناوێ، چونکە هەر سۆزداری بووە و دایکانە ماچی کردووە و کەمەگەی لەگەڵ کردووە، بەڵکو والآکردنی دەرگاکانی نووسین و بەئەزموونکردنی ئەو کائینە پیرۆزە لە دەقە شیعرەکانیدا، ئیحای ئەوەمان دەداتێ، کە دایك لە دیدی ئەوەوە یەکسانە بە شیعر، کەواتە تەوزیفکردنی دەبێ کارامانەو و پیشەوەرانە بێ. ئەو شاکارەی ئەو حەز دەکات بیکاتە شاڵێك و بیخاتە سەر شانی دایکی، چونکە ئەو شاعیرێکی دەست کورتە، خۆ بە ئەو ناکرێ گومبەزەکەی (تاج محل) لەسەر گڵکۆی دایکیدا هەڵێنێ، ئەو هەر شیعر شك دەبا بیکاتە ئەو گومبەزە دیار و شکۆدارە، دیارە گومەزی شیعر زۆر لە گومەزی زێڕو زیو بەبەهاترە.

*(دەو)*

*لەناو ژوورەکەمدا*

*ژوورێکی دی هەیە*

---

[180]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٣٠٥

*له ژووره‌كه‌ی دیشدا*

*ژوورێكی دی هه‌یه*

*له‌ناو ئه‌و ژووره‌شدا*

*ژوورێكی دی*

*له‌ناو ئه‌و ژووره‌ی دیشدا*

*ژوورێكی دی...*

*ژوور*

*ژوورێكی دی*

*ژوور ژوور*

*ژوور*

*ژوورێكی دی و*

*ژوورێكی دی و*

*ژوورێكی دی و*

*ژوور*

*ژوور*

*ژوور*

*ئه‌م هه‌موو ژووره*

*ده‌كه‌مه‌وه*

*دایكم*

*له هیچ ژوورێكدا نییه...* [١٨١]

[١٨١] ) دیوانی له‌تیف هه‌ڵمه‌ت، ل ١٣٧١ ـ ١٣٧٢




تۆپۆگرافیای ئه‌م ده‌قه‌، بۆچوونه‌كه‌مان پشتڕاست ده‌كاته‌وه‌، چۆن؟ ده‌قه‌كه‌، كه‌ ناونیشانی (ده‌و)ی بۆ هه‌ڵبژاردووه‌ (٤٧) وشه‌یه‌ به‌ڵام هه‌ر به‌ (٩) وشه‌ نووسراوه‌، كلیلی ده‌قه‌كه‌ وشه‌ی (ژوور)ه‌ كه‌ (١٩)جار پات بۆته‌وه‌. ئه‌و گه‌ڕان و سۆراغه‌ی ده‌قنووس به‌ دوای دایكیدا، له‌م ژوور بۆ ئه‌و ژوور و كردنه‌وی قوفڵی (١٨) ده‌رگا، ئاماژه‌یه‌ كه‌:

- شاعیر واده‌زانێ دایكی لێ ون بووه‌ و جنگڕانه‌ به‌ دوایدا ده‌گه‌ڕێ.
- شاعیر ده‌زانێ دایكی مردووه‌، لێ جیهانی بێ ئاگایی ئه‌و، ئه‌و ڕاستییه‌ قبوڵ ناكات.
- كردنه‌وه‌ی (١٨) ده‌رگا، ده‌كرێ وه‌ك هێما بۆ ته‌مه‌نی (١٨) ساڵی ده‌قنووس ڕاڤه‌ بكرێ كه‌ هه‌نگێن یان نزیك له‌وته‌مه‌نه‌ دایكی كۆچی كرد .(ساڵی له‌ دایك بوونی ده‌قنووس ته‌می له‌سه‌ره‌: ١٩٤٦؟، ١٩٤٧؟، ١٩٤٨؟)
- ژوور به‌ تایبه‌تی ئه‌گه‌ر له‌ناو یه‌ك بێ، هه‌میشه‌ وه‌ك سندووقێكی داخراوه‌، بۆیه‌ گه‌ڕان و پشكنینه‌كه‌، كردنه‌وه‌ی ئه‌و هه‌موو سندووقه‌یه‌، ئه‌مه‌یش سیمای حیكایه‌تی به‌رئاگردانی كورده‌واری پێوه‌ دیاره‌.

له‌ شاری كه‌ركووك، دایكێك، كه‌ تاقه‌ كوڕه‌كه‌ی له‌ شه‌ڕی عیراق ـ ئێران بێ سه‌روشوێن ده‌بێ، ڕۆژانه‌ ده‌ دوازده‌ جاران به‌ په‌یژه‌ هه‌ڵده‌گه‌ڕێ و ده‌چێته‌ ژووری كوڕه‌كه‌ی له‌ نهۆمی دووه‌می ماڵه‌كه‌یدا، به‌و ئومێده‌ی بیبینێ، له‌كاتێكدا، ئه‌و دایكه‌ ده‌زانی كه‌ كوڕه‌كه‌ی له‌به‌ره‌ی جه‌نگ نه‌گه‌ڕاوه‌ته‌وه‌، ئه‌مه‌ش وه‌ك گه‌ڕانه‌كه‌ی له‌تیف هه‌ڵمه‌ته‌ له‌م ژووره‌ و بۆ ئه‌و ژوور به‌ دوای دایكیدا.

پرسیارێك: ئاخۆ دوای كردنه‌وه‌ی ده‌رگای هه‌ژده‌مین ژوور، شاعیر ڕاده‌ستی قه‌ده‌ر ده‌بێ و ده‌سته‌وه‌ستان داده‌نیشێ، یان له‌ سۆراغكردن و گه‌ڕانه‌كه‌ی به‌رده‌وام ده‌بێ؟ وه‌ڵامی پرسیاره‌كه‌ له‌ ده‌قێكی دیكه‌ دایه‌ به‌ ناوی (ئه‌ڕۆم)، كه‌ ده‌ڵێ:

*ئەرۆم دایە*

*ئەگەر ئیتر نەهاتمەوە*

*دەبم بە گوڵ لەو چیایە*

*ئەرۆم دایە*

*ئەگەر ئیتر نەهاتمەوە*

*لە هەر خاکێ زۆردار بژی*

*لەوێ دەبم بە بۆمبایە*

*ئەرۆم دایە*

*ئەگەر ئیتر نەهاتمەوە..*

*ئەبم بە بستێ زەوی*

*بۆ دنیایەك گەورەترە لەم دنیایە..*

*ئەرۆم دایە*

*ئەگەر ئیتر نەهاتمەوە..*

*گیانم دەبێ بە ڕەشەباو*

*بە شوێن تۆدا دەدا لە گشت دەرگایە*

*ئەرۆم دایە*

*ئەگەر ئیتر نەهاتمەوە*

*گیانم وشەی*

*گشت شاعیرێکی ئازایە...* [١٨٢]

شاعیر لەگەڵ دایکی خۆی دەدوێ، لەڕێی زمانی شیعرییەوە ڕۆدەچێتەوە ژیـانی منـداڵی بەدایکی رادەگەێنێ، کە ئەو دەیەوێ ئەو کارانە ئەنجام بدات، لە هەموو سـەرە کۆپلـەکان وەك مۆسیقایەکی شیعری تەنها هەواڵەکان بەدایکی رادەگەێنێ و بۆشی ڕووندەکاتەوە، کە لـە هـەر

[١٨٢] ) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ١١٩

ڕۆیشتنێکدا چ مەرامێکی هەیەو دەیەوێ چی بکات. واتا دەقنووس دایکی دەدوێنێ و مووژدەی ئەوەشی پێدەدا، کە بەدوای قامتێك شتی جوان جواندا دەگەڕێ، وەك: (*گوڵ، بۆمبای دژە زۆردار، بستێك زەوی بۆ دنیایەکی گەورەتر*)، دایکیشی یەکێکە لەو شتە جوانانەی کە ئەو بەدوایدا وێڵ و سەرگەردانە.

لە دەقی (*ئەی دایە گیان*)، شاعیر هۆگری و سەوداسەری خۆی بە دوای ئەودا، لە (٣) وێنەی هونەری جیاوازدا نیشاندەدا، بەو مرازەی هەم خۆی و هەم ئەو دڵنیا بکاتەوە، کە بڵێسەی خۆشەویستی نێوانیان نەکوژاوەتەوە، هەرچەندە ئەو چاك دەزانێ کە دایکی لەم دنیایە بزر بووە، لێ لەو باوەڕەدایە کە ناشتنی ئەو ناشتنی، ڕۆحی ئەو نییە.

لەتیف هەڵمەت، خۆی دەکاتە (سەگ)، وەك گیانداریکی زۆر بەبۆن، لە گەڕان بەدوای کەسێك غەیری (خودا و دولبەر)، ئەویش دایکییەتی.[183] گەڕان و تەعقیبکردنی سیخوڕەکانیش بە دوای شاعیراندا، بەئەرشیفکردنی سەردمی پێش ڕاپەڕینە لە کوردستاندا، لەتیف هەڵمەت بۆ خۆی یەکێك بوو لە قوربانییەکانی کە بە دەستی سیخوڕەکانی بەعس ئازاری دەکێشا.

هەر (٣) وێنە هونەریەکە، ڕژدی و جنگڕیی شاعیر نیشاندەدەن لە شێوازی گەڕانە نائاساییەکەیدا بە دوای دایکە ون بووەکەیدا. ئەو دەڵێ:

***ئەی دایە گیان.. من دوات دەکەوم***
***وەك ئەو سەگانەی***
***دوای بۆنی نانی گەرم و***
***گۆشت...***

---

[183] ) لە ئەدەبی کلاسیکی کوردیدا، لە چەندان دەقدا، خۆ بە سەگ کردن و خۆ بە سەگ زانین بەئەرشیڤکراوە، بۆ یەکێك لەو دوو مەبەستە: (١) بۆ خۆ بەکەم زانینن و خۆ بە گوناهبارادانان بەرانبەر یەزدانی مەزن و بەخشندە. (٢) بۆ بەرزکردنەوی مەقام و پێگەی دولبەر، لەبەرانبەردا، خۆ بە بچووك دانان و مەرایی کردن لەبەر قاپی ئەودا، بە نیازی موحیبەت نیشاندان و ئولفەت و ویساڵ. (نووسەران)

*دەکەون...*

*وەك چۆن شیعر...*

*دوای دڵم...*

*دەکەویێ...*

*وەك چۆن سیخورەکان*

*دوای شاعیر دەکەون...* [١٨٤]

ئەگەر کۆچکردنی دایك، بۆ زۆر کەس هەر دەستە نوێنێکی چۆڵ و حەوشە و هەیوانێکی بێ هات و بات و سێر وخوانێکی ساردوسڕ و بێشکەیەکی بێ لایەلایە، لە پاڵ کوژانەوی سۆز و خەونەکان، بەجێبهێڵێ، ئەوا بۆ لەتیف هەڵمەت جگە لەوانە، بێ دایکی، ئەنفالکردنی عەشقێکی پیرۆز و خوداوەندیی نێوان ئەو دووانەیە. دەستەواژەی (*عەشقی من و دایکم*) هونەرمەندانە دارِشتراوە و دەکرێ (٣) ڕاڤەی بۆ بکرێ: (١) زیندە بەچاڵکردنی عەشقی نێو دڵی شاعیر، (٢) کوژانەوەی عەشقی دایکی ئەو، (٣) دامرکاندنەوەی عەشقی نێوان ئەو دایك و کوڕە. لێرەدا، هەست دەکەین کە بێدایکی کەلێنێکی چەند گەورەی لە ژیانی شاعیردا دروستکردووە. عیشق پتر لە نێوان دڵدار و دولبەرە، کەچی دولبەرەکەی شاعیر لێرەدا دایکە، ئەمەیش زۆر بە دەگمەن لە شیعری کوردیدا دەبینرێت!

بڕوانە لە دیدی شاعیرەوە، ڕۆژی کۆچکردنی دایکی ڕووداوێکی مێژووییە، هەرچەندە ئەو کەسێکی ئاسایی بووە لە مێژووی کورددا. لەلایەکی دیکە زیندەبەچاڵکردنی عەشقەکەی خۆیانی لە پێش مردنی وڵاتەکەی داناوە. پەیامەکە ئەوەیە:

**بێدایکی = ژیانێك خاڵی لە عەشق.**

---

[١٨٤] ) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ١٢٧

دەقنووس دەڵێ:

***ڕۆژێك لە ڕۆژەکانی هەفتە***

***خۆی شاردەوە***

***گەلێ ڕووداوی مێژوویی***

***زیندەبەچاڵ کرا***

***لەوانە عەشقی من و***

***دایکم.. (هەروەها مردنی وڵاتەکەم)*** [185]

چەندان دەقی دیکەی (بێداکی)مان لەبەر دەستە کە شاعیر بە ستایل و هونەری جیاواز تێیاندا گوزارشت لە لێکەوتەکانی باری دەروونی و ژینگەیی و شیعریی خۆی دەکات. لەم دەقەی خوارەوە، کە لە یەکەم بەرهەمیدا (خوا و شارە بچکۆڵەکەمان)دا بڵاوی کردۆتەوە، شاعیر یەکەمین وێنەی هونەریی هەتیووی خۆیمان بۆ دەکێشێت. دەقەکە دەلالەتە کە بێ دایك و باوکی لە سەرەتای هەرزەکاری ئەودا، چەندە بەربەستی گەورە و بارگرانایی و قورس بوون، کە هێنانەدێ خەونە پەمەیەکانی ئەویان سست کردۆتەوە و لەمپەریان لەبەردەمدا دروست کردووە. جا (بێ یار)یش دەکاتە سەرباری بێ دایك وباوکی، هێندەی دیکە خۆی بێکەس و بێ پشتیوان و بێ هاودەم و بێ هاوخەم دەبینی، لە کاتێکدا، وەك شاعیرێکی لاوی خوێن گەرم و تازە پێگەیشتوو سەدان خەونی جوان جوانی لە هەگبەدا بە شانی خۆی داداوە و حەز دەکات وەك چۆلەکە بیان گرێ. هەرچەندە شاعیر ئەوکاتەی کەدایکی مردووە، باوکی هەبووە. ئەی بۆچی نوسیویە بۆ باوکی، کوردەواری دەڵێت ئەگەر دایك نەما زڕ دایك پەیدابوو ئەوا باوکیش دەبێتە زەڕباوك، لەو دەقەدا ساتەوەختی خەم و ئازارەکانی خستۆتە ڕوو. واتا نەبوون و لەدەستدانی دایك تەرازووەکەی سەنگەلا دەبێتەوە و تەنانەت باوکیش لەو ئان و ساتەدا لە باوکایەتی دەکەوێت و ئەوەتا دەڵێ:

---

[185] ) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ١٠٦٦

*بۆ یەکەمجار... بۆ یەکەمجار*

*ئەنووسم داستانی دوو دڵدار*

*بەبێ دایك بەبێ باوك بەبێ یار*

*ئەگەڕێم بۆ شوێن پێی بەهار*

*من ئەمەوێ ئاگرەکەم گەشاوە بێ*

*من ئەمەوێ فرمێسکەکەم هۆنراوە بێ*

*من ئەمەوێ ڕوخسارەکەم*

*تابلۆیەك بێ... تیا بکێشرێ*

*وێنەی خەمی شارەکەم*

*من ئەمەوێ خۆشەویستی وەك ئاو، وەك نان،*

*وەکو باران*

*دابەش کرێ لە شەقام و ماڵ و کۆڵان.* [١٨٦]

مردنی دایك و مردنی باوك و نەبوونی یار چۆك بەشاعیر دانـادا، بـەڵکو عـەزم و توانـاو تێهەڵچوونی زیاتر دەکەن، چونکە لەو نەهامەتیانەدا، شاعیر بەشوێن پێی بـەهار دا دەگـەڕێ، بەهاریش مەدلولی گەشبینی و حەزکردن لـەژیان دەگـەێنێ. لـەڕێی ئـەو هیـزەی کـە لـەناخی شاعیردایە، دنـەی شـاعیردەدا کـە (ئاگرەکـەی گەشـاوەبێ) و خـامۆش نەبێتـەوە. دەشـیەوێ لەبەرهەمی خەم و فرمێسك هۆنراوە بهۆنێتەوە. وەك چۆن دروست کردنی هەرشـتێك پێویسـتی بەکەرەستە و مادەی خام هەیە. لە دوا وێستگەی شیعرەکە خەمە گەورەکـەی شـاعیر ئەوەیـە، کەوا خۆشەویستی بکاتە بنەماو بناغەی کارەکان و بەهای خۆشەویستی لای هەموو کۆمـەڵگا دروست ببێ. دەکرێ ئەو دەقە، لە ژییاننامەی شـاعیردا، وەك یەکـەمین مانەفێسـتی شـیعری مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ، لە ڕاستیشدا ئەو (٤٧) ساڵەی تەمەنی شاعیریی، پیشانمان دەدات کە ئەو چەندە ڕاسـتگۆ بـووە لـە جێبـەجێکردنی بڕگـەکانی مانەفێسـتەکەیدا، وەك هەوڵـدان بـۆ

---

[١٨٦] ) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٦٨

نووسینەوەی داستانی دڵداران و داگیرساندنی ئاگرێکی گەشاوە ـ کە ڕەمزە بۆ شۆڕشی شیعریی و گۆڕینەوەی فرمێسکەکانی بە هۆنراوە و کێشانی وێنەی خەمی شار لەسەر ڕوخساری خـۆی و بەشینەوەی خۆشەویستی بەسەر هەموو مرۆڤەکاندا جا لە هەر شوێنێکی سەر ئەم زەمینە بـن. لە قەسیدەی (هەوڵدان بۆ بەرجەستەکردنی ئەفسانەیەك) شاعیر دەڵێ:

*سەیری هەر گوڵێك دەکەم*
*دوو چاوی شین سیخناخم دەکەن*
*لە هێشووی سەرنج*
*ڕەنگە چاوی دایکم بن*
*هەر هەورێك دەکەوێتە تۆڕی نیگامەوە*
*بە دوو دەست باوەشم پیادا دەکات*
*دەڵێم دەستەکانی دایکمن*
*هەر ئەستێرەیەك دەخزێتە ئاوێنەی*
*تەماشامەوە*
*بە دوو لێو دەمگرێ لە ئاوریشمی پێکەنین*
*دەڵێم لێوەکانی دایکمن*
*بە لای هەر ڕووبارێکدا تێدەپەڕم*
*ماچبارانم دەکات*
*ماچەکانی بۆن و بەرامەی هەناسەی دایکمیان*
*لێ هەڵدەقوڵێ*
*بە لای هەر درەختێکدا گوزەر دەکەم*
*بانگم دەکات*
*ڕەنگی دەنگی لەدەنگی دایکم دەچێ*
*بە منداڵی من یەك دایکم هەبوو*

*ئێستا هەزاران*

*نازانم شەوان*

*لەباوەشی کامیاندا بنووم.* [187]

لە شیعری تەسەوف، شاعیر بۆئەوەی لە جوانی خودا نزیك بێتەوە و هەست بەجوانییەکانی خودا بکات، پەنا دەباتە بەر جوانییەکانی سروشت، لە ڕێی ئەوەوە جوانی خودا دەبینێ. بۆئەوەی سوکنایی بێت و ئارام بێتەوە. ئەوەتا (بابا تاهیری هەمەدانی)ش شیعری لەم شێوەیەی هەیە، کە ڕووی خوداوەند لەچەندان تابلۆ دەبینێ و لەهەموو شوێنێکەوە دەورەی داوە و هەستی پێدەکاو ئاوێتەی شتەکان بووە، لەشیعرێکی دا دەڵێ:

**بەدەریا بنگرم دەریا تو وینم**

***بەسەحرا بنگرم سەحرا تووینم***

***بەهەر جا بنگرم کۆه و دەر و دەشت***

***مەگەر ئان دەم کە زیبایی تو وینم*** [188]

واتا سەیری دەریابکەم یان بەدەریا دا بگەڕێم تۆدەبینم، بە بیابانیش دا بگەڕێم تۆدەبینم، بەهەرشوێنێك دابگەڕێم لە کێو دەرو دەشت، هەر شێوە جوانەکەی تۆ دەبینم ــ کە مەبەستی خودایە.

(لەتیف هەڵمەت)یش، لەنێو پێکهاتەکانی سروشت دایکی دەبینی، بەڵام لەنێو سروشتدا هەر شتەی بە بەشێك لەجەستەی دایکی یان بە ئەندامێکی دایکی داناوە، ئەوەتا لە بینینی گوڵ چاوی دایکی دەبینێ. بینینی هەور تەشبیە دەکات بەدەستەکانی دایکی، ئەستێرە لێوی دایکییەتی. ڕووبار کە ڕەوتی ڕۆیشتن و ژیانی تێدایە هەناسەی دایکی لەناویدا دەبینێتەوە.

---

[187]) لەتیف هەڵمەت، ئایەتە ونبووەکانی سەدەی بیست ویەك یا سووڕەتی گەڕانەوە بۆ منداڵێتی، چ١، چاپخانەی ڕەهەند، ٢٠١٧، ل ٢٦

[188]) د. مارف خەزنەدار، مێژووی ئەدەبی کوردی، ب١، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٠، ل ٢٣٤

لەبینینی درەختەکانیش دا وادەزانیٚ ئەوە دایکیٚتی بانگی دەکات. دواتر پارسەنگیٚکی دەروونی بۆخۆی دروست دەکات. بەوە کە دەڵێت: (*بەمنداڵی یەك دایکم هەبوو، ئێستا بەهەزاران*)، ئەمەش چەند مەدلوولێك لەخۆی دەگریٚ، لەوانە، **یەکەم:** جیهانی منداڵی جیهانێکی سنووردار بوو، ئێستا لە جیهانێکی گەورەتر دەژی و لێکدانەوەی وردتر و زۆرتری هەیە بۆژیان. **دووەم:** هەست دەکا هەموو پێکهاتەکانی سروشت دایکیەتی، کەواتە ئەو خاوەنی هەزاران دایکە. **سێیەم:** بەو واتایەش دیٚ، کە عیشقی ئەو فراوانتر بووە، ئەو دایکی حەقیقی خۆی هەیە، پێکهاتەکانی سروشت دایکی ئەون. ئەو خاوەن نیشتمانە، نیشتمان دایکی ئەوە. ئەو خاوەن بیرو لێکدانەوەیە، کەواتە دایکەکانی زۆرن. بۆهاوسەنکردنەوەی لایەنی دەرونیش. وەك ئەوە وایە کەسێك شتێك لەدەست بدات و دڵی خۆی بداتەوە و بڵیٚ من زۆر شتی ترم هەیە. بەو واتایەی کە ئەو دایکەی جاران هەمبوو. ئێستا هەزار هێندە گەورەترو مەزنترە لەلام. لەتیف هەڵمەت لە دەقەشیعری (ڕووداوەکانی ناو تەنیایەکی قەڵەباڵغ) دا دەڵیٚ:

*من تەنیا نیم*
*ڕێگایەك خوشکمە*
*من هەر خۆم نییە*
*وشەیەك دڵخوازمە*
*من یەك کەس نیم*
*نیگەرانییەك هاودەممە*
*من بیٚ ناز نیم*
*هەورێك دایکمە*
*من لەتاراوگەیەکدا نیم*
*خەون و ئەندێشە و خۆم*
*هەمیشە دڵم قەرەباڵغ دەکەن*

***

*من هەر تەنیا من نیم*

*ڕێگاو*

*وشە و*

*نیگەرانی و*

*هەور و*

*خەون و*

*ئەندێشە و*

*خۆم*

*هاوڕێمن...*[189]

ئەمجارەیان شاعیر ڕۆدەچێتەوە نا پێکهاتەکانی سروشت دڵنەوای خـۆی دەداتـەوە و هـەر شتێکی سروشت تایبەت دەکات بەشێك و خەمی خۆی پێ دەڕەوێنتـەوە، بـەڵام لـەم شـیعرەدا تەنها لەڕێی سروشتەوە هەستەکانی خۆی دەرنـابڕێ، بـەڵکو تێکـەڵی مەشـاعیرەکانی خۆشـی دەکات، ئەوتا ڕێگا دەبێتە خوشکی و لەپاڵ سروشت وشە دەبێتە دڵخوازی، نیگـەرانی دەبێتـە هاودەمی، هەورێك دەبێتە دایکی و خەون و ئەندێشەش دڵی قەڵەباڵغ دەکەن. شـاعیر لـە پـاڵ هێنانەوەی وشەی: (*ڕێگا، وشە، نیگەرانی، هەور، خەون، ئەندێشە، خۆم*) دواتر دەڵـێ: ئەمانـە هاورێی منن. (خۆم و من)دوو خودن لە یەك خود دا. زۆر جار لەتیف هەڵمەت لە شـیعرەکانیدا ئەم شێوازە بەکار دەهێنێ.لە وەتا لەو شیعرە دا دەڵێ:

*من و خۆم*

*لەسەرمدا شەریانە وەك:*

*تاریکی و مۆم*

*خۆم و من*

*لەدڵدا دۆستن وەکو:*

---

[189]) لەتیف هەڵمەت، ئایەتەکانی سەدەی بیست ویەك، ل ٢٨

***ئاوێنە و ژن.*** [190]

شاعیر زۆرجار خۆی دەکات بە چەند کەسێك، واتا لەخودی یەك کەس دا چەند کەسایەتییەك دروست دەکات. وەك: من و خۆم.

پووختەی تەوەرە:

بە پشت بەستن بە تیۆرییەکانی دەروونی و ڕەخنەی ئەدەبی سەردەم، لەم دەقانەی ئاماژەمان پێدان، دەگەینە ئاکامێکی ناخۆش و دژوار، کە دەکرێ لەم چەند دێڕەدا چڕیی بکەینەوە: بێدایکی بارێکی دەروونی نائاسایی قورسی لە زەین و هزر و هۆشی شاعیردا خولقاندووە، کە لە دوو هەواری دژ بەیەك یان دوو گوزارشتی پەرادۆکسییدا خۆیان نیشان دەدەن:

**یەك:** شاعیر دەزانێ بێدایکە، دەزانی دایکی لەسەر زەوی نەماوە، بەڵام دەیەوێ بیدۆزێتەوە تا ئەو بۆشاییە پڕ بکاتەوە، کە لە ئاکامی بێداکیدا لە ناخیدا سەری هەڵداوە.ئەو هەست کردن بەبێ دایکییە کەموو کوڕییەکە لەژیانی، تیۆرەکەی (ئەدلەر)باس لەوە دەکات، کە ئەدیب و شاعیران، لەهەوڵی پڕکردنەوەی نەقس و کەم و کوڕییەکانی ژیانی خۆیانن و لەدەقە ئەدەبییەکانیاندا رەنگ دەدەنەوە.

**دوو:** شاعیر دەزانێ بێدایکە، لێ نەك باوەڕ ناکات کە لەژێر خاکە، بەڵکۆ دەیەوێ قەناعەت بە پەیامگریش بێنێ، کە کۆچکردنەکەی وەهەمە، بۆیە دەبێ لە گەڕان و سۆراغکردنیدا سڵ نەکاتەوە تا دەیدۆزێتەوە.

لە هەردوو حاڵەتەکەدا، بۆ سۆدرەی سەران، دێرە شیعرێك نادۆزینەوە، بۆن و بەرامەی سەردولکە و لاواندنەوە و گریان و فیغانی تێدا بێ، ئەو زیرەکانی پتر کاری لەسەر ستایلە هونەرییەکە و زمانە شیعرییەکەی خۆی کردووە بۆ گەیشتن بە ئارامی ڕۆحی و دڵنەوایی دەروونی، سەرکەوتووانەش بە مەرامەکەی گەیشتووە. لێ ناتوانین لە کاتی خوێندنەوەی

[190] ) لەتیف هەڵمەت، شیعری دژە شیعر یا یارییەکی کۆن و نوێ، چ١، چاپخانەی رەهەند، ٢٠١٤، ل ٨

دەقەشیعرەکان، بەزەیی پێداهاتنەوەی خۆمان بۆ شاعیر نیشان نەدەین کە هەست دەکەین لە بێدایکییەدا ئەو لە چ عەزابێکدا دەژی!

( ٤ )

## منداڵە ـ پیاوەکە

هەموومان لەسەرەتای تەمەنماندا، منداڵ بووین. منداڵ، مناڵ، مندار، زارۆك، ڕۆڵە، فرزەندیشی پێدەڵێین.[١٩١] لە فەرهەنگی زمانەوانی و بایەلۆژی و دەروونناسی و کۆمەڵناسیدا، پێناسەی جیاوازی بۆ کراوە، ئەوەتا لە فەرهەنگی ئۆکسفۆردی ئینگلیزیدا هاتووە:" منداڵ: ١) مرۆڤی تازە پێگەیشتوو لە خوار تەمەنی هەرزەکاری یان تەمەنی باڵق بوون دەگرێتەوە، ٢) کوڕ یان کچ، جا هەر تەمەنێك بن، ٣) کەسی بێ هۆش و گۆش یان نابەرپرس، ٤) کەسی بێ ئەزموون لە بوارێکی دیاریکراودا، ٥) نەوەی خێزان یان خەڵك.[١٩٢]

لە ڕووی بایەلۆژییەوە. منداڵ مرۆڤێکە لە نێوان ڕۆژی لەدایك بوون تا دەگاتە هەرزەکاری. هەرچی زانایانی دەروونناسییە دەڵێین: منداڵ بونەوەرێکە پێکهاتە و خەلقی تەواو و

---

[١٩١]) هەنبانە بۆرینە، هەژار، تهران، ١٣٨٤، ل٨٤٣

[١٩٢]) https://en.oxforddictionaries.com/definition/child

تەكمیلە، بەڵام نەگەیشتۆتە هەرەتی پێگەیشتن و باڵق بوون. بۆیە هەرچەند ئەو بوونەوەرە زیرەك و بەهرەمەند و بە توانا بێ هەر وەك منداڵ سەیر دەكرێت.[193]

بەڵام لە جارنامەی مافی منداڵدا، كە لە ساڵی (١٩٩٢)، لە لایەن نەتەوە یەكگرتووەكان، بەیانكراوە و (١٤١) بەندە، دەڵێ:"منداڵ مرۆڤێكە هێشتا نەگەیشتۆتە قۆناغی هەرزەكاری"،بەبێ ئەوەی سەرەتای تەمەنی هەرزەكاری دیاری كردبێ. كە لە زۆر كومەڵگادا (١٨)ساڵیان بۆ داناوە.[194]

بەهەر حاڵ، لەدیدی ڕشتەی فەلسەفە و ئەدەب و كۆمەڵناسیدا، قۆناغی منداڵی، بە مانگ و ساڵ دیاری ناكرێت، بەڵكو وەك حاڵەتێكی یان دیاردەیەكی تایبەتمەندیی مرۆڤ سەیر دەكرێت كە هەمیشە كراوەیە. بە واتایەكی دیكە، سەردەمی منداڵی دوای تێپەڕاندنی كاتی دیاریكراویشی، بەردەوام بوونی لە ژیانی مرۆڤدا هەر هەیە، وەك بڵێت منداڵی پێكهاتەیەكی (جین Gen)نی خۆی هەیە لە بایەلۆژیای مرۆڤدا، كە تا مردن لەگەڵیدایە. هەر لەسۆنەگەی ئەو بۆچوونەوە، لێرەدا چەمكی (منداڵە ـ پیاوەكە)مان داڕشتووە. بەو واتایەی كە مرۆڤە بالغەكان هەمیشە ماك و توخمی منداڵیان تێدایە، هەر وەك شیاویشە كە بڵێین منداڵەكانیش بە شێوەیەك لە شێوەكان ماك و توخمی مرۆڤە پێگەیشتووەكانیان تێدا بەدی دەكرێ.

خاڵی بایەخدار لێرەدا ئەوەیە، كە دەبێ لە ئەدەبدا، جیاوازی لە نێوان خەیاڵ و بیركردنەوەی منداڵانەدا بكەین.

هەرچی هزر و بیرۆكەی منداڵانەیە، خەیاڵ نییە، بەڵكو تێڕوانین و سەرنج و بینینی منداڵە بۆ جیهانی دەووروبەری، بە گوێرەی ئاست و بیركردنەوەی ئەو لە تەمەنێكی دیاریكراودا. لە

---

[193] سایكولوجیة الطفل. الفت حقي، مركز الاسكندرية للكتاب، ١٩٨٦، ص. ٣١

[194] http://www.ohchr.org/Documents/ProfessionalInterest/crc.pdf

جیهانی ئەدەبیشدا، شاعیر پتر لە قەڵەم بەدەستەکانی دیکە، مامەڵـە لەگـەڵ ئـەم دوو جیهانـە دەکات: جیهانی خەیاڵ و جیهانی سەردەمی منداڵی.

شاعیرانی کورد، کەم تا زۆر، وەك شاعیرانی نەتەوەکانی دیکە، لە شـیعرەکانیاندا، کاریـیـان لەسەر قۆناغی منداڵی خۆیان کردوە، ئەوەی لە شیتەڵکاری دەقـەکانی لـەتیف هەڵمەتـدا، لـەم بوارەدا، سەرنج ڕادەکێشێت، و کەمتر لە بەرهەمی شاعیرانی دیکەی کورد دەبینرێـت ئـەم (٤) خاڵەی خوارەوەیە:

- لە ئاماژەکانی بۆ دایك، لێرەدا، دەقنووس بەئاگایانە کاری کردووە، لە زۆربەی دەقەکانـدا، وەك کەسێکی زیندوو ئەو نائاخاوێنیٚ، چونکە دەزانی کۆچی کردووە.
- شاعیر، یادەوەرییـەکانی سـەردەمی منـداڵی، وەك بیرەوەرییـەکانی خـۆی دەنووسـێتەوە و بـە ئەرشیفیان دەکات. ئەمەیش بیرتیژی ئەو نیشان دەدات.
- ڕووداوەکانی ئەو سـەردەمەی وەك کەرەسـتەیەکی بەبرِشـت و وزەبەخشـی، لـە چـەندان دەقـدا تەوزیفکردوە و زۆر کەلێنی پـیٚ پڕکردۆتـەوە و پـەیامی سیاسـی و ئـەدەبی و فەلسـەفی خـۆی گەیاندووە.
- لەنێوان جیهانی سەردەمی منداڵی و جیهانی دوای هەرزەکاری، لە هاتووچۆدایە، بـە شـێوەیەك جار هەیە لە یەك دەقدا هەم منداڵە و هـەم پیـاوە. جیهانـەکانی نێـوان بـەئاگایی و بێئاگـایی ئاوێتەی یەکتری کردووە.

تا پووختەتر، وردەکاری ئـەو خاڵانـەی سـەرەوە ڕوون بکەینـەوە، ئـەم (چـەند) دەقـە، کـە پەیوەستن بە ناونیشانەی تەوەرەکە، شیدەکەینەوە.

لەتیف هەڵمەت لەم دەقەدا دەڵیٚ:

***ئەگەر شەویٚ گیانی ماندووت لە تاریکی جاڕست بوو...***
***ویستت وەکو جاری جاران...***
***بمکەیتە باوەش دایە گیان***
***ڕەنگە ئێستا کوڕەکەی خۆت هەر نەناسی***

ڕەنگە بڵێی ئەمە ئەو کوڕە هارەیە

ئاوی دەبڕی لە ماسی...؟

دەرگاو پەنجەرەی دەشکان...

بەدیواردا هەڵدەگژاو

جل و بەرگی خۆی دەدڕان...

خۆمن ئێستا کەمناڵ نیم...تالاساریم

ئەی دایەگیان

لاساریش بم... چۆلەکە بەردباران ناکەم و

سەری ڕێبوار ناشکێنم و

بەرد نادەم لە دەرگای ماڵە دراوسێکان...

بەدوای کۆلاریەکدا

ڕاناکەم سەربان و سەربان...

گوێزو هەنگوین لە ژێر شقەڵەتەکەماندا نادزم و

نایبەم بۆ مناڵانی کۆڵان...

لە بەردەگای ماڵدا ئاگرناکەمەوە و

شەڕناکەم لە گەڵ مناڵان...

ئێستا ئەگەر لاساریشبم

جیاوازم لە جاری جاران...

ئەو بەردەی چۆلەکەم پێدەکوشت

ئێستاکە بۆ چاوی دوژمنی دەهاوم...

جاران هەر تۆم خۆش دەویست

دایە ئێستا من گەورەم و عاشقی دار و بەردی ئەم وڵاتەو

بەفری لووتەکەو هەتاوم...

لە هەر شوێنێ لە بەهەشت یا لەجەهەنەم...

*شاعیرێکی شەکەتت دی*

*وڵاتەکەی لە دڵیدا هەڵگرتبوو*

*تێر ماچی کە دایە ئەوە کوڕەکەتە...ئەوە منم...*[195]

لە دەقێکی ئاوجۆشدراو بەسۆز و ڕەنگ ڕێژکراو بـە یـادەوەری (فلاشـباك Flashback)ی سەردەمی منداڵی، دەقنووس، هەر دوو قۆناغی سەردەمی منداڵی و قۆناغی دوای هـەرزەکاری لە زەمەن و مەکانێکی دیاریکراو دەگوێزێتەوە بۆ زەمەن و مەکانی پـەیامگر، (دویـل جـنتری) دەڵێ: "مرۆڤ پێویستی بەوکەسـانە هەیـە، کـە سەداسـەد پشـگیری بکـەن، کەسـانێ لەگـەڵ کێشەکانی تۆ و توڕەییەکانت ئاشنابن، لەودەمەوە کە دەتەوێ گۆڕانکاری لە رەفتار و کۆنترۆڵ و توڕەبوونی خۆت بکەی چاودێریت بکەن و پاڵپشتت بن"[196] لەتیف هەڵمەتیش نەك هەر تـاوەکو دایکی لەژیاندابوو پاڵپشتوو ڕابەری بوو، ئەوەتا کە دایکیشی مردووە، رۆحە پیرۆزەکـەی هێـزی ژیان و شیعری پێدەبەخشێ. هەروەها دەقەکە لق و پۆپی زۆرە، ئەوەی لێرەدا بەرچاو و دیارە ئەم سەرەقەڵەمانەن:

**یەك:** شاعیر باوەڕی بە تیۆری دۆنـاودۆنی ڕۆح (Metempsychosis) هەیـە، دۆنـادۆن: واتـا گواستەوەی رۆح لە کەسێکەوە یان بوونەوەرێکەوە بۆ بوونەوەرێکی دیکە، ئاینی (یارسان)لەسەر ئەم بنەماو فەلسەفەیە بونیاد نراوە. واتا جەستە لەناو دەچـێت، بـەڵام رۆح نـەمرەو دەمێنێـت. ئەگەر کەسێك مردوو و مرۆڤێکی باش بـوو، رۆحـی دەچـێتە نـاو جەسـتەی مرۆڤێکـی بـاش، بەپێچەوانەوە، ئەگەر مرۆڤێکی خراپ بوو، رۆحە خراپەکەی بۆکەسـێکی خـراپ دەگوازرێتـەوە. دۆناودۆن، کە تاکو ئەمڕۆ لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی بۆ دەکرێ، گەڕانەوەی ڕۆح بێ بۆ جەسـتەی کەسی دووەم. جار هەیە لە شێوەی خەون، یان خـەیاڵ یـان زیندەخـەون باسـی لێـوە دەکرێـت،

---

[195] ) دیوانی لەتیف هەڵمەت، چ١، تاران،٢٠١٤، ل ١٣٧ ـ ١٣٨

[196] )و. دویل جنتری، ترجمەی شیما صفدری، مدیریت خشم ـ با زبان آدمیزاد، ، چاپ سوم، کارگاه نشر هیرمند، تهران، ١٣٩٥، ص٣٨

مرۆڤەکان، بۆ ماوەیەکی کورتیش بێ، دەچنە نێو کیفی دۆناودۆن[197] لێرەدا، شاعیر ڕۆحی دایکە کۆچکردووەکەی دەهێنێتە لای خۆی و خۆی دەخاتە باوەشی، واتا دایکە مردووە ـ زیندووەکە گەڕاوەتەوە زێدی دەقنووس و لە زاری کوڕەکەیەوە گوێ بۆ مۆنۆلۆجێك ڕادەگرێ.

**دووە:** لەو کردەوە و ڕەفتارانەی کە دەقنووس بۆمان دەگێڕێتەوە ئەم (٣) خاڵە هەڵدەهێنجین:

(ا) لەسەردەمی منداڵییدا، دەقنووس یەکجار عەجول و هار و هاج بووە، بۆ خاڵی کردنەوەی هێز و وزەی بێئەندازەی جەستەی، هەمیشە خەریکی ئەنجامدانی چەندان کار و کردار بووە. ئەو منداڵانەی وەزە و برست و هێزی جەستەیان یەکجار زۆرە و لە کوردەواری بە عەجول و هار و هاچ ناودەبرێن، دۆخێکی جەستەی تایبەتی خودا کردەیان هەیە پێیدەڵێن (بزۆزی ئۆقرەنەگر Hyperactive) زانستییانە بە ڕەمزی (ADHD) پێناسە دەکرێن، کە ئەو جۆرە منداڵە وزەیەکی یەکجار زۆریان هەیە و بە هەر شێوەیەك بێ، لە جەستەی خۆیانی دەریدەکەن و بەلایانەوە گرنگ نییە ئاکامی کارەکەیان چیدەبێ، ئەمەیش لە منداڵێکەوە بۆ یەکی دیکە دەگۆڕێ.

(ب): دەقنووس لە کردارەکانیدا، کە زۆربەیان موزیر و لاسارن، یان ئەوەتا خۆی و خۆی بووە، یان بەکژ دەوروبەرەکیدا چۆتەوە، بەلایەوە گرنگ نەبووە چیدەکات وەك نەشیزانیوە بۆ وادەکات.

(ج): دیمەنەکان، باری کۆمەڵایەتی و شارستانیەتی زێدی شاعیرمان نیشاندەدات، کە بەداخەوە، هیچ ئامرازێکی تایبەتمەندی بە جیهانی یاری و گەمەی منداڵان تێدا نییە و شارەکەی زۆر هەژار بووە لە خزمەتگوزارییەکانی پارك و یاریگاو مەڵبەندی گەشەپێکردن، تا ئەو بە شێوەیەکی ئاسایی و بێ گرفت وزەی خۆی بەتاڵ کاتەوە. کەلتووری دواکەوتووی ناوچەکەشی تێدا دەخوێندرێتەوە، کە بۆ سەردەمەکەی دەقنووس، ئاسایی سەیرکراوە.

**سێ:** بازدانێکی مەزن لە قۆناغی دوای سەردەمی منداڵی دەبینرێت، لە ڕێی خۆڕوشنبیرکردن و خۆپێگەیاندن، دەقنووس وەك قارەمانێکی مرۆڤدۆست و پەیامدار خۆی نمایش دەکات.

---

[197]) تناسخ الارواح، طارق سري، دار المشارق، قاهرة، ٢٠٠٩، ص ١٢٢

چوار: دەقنووس خەسڵەتێکی کەسێتی خۆی کە (لاساریی)یە، لە تەمەنی دوای هەرزەکاریشدا ناشارێتەوە، بەو واتایە لە هەر دوو قوناغەکەدا هەڵگری سیفەتی (لاساریی)یە، بەڵام بۆ مراز و مەرامی جیاواز.

ئەمە ڕیزبەندی ڕەفتارەکانی دەقنووسە لە سەردەمی منداڵییدا، وەك خۆی بۆمان دەگێڕێتەوە (*ئاوبڕین لە ماسی/ دەرگا و پەنجەرە شکاندن/ بەدیوار هەڵگەڕان/ دڕاندنی جل و بەرگی خۆی/ بەرباران کردنی چۆلەکە/ شکاندنی سەری ڕێبواران/ بەردگرتن لە دەرگای دراوسێ/ ڕاکردن لەسەر بانان بە دوای کۆلاراندا/ دزینی گوێز و هەنگوین/ ئاگرکردنەوە لەبەر دەرگای ماڵ/ شەڕکردن لەگەڵ منداڵان*).

بڕوانن شێوازی لاسارییەکەی لە قۆناغی دووەمدا چۆن نمایش دەکات: (*وەستانەوە بەرانبەر دوژمن/ فراوان بوونی بازنەی خۆشەویستی لە دڵەوە تا ڕادەی باڵکێشان بەسەر هەموو وڵات.*)

لێرەدا دەقنووس تامەزرۆی ماچی دایکیەتی. ماچەکە بە هێماگەری پێچراوەتەوە و دوو واتاییە: لە لایەك داوادەکات دایکی ماچی بکات تا بیبەخشێ لەو هەموو لاساری و ئەو کەتنانەی کە لەسەردەمی منداڵیدا ئەنجامی داون، لەلایەکی دیکە ماچەکە خەڵات و مەدالیایە، کە ئێمڕۆ ئەو کوڕە لاسارە بۆتە ئەو قارەمانە مەزنەی خەبات و خۆشەویستی. کە خۆی شانازی پێوەدەکات و دەڵێ: (*ئەوە کوڕەکەتە...ئەوە منم...*)

ئەم دەقە چەند وشەیەکی بنزاری ناوچەی گەرمیانی تێدایە، کە دەقنووس نەیویستووە دەستاکاریان بکات، دیارە لاسایی زمانی دایکی کردۆتەوە،وەك (*نەناسی/ دەشکان/ دەدڕان/ دەهاوم*). ئەمەش تەواوی دەقەکەیە:

***گەڕەکێك لە کەرکوك پێی دەڵێن:***

***شۆریجە...***

***شەقامێك لە بەغدا پێی دەڵێن:***

***فەلەستین...***

ڕووبارێك لە گەرمیان پێی دەڵێن:
ڕۆخانە...
منیش کچێك خۆشەویستمەو ناوم لێناوە (شیرین)
نە گوڵ لە ئاگردا پێ‌دەکەنێ‌و
نە پەلکە ڕەنگینەی هۆنراوە
بەبێ چاوی ڕووناکی ئەو کچە بارانە
دڵی من دەکاتە ئاسمان...
کە منداڵ بووم هەرچەند بیانووم بگرتایە
دایکم لێی دەپرسیم:
- کوڕە سەلارەکەم چیت دەوێ
ئای خۆ ئێستا دایکم نەماوە ژێرم کاتەوە
ئەگەر شەوێ کزەبایەکی پەمەیی
بۆنی خەمە قاوەییەکەی من
لە لووتی بپژێنێ
ئەوسا دەزانم چی دەڵێ:
- وایش کوێراییم دایێ کوڕەکەی من
منداڵێکی نازدارە...
ئەوە کێیە ئەوەندە سزای گیانیی دەدا...؟
ئای دایکم نازانێ ئێستا کوڕە شەرمنەکەی
گەورە بووەو
ئێستا ئەگەر ژنێکی شیرین
یا کچێکی بەناز ببینێ
وەکو کڵۆ بەفری ناو گۆمێك لە شەرمێکی گەرمدا
ناتوێتەوە

*ئێستا کوڕە شەرمنەکەی شاعیرەو*

*لەگەڵ کچە چاوبازەکاندا*

*دڵداری دەکا...و*

*کچێکی خۆش دەوێ ناوی ناوە:*

*شیرین...!* [198]

ئەوەندەی لەتیف هەڵمەت، خوولیای گوزارشتکردنی ناخ و دەروون بووە، ئەوەندەش لە پیشەکەیدا خوولیای هەنگاونانی هونەری بووە، جا هاوسەنگی لەنێوان توخمە پێکهێنەرەکانی دەقدا، کارێکی هونەری و وەستایانەیە، ئێستا شاعیر سەردەمی منداڵی لەسەر دەستێك و سەردەمی هەرزەکاری خۆی لەسەر دەستەکەی دیکەی داناوە و هەوڵدەدات هاوسەنگ لە فۆرمێکی ئەدەبی ڕایانگرێت و پەیامەکەی بەبێ تەسەنوع و ڕیاییکردن بگەیێنێ، ڕەخنەکار تەها ئەحمەد ڕەسووڵ بەم شێوەیە ئەم خاڵە لە هونەردا شیدەکاتەوە و دەڵێ:*"یەکێك لە بنەما سەرەکییەکانی کاری هونەری هاوسەنگییە، هاوسەنگیش بە ڕەگەزە جیاواز و دژبەیەکەکان یەکسان دەبنەوە، واتا یەکێتییەکی جوانییە. سەرباری ململانێی ڕەگەزەکان لە هاوسەنگیدا هەریەکەیان پێویستی بەوی دیکەیە، ڕەنگەکان دژ بە یەکتر دەوەستنەوە و دواجار گشتێکی نوێ پێشکیش دەکەن، کێشە و ململانێ لە هاوسەنگی ناترازێن و فاکتەرەکانی جوانی نین، بەڵکو بۆئەوەی ڕەگەزەکان بەرانبەر یەکتر بن پێویستە هاوسەنگ بن. ڕێکخستن و هاوسەنگی گرنگترین سیستمی شێوەن."* [199] لە فەزایەکی شیعریدا، هەردوو ڕەنگی سەردەمی منداڵی و سەردەمی هەرزەکاری جوان جوان تیکەڵ یەکتری کراون و ڕەنگێکی نوێیان لێدەرچووە، دەشێ ناوی لێ بنێین (ڕەنگی منداڵە پیاوەکە)، کە وەك عاشقێك خۆی نمایش دەکات. فەرموون، دیقەت لەو تەرازووە و هاوسەنگییەکەی نێوان دوو زەمەنەکە بدەن، کە (شیرین) ناوێك هاوسەنگییەکەی ڕاگرتووە:

---

[198] ) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٢٥٤ ـ ٢٥٥

[199] ) گۆڤاری ڕامان، ژمارە ٢٤١، تەها ئەحمەد ڕەسووڵ، ل ١٢٣




بۆ ئێمە لێرەدا کۆلکەی هاوبەش (دایك)ە، کە شاعیر لە هەردوو قۆناغەکەی تەمەنیدا، نەك لە یادی نەکردووە، بەڵکو بە فریادڕەس و پشتیوانی خۆشی داناوە، لە ژێرکردنە و نازهەڵگرتن و ترسان لەوەی ئازاری گیانی بدەن و لە هاوڕازی و کردنەوەی گرێیەکانی دڵ و دەروون لە کۆشی ئەودا... لەتیف هەڵمەت خۆی دەڵێ:"جگە لەوەی (دایك) بوو، هاوڕێشم بوو، یانی کەس نەبوو لەهەموو ژیانم بەقەد دایکم منی خۆش ویستبێ، خۆشەویستییەکی تایبەت لەنێوان من و دایکمدا هەبوو." [٢٠٠]

ئەم دەقە هێندە بە خەیاڵ و زیندەخەون هەڵشێلدراوە، کە لێکچودا کردەوەیان ئاسان نییە، شاعیر لە واقیعدا دولبەری نییە، تەنانەت ناوی دڵدارەکەشی هەر بەرهەمی زیندەخەوێکی هەزرەکارانەیە کە سیخناخە بە دیمەنەکانی سەردەمی منداڵی، سێبەری خەیاڵەکەش لە وێنە گشتییەکەی دەقەکە دایە، کە وێنەی هونەری لەخۆگرتووە وەك: *(نە گوڵ لە ئاگردا پێدەکەنێ و/ نە پەلکە ڕەنگینەی هۆنراوە/ بەبێ چاوی ڕووناکی ئەو کچە بارانە/ دڵی من دەکاتە ئاسمان...)*، *(ئەگەر شەوێ کزەبایەکی پەمەیی/ بۆنی خەمە قاوەییەکەی من/ لە لووتی*

---

[٢٠٠] ) دیدەنی هاوژین سڵێوە لەگەڵ لەتیف هەڵمەت، ١٩ / ٣ / ٢٠١٢

*بپژێنیێ/ ئەوسا دەزانم چی دەڵێ)، (وەکو کڵۆ بەفری ناو گۆمێك لە شەرمێکی گەرمدا/ ناتوێتەوە).*

شاعیر لە دەقە شیعرێکدا دەڵێ:

***زۆرجار کە برسیم دەبێ***

***حەز لە کولێرەیەکی گەرم گەرم دەکەم..***

***ئای بۆنی کولێرەی گەرم چەند خۆشە...؟***

***ڕۆژانی مناڵیم بیر دەخاتەوە..***

***ئەو ڕۆژانەی کە دایکم نانی دەکردو***

***وحنەو مارمارۆکەو پەپکە بە کونجی وکەلانەی***

***بۆ دروست دەکردم..***

***ئای دایکم کوانێ..؟***

***هیچ نانێك ئەوەندەی نانی دەستی ئەو***

***خۆش نییە.. و***

***هیچ نانێك برسێتیم تێر ناکا..***

***نانی دەستی دایکم نەبێ..!*** [201]

ئەم دەقە ڕۆچوونە بۆ تونێلە لە بن نەهاتووەکەی جیهانی منداڵی، شۆڕبوونەوەیە بەنێو بیرەوەری و یادەوەرییەکان، بۆئەو سەردەمانەی کە خواردنەکان لەزەت بەخشن، چ جای ئەوەی کە ئەم خواردنە بەدەستی دایك دروست کرابێ، دەست پوختی (دەستاو)ی دایك، هەمیشە تامی تایبەتی خۆی هەیە، تەنانەت کاتێ کە مناڵ گەورەش دەبێ، چونکە لەمناڵییەوە لەسەر ئەم جۆرە تام و بۆ و خۆێ و ترش... خواردنە ڕاهاتووە. بۆیە هەمیشە تامی خۆی هەیە. ئەم دەقە لەڕێی هەستی بۆنکردن و چەشتنەوە وەردەگیرێ. ڕەنگ بێ تووش ئەمەت بەسەر هاتبێ، بیستنی گۆرانییەك یان بۆنی عەترێك یان ڕەنگی پۆشاکێك یان تامی خواردەمەنییەك ڕاستەخۆ

---

[201] ) *دیوانی لەتیف هەڵمەت*، ل ٣٠٨ ـ ٣٠٩

یاد و بیرەوەریی کەسێکی یان ڕووداوێکی پێشتری بەبیر هێنابیتەوە. ئەم دیاردەییە چییە و چۆن ڕوودەدات؟ دەروونناسی سەردەم بەم شێوەیە وەڵامی ئەم پرسیارانە دەداتەوە: لە مێشــکدا، دوو ناوچە هەیە کە کۆگای و گەنجینــەی بیرەوەرییــە و لەوێــدا زانیارییــەکانی پەیوەســت بــە یــادو ویادەوەری ئەمبار دەبــن، هــەر ناوچــەییەی لــە لایــەکی مێشــکە، ئــەرکی ئــەو دوو ناوچــەیە هەڵگرتنی ئەو بیرەوەریانەیە، کە بۆماوەیەکی دوورو درێژ دەمێننــەوە و دەبــن بــە بەشــێك لــە ئۆتۆبایۆگرافی کەسەکان، تا دوایین ساتی ژیانیان. جا ئەم (Hippocampus)انە پەیوەندییەکی بەهێزیان لەگەڵ سۆز و بۆنکردن و خواردن دا هەیە، ئەمەش وادەکات کە بیرەوەرییە

ســۆزدارەکان بــە بــۆنکردنێکی یــان تــامکردنێکی هاکــەزایی، یەکســەر بەئاگایانــە یــادی بیرەوەرییــەکی پێشــتر بــورووژێنن. بیرەوەرییــەکان دوو جــۆرن: بیرەوەریــی دیــار ( Explicit Memory) وە بیرەوەریی شاراوە (Implicit Memory)، ئــەوەی یەکــەمیان هەمیشــە بــە ئەنقەست و بە ئاگایانە شتەکانی ڕابردوو دەهێنیتەوە یاد، هەرچی ئەوەی دووەمیانە فۆڕمی ئەو بیرەوەریانەی، کە خەسڵەتی پەرچەکرداری و بێئاگاییــان هەیــە. بــیرەوەری شــاراوە ( Implicit Memory) فرە چەشــنترە لــە چــاو ئەوەکــەی دیکــە و پــتر پەیوەســتە بــە (ســــۆز) و لایــەنی (درێژخایەنی). جا پڕۆسەی بۆنکردەکە و وەبیرهاتنەوەی کەسەکە یان ڕووداوەکــە بــەم شــێوەیە: پڕۆسەی وەبیرهاتنەوەکە: (بۆنکردن، بیستن، بینین، تامکردن، بەرکەوتن)، ســەرەتا لــەو خانانــە دەست پێدەکات، کە بۆنەکە یان دەنگەکە یان شــتەکە یــان خواردنەکــە دەناســنەوە، بەشــێکی دیکەی خانەکان، شێوەی کەسەکە یان ڕووداوەکەی کە پەیوەستە بەو بابەتانە، دەهێننەوە یــاد، لە چرکە ساتێکدا ئەم دوو بیرەوەرییە (دیــار و شــاراوە) ئاوێتــەی یــەکتری دەکــەن و دیاردەکــە دروست دەبێ.[٢٠٢]

---

[٢٠٢]) Omnivorous Mind، John Allen، Harvard University Press،California، ٢٠١٢، P. ١٤٥ (کتێب)

لەتیف هەڵمەت لە دەقە شیعرێکدا، کە پتر لە هونراوەیەکی خەبەری دەچێت و زۆر زمانی شیعری پێوە دیار نییەو لە وێنەی هونەری و ئەفراندندا هەژارە، بۆنی کولێرەیەکی گەرم، ڕۆژانی منداڵی وەبیر دەخاتەوە. لێرەدا هاوکێشەی نێوان بیرەوەریی دیار و بیرەوەری شاراوە، دیمەنی نانکردنی دایکی و شێوەی دایکی و جۆرەکانی نانی کوردەواری لە چرکەساتێکدا دەوروژێنی و ئەم دەقە لەدایك دەبێ. ئەوەی کرۆکی دەقەکە بەتەوەرەکە گرێدەدات، وەبیرهاتنەوی سەردەمی منداڵییە لە قۆناغێکی دواتری تەمەندا. لێرە شاعیر دەبێتەوە منداڵەکەی جاران کە بەدیار سێر و خوانی دایکی هەڵدەتروشکا، بەڵام لە زەمەن و مەکانێکی جیاوازدا. دەقەکە ناوی چەند جۆرە نانێکی کوردەواری ناوچەی گەرمیانی پاراستوە. وەك *(نانی تیری و حنە و مارمارۆکە و پەپکە بە کونجی وکەلانە)*[٢٠٣].

شاعیر لە قەسیدەکدا دەڵێ:

***ئەوە کێیە لە ژێر بارانی پرچتدا***

***ئەتوێتەوەو ناتوێتەوە***

***شاعیرێکە لەبەر تیشکی نەبینراوی گوارەکانتا***

***بەخوێنی خۆی شیعرت بۆ دەنووسێتەوە،***

***لە بارانێکی زۆر ڕەشدا***

***گشت شتێك دەدۆزێتەوە***

***دایکی نەبێ***

***لێی تۆراوەو نایەتەوە و نایەتەوە***

***ئەڵێن گیانی دایکم بەشەو***

***دەبێ بە کۆترێ سپی و***

---

٢٠٣ ) هەرچەندە لەپێشتریش ئەم دەقەمان وەرگرتووەو بەراوردمان کردووە بەدەقە شیعرێکی شێرکۆ بێکەس، بەڵام لەبەر بوونی ڕەهەندی ترو گونجانی لەگەڵ ئەم تەوەرەیە، بەپێویستمان زانی جارێکی دیکە لێکدانەوەی بۆبکەین و چەند دیوێکی تری ڕۆشن بکەینەوە.(نوسەران)

لە ماڵێکی زۆر تاریکی ئەم شارەدا
کز کز دەنیشێتەوە
هەموو شەوێ
جەنگەڵی خەو درەو دەکەم
ئەڵێم بەشکو کۆتری سپی گیانی دایکم
لە دوور لەلایەك سەر دەرکا
بێت دەنوکە مرواریەکەی
لەبارانی پرچت تەرکا...!
***
دایە کوڕەکەی جارانت
ئێستا لەبەر شەستە بارانێکی رەشدا
یاری دەکاو خۆی تەڕ دەکات
نە دایکی لێی توڕە ئەبێ و
نە باوکیشی لێی دەدات
ئەی دایە گیان... تۆ دەزانی
چۆن بارانی
پرچی رەشی کچۆڵەیەکی لەش زیوین
کچۆڵەیە دەم گوڵ هەنار
تك تك کۆ دەبێتەوە و
دەبێتە قوڵترین رووبار...؟
ئەی بارانە ڕەش ڕەشەکە
ئەی بارانە ڕەش ڕەشەکە
کە با بەناو
شەپۆلەکانتدا دەڕوا و

وەك منالّی تینوو تینوو
دلّۆپەی بۆنت دەمژێ
ئەوە منم
ئەهابۆنە بەتامەکەت
لە شووشەی گشت شیعرەکانم
نم نم.. دەڕژێ
***
چرای لادێ هێدی هێدی
تنۆك تنۆك دەتوێتەوە
گڕی لای لایەی دایك
ملوانکەیەو دەبچڕێتەوە
کەسێك نییە کۆی کاتەوە
بەڵام پرچت هەر ڕەشماڵە گەورەکەیەو
جوتێ چرای تیا ئەسوتێو ناکوژێتەوە
ساڵ دێو دەڕوا
ئاسمان: ئەو کچە چاو شینە
دوانزە مانگ وەك دوانزە پرتەقاڵ دەخوا
پایز گرە دەبێ بە کۆمەڵێ داس و
درەو دەکا کام گوڵ گەشە
بەڵام پرچت چوار وەرزەی ساڵ
ڕەشە و ڕەشە
وەکو شەستە بارانێ ڕەش
بە سەر مێرگی شیعرەکانما
دادەبارێو دادەبارێ

***تك تك دەبن بە چۆلەکەو***
***دەنگیان دەبێ بە ڕووبارێ***
***هەرچی گۆرانی خۆش هەیە***
***هەمووی دەبا بەرەو شارێ***
***کە گۆرانی بارانی تیا قەدەغەیە*** [٢٠٤]

لە قەسیدەیەکی درێژدا، کە هەر بەشێکیمان وەرگرتووە، شاعیر لە فەزایەکی زۆر تەسك و فراوان، تاریك و ڕۆشن، دیار و نادیار، وەك مەلەوانێکی نەزان باسکان لێدەدات و دەیەوێ بگاتە کەنارێکی ئارام، کە ڕۆحی تێیدا ئۆقرە بگرێ و لەوێدا سەری ڕحەت بێ، لێ نە شەپۆلەکانی دەریاکە لوولیدەدەن و دەیپێچنەوە و نغرۆی دەکەن، نە کەنارە دوورەکەش دەستێکی بۆ درێژ دەکات و فریای دەکەوێ! بیرۆکەکانی دەقەکە ئالۆز و تەمومژاوین، گوزارشت لە بارێکی دەروونی نیگەرانبوونی شاعیر دەکەن. دوو سەردەمی ئاوێتەبووی یەکدی و دوو قارەمانی ڕەنگرێژکراو بە عیشق و ئەڤین، ئەم شانۆگەرییە سوریالیزمە لێڵە پێشکەش دەکەن. دوو سەردەمەکە، قۆناغی منداڵی و دوای هەرزەکاری دەقنووسە، قارەمانەکانیش دایك و دلْدارێکی وەهمی شاعیرە. بیرۆکەی دەقەکە (The Theme) یەك ڕستەیە: "هەر ڕەشماڵی پرچی ڕەشی ئەم کچە دەتوانێ هەرسێکمان بەیەکەوە کۆبکاتەوە، دایکم و ئەو و خۆم." شیعرەکە خەیاڵە چیرۆکێکە بۆ شانۆگەری سازە، زەمەن و مەکان و کارەکتەر و گرێیەکانی دەناسرێنەوە، ئەوەی ناناسرێتەوە و تەمومژاوییە ئاکام و ئایندەی خۆشەویستییەکی شێتانەی شاعیرە، بۆ کەسێك کە لەسەر زەوی نەماوە، بەو واتایەی نیوەی پێکهاتەی خۆشەویستەکە بوونی هەیە و نیوەکەی دیکەی بزرە، هەرچەند دەقنووس دەیەوێ بە نیگای کچێك، زیندووی بکاتەوە. بەڵام ئاخۆ پێیدەکرێ؟

---

[٢٠٤] ) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٣٧٦ ـ ٣٧٨

دەقەکە ئالۆزە، وشەکانی (ڕەش،١٠ جار و باران، ٩ جار و دایك، ٧ جار و پرچ، ٤جار) پات بوونەتەوە و (٢٠) ناو و راناو و ئاماژەشی بۆ شاعیر تێدایە. دەکرێ لە وێنە هونەرییەکانی دەقەکە درك بەوە بکەین، کە دوو تاریکی، کە (١٠) ئاماژەیان بۆ کراوە، تەواو بەرچاوی ئەویان ڕەشکردوە: تاریکی دڵە تاریکەکەی کە هەست بە دووری دایك دەکات و تاریکی ڕۆژگاری نیشتمانەکەی شاعیر کە زۆر تەڵخ و خامۆش و لێڵە (وێنەی سەردەمی ڕژێمی بەعسییەکان). دەکرێ لێرەدا (دایك) وەك ڕەمزێك پێناسە بکرێ، کە فەرهەنگێکی مەزن و پیرۆز و کاریگەری لەسەر هەموومان و هەموو ڕۆژگارەکاندا هەبێ.

ئەفسانەی بارانی ڕەش و بە کۆتر بوونی گیانی دایك و گەڕانەوەی بۆ سەر زەوی، لێکدانەوەی میتۆلۆژیای قووڵ هەڵدەگرێ. وێنە هونەرییەکانی دەقەکە، ئەگەرچی پەرش و بڵاون، لێ خوێنەر بە دەقەکەوە دەبەستنەوە و لە نێوانی دوو فەزایەکەی تەمەنی شاعیر جۆلانێی پێ دەکەن.

مەغزای دەروونییەکەی ئێمە لێرەدا ئەوەیە. ئەم بارە دەروونییەی شاعیر تێیکەوتووە، بە دوور کەوتنەوەیە لە دایکی و درێژەی هەیە و زەمەنەکانی وەك کارتی قومارکردن تێکەڵی یەکدی کردوەو سەرگەردان ماوەتە، هەرچەندە ساڵەکان تێدەپەڕێنێ هەر خۆی بە منداڵە بچکۆڵەکەی گەڕەکەکانی(باخی پاشا و محەلەی دەدە و عەجەمەکان و گۆڕستانەکە)ی کفری دێتەوە بەرچاو.

ئەوەتا لەتیف هەڵمەت دەڵێ:" من واهەست دەکەم من هەرمناڵم، هەست ناکەم گەورە بوویم."[٢٠٥]

---

[٢٠٥]) دیدەنی: هاوژین سڵیوە لەگەڵ لەتیف هەڵمەت، ١٩ / ٣ / ٢٠١٢

لەتیف هەڵمەت دەڵێ:

*- دایە گۆرانییەکەم لە باولەکەمانا*

*شاردۆتەوە*

*بیدەرە کۆرپەکەی کۆشت-*

*لەبەر دەرگای شادا پاسەوان بووم*

*ئەوەی ئەهات لەملیم ئەدا*

*کە لام کردەوە هەرچیم کوشتبوو*

*شێوەی وەکو خۆم وابوو*

*دووبارە شمشێرەکەم ساودایەوە*

*دایە بە برابچکۆلەکانم بڵێ*

*بووکەشووشەکانیان پەراش پەراش کەن*

*بتەکانیان...* [٢٠٦]

شاعیری ئەرژەنتینی ناسراو، پابلۆ نیرۆدا لە ئۆتۆبایوگرافی خۆیدا، ڕووداوێك دەگێڕێتەوە، کە نەیهێشتووە قەت پیر بێ و هەر بە منداڵی ماوەتەوە. کاتێك کە کەسێك لە کەلێنی دیواری حەوشەکەیاندا، بووکەشووشەکەی لێ دەرفێنێ، هەرچەند بە دوایدا ڕادەکات پیی لێ ناسێندرێتەوە. ئەو دەڵێ بەخەیاڵی گەڕان بەدوای ئەو بووکەشووشە دزراوەی سەردەمی منداڵیمدا شیعر دەنووسم.[٢٠٧] هەمان بووکەشووشە، کاتێك لە لەتیف هەڵمەتی شاعیر دەدزرێت، ڕەنگ و ڕوخساری چەندان دەقی شیعری، سیما و شێوەی سەردەمی منداڵی هەڵدەگرن و لە دوو زەمەنە جیاوەزەکانی تەمەنی ئەودا، وەك ڕەمز و کۆد و شفرەی هونەری جێ پەنجەی خۆیان بەجێدەهێڵن. ئەو منداڵە ـ پیاوە شاعیرە لە دوو دەقی، نووسراو لە دوو زەمەنی جیاواز دا، زیرەکانە ئەو بووکەشووشە دزراوە تەوزیفدەکات و دەیکات بە لۆگۆی پەیامێکی شۆڕشگێڕانە. ئەمەی

---

[٢٠٦]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٣٤ ـ ٣٥

[٢٠٧]) فازیل شەورۆ، دوو لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، ٢٠١٣، دەزگای ئەکادیمی کورد، هەولێر، ل٥٦

خوارەوە دەقی یەکەمە، کە لەسەرەتای ئەزموونی شاعیر نووسراوە، واتا سەردەمی یاخی بوون و چەپاندن، کە تێیدا شاعیر ئومێد دەخوازێ براکەی درێژە بە شکانی بتەکان بدات، ئەگەر ئەو بتانە بووکەشووشەش بن، وەك بووکەشووشە خۆشەویستە دزراوەکەی خۆی.

شاعیر لەم دەقەدا دەڵێ:

***هەر لەبیرمە کە منداڵ بووم***
***خوشکە ناوەنجییە جوانە مەرگەکەم***
***بووکەشووشەکانمی دەفڕاند و***
***منیش لە کونجێکی هۆدەکەماندا***
***دەگریام و دەمشریخان...***
***ئەمڕۆش گەورە بوومەو***
***لە دورگەی بێ سنوری ئاوارەییمدا***
***بۆ خۆشەویستێك دەگەڕێم***
***کە ڕەشەبا لێی دزیوم...!***
***ئای خۆ ڕەشەبا:***
***دڵی نییە تا دڵداری لەگەڵ کچە باڵا بەرزەکاندا بکات...***
***ڕەشەبا دەستی نییە بیکاتە ملی نازداران و***
***لووتی نییە بۆنی پرچی درێژی***
***ناسکە ژنەکان بلدزێ و***
***دەمی نییە گۆی مەمکۆڵە و***
***زمانی کچۆڵە چاوبازەکان***
***لە ناو دەمی خۆیدا بتوێنێتەوە... و***
***ناشزانێ شەوان لە ژوورە دوورەکاندا و***
***لە زنجە تاریك و ساردەکاندا***

***لەگەڵ کچە هەژارە دەستو پەنجە***

***شەقار شەقار بوەکاندا***

***ڕازو نیاز بکاتو لە ناو سینگو مەمکیاندا***

***بنوێ...***

***ئای ڕەشەبا هەر دڵداریش نازانیٚ...!*** [٢٠٨]

دەقی دووەم، کە کۆنترە لە هی یەکەم و دیمەنەکەی لە ناوچەی بیرەوەریی شاراوە ( Implicit Memory) لە مێشکدا جێگیرە، چەند وردە زانیارییەکمان بۆ تۆماردەکات و نهێنییەکی (بووکەشووشە)کەی دەقی سەرەومان بۆ ئاشکرادەکات.

ڕەخنەی ئەدەبی دەتوانی شتی تەمومژاوی و بزر و نادیاری ناو سینەی شاعیر کەشف بکات و جەمسەرەکانی بە ڕایەڵەکانی دیکەی بەرهەمەکانی ببەستێتەوە، بۆ نموونە، بۆ خوێنەرێکی پیادە، بووکەشووشەکەی دەقەکەی سەرەوە، هەر بووکەشووشەیەکی پلاستیکییە، کەچی ئێستا دەزانی ئەم بووکەشووشەیە مێژوو و سەربووردە و یادەوەریی خۆی هەیە، شاعیر ئەو مشتە پلاستیکە بێ گیانەی کردووە بە خۆشەویستێك، کە ڕەشەبا تەماحی لێکردووە و لێی دزیووە! بووکەشووشەکەی دەقەشیعری دووەم پێمان دەڵێ:

- خوشکە ناونجییەکەی شاعیر جوانەمەرگ بووە.
- ئەوان بەیەکەوە یاری و گەمەیان دەکرد.
- شاعیر هیچ گەمەیەکی کوڕانەی شك نەبردووە یاری پێ بکات، بۆیە بە بووکەشووشەی کچانە خۆی خەریك کردووە.
- دەقنووس لەتەمەنی هەرزەکاریدا ئەم بووکەشووشەیە دەکاتە دڵدارەکەی.
- خوشکە جوانەمەگەکەی بە ڕەشەبا شوبهاندووە کە دڵداری نازانیٚ

فەرموون ئەمەش دەقێکی دیکە:

***بە دیار کێلی گۆڕەکەی دایکمەوە***

---

[٢٠٨] ) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٢٨٨ - ٢٩٠

ڕادەوەستم و
لە گەڵیدا دەکەومە گفتوگۆو
پێکەنین...
من پێدەکەنم، هەندێ کەس
وا دەزانن دەگریم...!
جا بۆ بگریم...
خۆ دایکم هەرچەند مردووە
ئەوە نییە لە هەموو هۆنراوەکانمدا
لایە لایەی دڵم دەکات...
* * *
هەموو ئەو هۆنراوانە
بۆ دایکم دەخوێنمەوە
کە بۆ ئەو پرچەت نووسیومە
کە ئەوەندەی هۆنراوەکانم
خۆشم دەوێ و
ئەوەندەی ئەو هەورانەی
کە گوڵ لە خاکی وڵاتە سەوزەکەمدا
دەچێنن...
تامەزرۆیانم...!
ئای خۆزگە دەمزانی
ئایە دایکم دەزانێ کە کوڕە شەرمنەکەی
جارانی...
بۆتە شاعیرو دڵداری دەکات...!
ئەبێ دایکم چی بڵێ، ئەگەر بزانێ

*دەمی تۆو*

*لەشە تیشکەکەتم*

*لەو نانە خۆشتر دەوێ*

*کە جاران ئەو بۆی دەکردم...*

*ئەبێ دایکم چی بلێ، ئەگەر بزانێ*

*تاڵێ لە قژەکەی تۆم*

*لە پەڕۆی سەوزی هەموو نەزەرگاکان*

*لە لا پیرۆزترە...!*

*ئەی ئەبێ دایکم چی بلێ، ئەگەر بزانێ*

*خۆشەویستەکەم کەوڵم دەکات و*

*لە چاڵە خوێی زستانی*

*ئەم سەدە نەفرەت لێ کراوەدا*

*بەجێمدێڵێ...!* [209]

ئەم شیعرە دەستوورشکێن و نەریتشکێنە، شاعیر شێتانە لەپێناو خۆشەویستێك کە (*کەوڵی دەکات و/ لە چاڵە خوێی زستانی/ ئەم سەدە نەفرەت لێ کراوەدا/ بەجێی دێڵێ*)، لایەلایە و باوەش و نانی دایکی، بە بۆنوبەرامەی پرچ و ئەگریجە و دەم و لێو و جەستەی جوانی کچێك دەگۆڕێتەوە و بێشەرم و شکۆ ئیعتراف دەکات کە (*دەم و لەشە تیشکەدارەکەی ئەو کچەی لەو نانەی خۆشتر دەوێ کە جاران دایکی بۆی دەکرد.*)

سیحری ئەو وەرگەڕان و گۆڕانەی شاعیر، لەبەرانبەر عیشقی دایکیدا، چۆن ڕاڤە دەکرێت؟ پرسیارێکی بەجێیە. فەیلەسۆفی ئەڵمانی(فریدریك نیشتەFriedrich Nietzsche ١٨٤٤ - ١٩٠٠) دەڵێ:" لەناخی هەموو پیاوێکدا منداڵێك هەیە حەز لە گەمە و یاری دەکات."[210]

---

[209]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٣١٦ ـ ٣١٨

کەواتە دەقنووس لێرەدا هەرمنداڵە، لێ منداڵێکی فامکردووی بێ ئەزموون ـ بێ ئەزموون وەك هەر منداڵێکی دیکە ـ، لە ساتەوەختی داڕشتنی ئەم دەقەدا و تێکەڵ بوونی وێنەکانی جیهانی بەئاگایی و جیهانی بێئاگایی، ئەم تارماییانەی دێتە پێش چاو:

- گۆڕەکەی دایکی، کەواتە کۆچکردنی ئەو ڕاستە و خەیاڵ نییە.
- کۆی هونراوەکانی شاعیر، لایەلایەی دایکیەتی، کەواتە ئەو هەر منداڵەکەی جارانە.
- کەوڵکردنی دەقنووس بەدەستی خۆشەویستەکەی، (٣) کۆدی شاراوەی لەخۆ گرتووە: (١)، بەربەرەکانی کردنی حەزی و مەیل بۆ ڕەگەزی دووەم لە تافی لاویدا ئەستەمە. ناحەقی نییە کە لەو ساتە وەختەدا خۆشەویستی دایکە کۆچکردوەکەی بە خۆشەویستی کچە جەستە تیشکدارەکە بگۆڕێتەوە. (٢) حەزەکە سیخناخە بە ئارەزووی سێکسی نەك ڕۆحی، ئاماژەکان ورووژێنەرن، دیمەنی جەستەی کچێك بە پرشنگی تیشك و تریفە بدرەوشێتەوە، مقاوەمتکردنی زەحمەتە. وێنەکە ڕووتەمەنییە. (٣) شاعیر بە کەوڵکردنەکەی سەغڵەت نییە! مادام کەوڵکەر و قەسابەکە کچەکەیە، ئەمەیش ئاماژەیە، کە جۆرێك لە توخمەکانی ماسۆشیزم (Masochism) لە ناخی ئەودا هەیە.

کەواتە دەقنووس لەم دەقەشدا هەم منداڵە و هەم پیاو، بۆیە لە نێوان دوو باوەش و دوو لایەلایە و لاواندنەوە سەرخەوان دەشکێنێ: باوەشی دایك (سەردەمی منداڵی) و باوەشی دڵدارەکەی (سەردەمی باڵقی).

---

[٢١٠] https://plato.stanford.edu/entries/nietzsche/

پووختەی تەوەرە:

ئــەفلاتوون دەڵــێ:" خــۆ هــەر پیرەکــان نــین کــە دووبــارە منــداڵ دەبنــەوە. سەرمەســت و سەرخۆشەکانیش هەر وان.." [211] ڕایەڵەی نێوان سەرمەست و شاعیریش، جیهانی بێئاگاییە، کە یەکەمیان بە شەراب و بادە و دووەمیان بە خەیاڵ و ئیلـهام دەیگـەنێ. ئـەوەی لـەم شـاعیرە ـ منداڵەدا، لە ڕێی شیکاری دەقەکانییەوە، دەخوێندرێتەوە ئەوەیە: تەمەنی شـاعیر دوو قۆناغــە: قۆناغی پێش مەرگی دایکی (١٧ ساڵ) و قۆناغی دوایی مەرگی دایکی (٥٠سـاڵ). یەکـەمیان لە (١٩٤٧؟ ـ ١٩٦٧)، و دووەمیان لە (١٩٦٧ ـ ٢٠١٨) و هـەردوو قۆناغەکـە بـە ڕەنـگ و دەنگی ئەو دایکە (مردووە ـ زیندووە) پێچراونەتەوە، تا ڕادەیەك شاعیر جۆرە سەرگەردانییەکی ویژدانی پێوە دیارە، کە نازانێ چۆن هاوسەنگی خۆشەویستی نێوان دایك و کچێك ڕاگرێ.

لە دەقەکانی ئەم تەوەرەدا شاعیر بە ئاگایە کە دایکـی کۆچـی کـردووە. سـەدای (*دایـــە، دایــە گیان*) بەسەر وشەی (دایك) دا زاڵە، ئەمەیش زمانی سەردەمی منداڵییە، کـە دەقنــووس لەلای خۆی پاراستوویەتی.

---

[211] Reason and Emotion (John M. Cooper، Publisher Princeton University Press، New Jersey، United States، ١٩٩٩، P. ٨٨ (کتێب)

( ٥ )

## ئەویندارى لە سێبەرى دایكدا

دەگوترێ پێناسەكانى خۆشەویستى ـ كە لەئەژماردن نایەن، هەر هەموویان ناتەواون، بەم دوایەش لێكۆڵینەوە ئەكادیمییەكان بە نەخۆشى وەسفى دەكەن، ئەوەتا لە ڕاپۆرتێكى دكتۆرەكانى زانكۆى ئەلۆپات (University of Allopath)دا هاتووە:" خۆشەویستى نەخۆشییە و نیشانەكانیش زۆرن وەك، ترپە ترپى نائاسایى دڵ، ئارەقەكردن، دالغە لێدان و مشەوەشى مێشك، قسە هەڵبزڕكاندن، تێكچوونى خەو. ئەمەیش بارێكى بایەلۆژى و دەروونییە، لە هەموو تەمەنێكدا بەسەر هەردوو ڕەگەز دادێ، كە دەكرێ بە دۆخێكى ئاسایى وەریگرین". [٢١٢] ناوى زانستیى ئەم نەخۆشییە (Erotomania) یە.

ئەمەش نزیكە لەو چیرۆكەى كە دەڵێن:" كوڕى میرێكى ئێران و توران تووشى نەخۆشیەك دەبێت، تەبیب و حەكیمەكان هیچ چارەیەكیان بۆ ناكرێ، كاتێك (ابن سینا)ى حەكیمى ناودارى دەهێنەسەر، دەبینى كوڕە لاواز و لیوبەبار و ڕەنگ پەڕیووە، پەنجەكانى دەخاتە سەر دەمارى مەچەكى و بە كوڕە دەڵێ، ناوى گەڕەكەكانى شارەكەتم بۆ بڵێوە. ئەوجا دەڵێ ناوى بنەماڵەكانى ئەم شارەم بۆ بڵێوە. یەكسەر (ابن سینا)ى حەكیم، لە ترپەى دڵى كوڕەكە تێدەگات و بە باوكى كوڕەكە دەڵێ: بڕۆن لە ماڵى فلان خانەوادە كە لە فلان گەڕەكە، ئەو كچە بۆ كوڕەكەتان بخوازن

---

[٢١٢])http://www.naturalnews.com/٠١٠٨٢٥_counterthink_drug_racket.html

که خۆشی دەوێ، کوڕەکەتان عاشقە!"[٢١٣] خۆشەویستی لە بوارە هەرە گەورەکانی ژیانە کە زۆرترین مەرەکەبی بۆ ڕژاوەتە سەر کاغەز. نووسراوەکان کۆکن کە خۆشەویستی هێزێکی سۆزداریی یەکجار مەزن و کاریگەری بەدەر لە ئیرادەی مرۆڤە، وەك با و باران و لافاو و خۆرەتاو وایە، کە هیچ دەسەڵاتێکمان بە سەریاندا ناشکێ. یۆنانییە کۆنەکان (٧) وشەیان بۆ پێناسەی قوناغەکانی خۆشەویستی نێوان کوڕ و کچ داڕشتووە: سروشتی، دۆستایەتی، مەیلداری، بێمەرجی، دەستبازی، هاوسەرگیری، خۆویستی. لێ سەرەڕای ئەو هەموو جۆرە خۆشەویستەییەی کە هەیە، جار هەیە کەسەکان سەرگەردانی جۆرێك لە خۆشەویستی دەبن، کە لە هی کەس ناچێ، بەدەر لەو خۆشەویستییە، کە بۆ خودا و دڵدار و باوان و برادەر و منداڵ و شتەکانی دەرووبەر هەمانە. بۆیە دەگوترێ خۆشەویستی کوێرە و سەرکێشە و بێمەرجە و ڕاستەوخۆیە و هەستێکی سروشتی شێت و شەیداکەرە.

زانست بەم شێوەیە کردارە سەرنجڕاکێشەرەکانی عاشقان ڕاڤە دەکات: لە لەشی مرۆڤدا چەندان داینەمۆی بەرهەمهێنەری وزە هەیە، جا گاریگەرترینیان، وزەی ئەڤینە، کە لە بەهێزیدا بێ سنوورە. هەر ئەو وزەیە بووە کە فەرهادی بەستەزمانی بە خۆی و کولێنگێکەوە بەو شاخە سەختانەی کێوی بێستوون گرفتارکرد!

ئەگەر ئەم پێشەکییە بکەینە دەروازەیەك بۆ جیهانی خۆشەویستی لە دیدی لەتیف هەڵمەتەوە، بە گوێرەی ئەو قەبارە گەورە و کێشە قورسەی کە لە کۆبەرهەمە شیعرەکانیدا هەیەتی، دەڵێین، کورتکردنەوەی ئەم بابەتە لە چەند دێڕێکدا، ناحەقییە لە بەهرە و قەڵەمی ئەو زاتە، چونکە بازن و مەودا و ڕەهەندەکانی هێندە فراوان و فرەجۆرن، کە لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆ هەڵدەگریت، وەك: (خۆشەویستی لە جیهانبینی شیعرەکانی لەتیف هەڵمەتدا)، ئەگەر دیقەتێك لەم خشتەی خوارەوە بدەین، درك بەوە دەکەین، کە ئەو شاعیرە هەڕەمەکییانە و بەبێ

---

[٢١٣]) دیدەنی، رابعەی مام سابیری حەلێ، کۆیە، نەورۆزی ١٩٨٥

مەقسەد و مەغزا ئەم زاراوانەی بەم ڕووبەرە فراوانە لە دەقەكانیدا تەوزیف نەكردوو، هەرچەند مەرج نییە كە كۆی وشە و زاراوەكان هەر بۆ (خۆشەویستی) بەكارهاتبن:

| وشـە | جـار | وشـە | جـار |
|---|---|---|---|
| دڵ | 1112 | کـچ | 951 |
| شـەو | 851 | چـاو | 752 |
| خوێن و خوێناو | 489 | یـار | 484 |
| قژ و پرچ | 338 | جوان ـ ی | 330 |
| حەز | 271 | دڵدار ـ ی | 227 |
| زام و برین | 178 | لیـو | 127 |
| خۆشەویست ـ ی | 112 | مـۆم | 76 |
| فرمێسک | 67 | نهێنی | 65 |
| گریـان | 61 | باوەش | 47 |
| ڕق | 17 | ناشـیرین | 15 |

(لە دیـوانی لەتیف هەڵمەتدا)

بۆ ئەوەی غەدر لە شاعیر نەكەین، لێرەدا ڕەخنـە و لێكدانەوەكـەی ئێمـە سـنووردارە، تەنیا ئەو دەقەشیعرانەمان هەڵبژاردووە كە پەیوەستن بە خۆشەویست و ئەڤینداریيەك كە لـەژێر سێبەر و ساباتی دایكدا چاوشاركێیان كردووە. دەمانەوێ لە سونگەی ئەو دەقانەوە وەڵامی ئەم پرسیارانە وەرگرینەوە:

- چۆن فەزای خۆشەویستی دایك فەزای خۆشەویستی دڵدارەكەی (دڵدارەكانی) شـاعیری داگیر كردووە، یان بە پێچەوانەوە؟
- ئەڤینداری شاعیر چەندە دوور و نزیكە لە خۆشەویستی دایك؟

- له كێبڕكێی گوریس ڕاكێشانی نێوان دایك و دڵدار (دڵدارەكانی) شاعیر، كامیان دەیبەنەوە؟
- هونەركاری شاعیر لەم ڕشتەدا، چ نمریەك وەردەگرێ؟
- لەو جۆرە خۆشەویستییەدا، لەتیف هەڵمەت بەكام شاعیری كورد دەشوبهێندرێ ؟

كورد دەڵێ: (گەڵا نییە بە بای شەماڵ نەلەرییێتەوە)، جا كاتێك ئەو گەڵایە لە شێوەی شاعیرێكی لاوی دڵڕەنجاوی دەشتی گەرمەسێر خۆی ڕادەستی ئەو شنە و شەماڵ و سروانە دەكات، كە لە دوورە كوێستانەكانەوە هەڵدەكەن، سەما و لەرینەوە و لەرزانەوەی دڵ، لەگەڵ ڕتم و ئاواز و نەغمەی شیعری برینداركراو، خۆیان نمایش دەكەن. دەمێكە سوقرات گوتوویەتی:" پێكهاتەی خۆشەویستی یەك تاكە ڕۆحە، لە دوو جەستدا." [٢١٤]

لێ لە شیتەڵكاری ئەم دەقەی خوارەوە ـ وە زۆربەی هەرە زۆری دەقەكانی دیكە، دەگەینە ئەو ئەنجامە، كە ئەو هاوكێشەیە، لە جیهانی خۆشەویستی لەتیف هەڵمەتدا، بە شێوەیەكی لاسەنگ دەكەوێتەوە، چونكە هەرچەند ئەویش پابەندی فەلسەفەكانی ئەو (یەك تاكە ڕۆحەیە)، بەڵام (دوو جەستەكە) ـ ئەگەر ئاماژە بە ناوەكانیشیان كرابێ ـ ناسراو و دیار نین. بڕوانە ناونیشانی ئەو دەقە (خۆشەویست)ە، بەڵام (خۆشەویستێك)، كە ڕوكن و توخم و بنەماكانی خۆشەویستییەكەی ناكامڵ و نیوەچڵە. هەر ئەمەش وایكردووە خۆشەویستییەكەی شاعیری (بۆ دڵدارەكەی) ئەوەندەی لە خەو دەچێت ئەوەندە لە دڵداری و ئەڤینداری ناچێت. بۆچی؟ چونكە هەر هەموو دەردە دڵ و حەسرەت و غەزەل و مەدح و ستایش و لاواندنەوە و گوزارشتەكان هی شاعیرن، گەر بڵێین حەرفێكمان لە دڵدارەكەی نەبیستووە و بچوكترین سۆز و هەستی ئەڤینداری ئەو بۆ ئەو شاعیرە سووتاوە نابینین، دروستە. لەوەتەی دەقنووس غەزەل و هونراوەی دڵداری دەنووسێتەوە، ئەوە هەر خۆیەتی دەردەدڵی خۆی هەڵدەڕێژێت و كل لە چاوان و خەنە لە قژ و دەست و پەنجەی ئەو دولبەرە هەڵدەسووێ! كەواتە:

---

[٢١٤])https://www.brainyquote.com/quotes/keywords/love.html

- ئەویندارییەکەی دەقنووس پتر خەونە.
- دولبەر، لەسەر کورسییەك بەرانبەر شاعیر دانیشتووە و نوقەی لێوە نایــەت و ســۆزێك بۆ ئەو دەرنابڕێت.
- دڵدارییەکەی دەقنووس لێوان لێوە لە دوو دڵی و دڵەڕاوکێ.
- بەدەگمەن (یەکێتی بابەت) لە غەزەڵەکانیــدا دەبینرێــت، هەمیشــە ســێبەری خــاك و نەتەوە و سروشت و دایك و... ـ یان، بەسەرەوە دیارە.
- نیگەرانی خەسڵەتێکی دیاریی دەقە دڵدارییــەکانی ئــەون، نیگــەرانی ڕۆح، نیگــەرانی نامۆیی، نیگەرانی مەحرومی، نیگەرانی تەنیایی، نیگەرانی زوڵم و نادادپەروەوری.

پێش ئەوەی شیکرنەوەی دەقەکەتان بۆ بخەینە ڕوو، فەرموون چــاوێکی پێــدا بخشــێنن، شاعیر دەڵێ:

***هەموو شەوێ ئەستێرەکان***

***لەو ئاسمانە دوورەوە...***

***دێن و یەك یەك دەڕۆن بۆ لای***

***چەم و بەفری کوێستانانی گشت چیایە...***

***ئەی بۆ کچێ لە دوو سێ بست ڕێگاوە...***

***تەنیا جارێ بۆ لای ئەم شاعیرە نایە...؟***

***تۆ ببەرە ئەستێرەو منیش دەبم بە کانی...***

***ڕووت بەرەوەو مەمکەکانت***

***بدەرە بەر شنەی شەماڵ***

***مەمکەکانت بدەرە بەر...***

***تریفەی مانگەشەوی کاڵ...***

***بیاندەرە دەستی حەزی منالێکی شاعیرەوە***

***کە بێ دایکەو ئەمشەو دەگری بۆ پرتەقاڵ***

***کە ڕۆژ داهات***

*ببەرەوە بە کچە جوانەکەی جاران و*

*گۆزەیەکم لێ پڕبکەو ببە بۆ ماڵ*

*شەو لە ژوور سەرت دامبنێ*

*کاتێ نووستن...*

*دایك و باوك و خوشك و برات...*

*هەورێ هات و توایەوە*

*بۆ ناو دەم و پرچ و گۆنات*

*بە کەس نەڵێی... منم ئەوە...*

*لە تەنیایی شەو ترساوم...*

*دەرم نەکەی تۆ بەو شەوە*

*تووڕە نەبی لە هاتنم*

*توخوا دایکت هەڵنەسێنی....*

*دوایی دەمرم زۆر شەرمنم.* [215]

گەرچی وشەی (خۆشەویست) ناونیشانی دەقەکەیە، بەڵام بە پرسیارێکی گومانـاوی دەستپێدەکا، کە دڵدارێکی سووتاو لەسەر سەکۆی عیشق نمایش دەکات، تەنیایە و بانگی کەسانێك دەکات کە لەو دیوی پەردەکە دانیشتوون و هەر ناشیبینن! (*ئەی بۆ کچێ لە دوو سێ بست ڕێگاوە.../ تەنیا جارێ بۆ لای ئەم شاعیرە نایە...؟*)، بڕوانن، ئەستێرەکان شەوانە چاوبازی لەگەڵ چەم و کانی و بەفری کوێستانان دەکەن، دەقنووس تەمەنا دەکات (هەر جارێك) ئەو ئەستێرە سەردانی دڵی ئەو بکات. شوبهاندنی دڵدار بە ئەستێرە، بەخشینی سیفەتی دوورییە بەو کەسە کە ویساڵ و لە ئامێزگرتنی کارێکی ئەستەمە.

شاعیر لەدیاردەکانی سروشتەوە شۆڕدەبێتەوە بۆ ناو حەزەکانی خۆی، دەیەوێ وەك مانگ و کانی چۆن ئاوێزانی یەکتر دەبن ئەوا ئاوێزانی خۆشەویستەکەی بێت. دەیەوێت لەشەو و

---

[215] ) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ١٥٩

لەبێئاگاییەدا حەزە کەبتبووەکانی خۆی تێربکات. وەك چۆن بەمنداڵی یاری بەپرتەقاڵ دەکرد، ئاواش یاری مەمکە پرتەقاڵەکە بکات. هەڵبەتە لەکۆمەڵگای ڕۆژهەڵاتی ناوەندا لەکاتی بینینی دیاردەیەکی وەکو بینینی کوڕ و کچ پێکەوە لە جێژوان. باوك، برا، مام، خاڵ، شێخی عەشیرەت...واتا نێرینەکان بەشانازییەوە دەستیان لەوکارەدا سوور دەکەن، کەچی شاعیر لە باوکی نەترساوە، بەڵکو ترسی دایکی هەیە، چونکە دایکی بیبینێ، لەشەرما دەمرێ."شاعیر ئەو شیعرەی لەناخی نەستەوە نووسیوە، لایەنی شەرم کردن لە ئافرەت لەنەستی شاعیردا هەیە." [٢١٦]

لەتیف هەڵمەت سەبارەت بە شەرم کردن لە ئافرەت دەڵێ: "من لەمنالّییەوە شەرمن بووم، ئەتوانم بڵێم کەسێکی تر وەك من لەماڵمان نەبووە بەقەد من شەرمن بێت، ماڵیشمان قەڵەباڵخ بووە، نەك بڵێی ڕۆژێك و دوو ڕۆژ بێت، بەلاّم من هەمیشەو هەمیشە لەژنەکان شەرمم دەکرد... ئێستاش ئەو پاشماوەی شەرمەم هەرلەلاماوە، ئەتوانم بڵێم نەمتوانیووە لەسەدا سەد بازنەکە بشکێنم، یا خۆم واهەست دەکەم کە نەمتوانیووە لەوانەیە توانیبێتم و خۆم لایەنی دەروونی خۆم وائەگەێنێ وامپێدەڵێ، کە هێشتا ماوتە بیشکێنی." [٢١٧]

شاعیر یەکجار تینووی باوەشی ئەو کچەیە و هەرزەکارانە لە وێنەیەکی ئیرۆتیکانەی هەوەس ورووژێنەر، خواست و داوای خۆی لەم کچە بەیان دەکات و دەڵێ: (*ڕووت بەرەوەو مەمکەکانت/ بدەرە بەر شنەی شەماڵ/ مەمکەکانت بدەرە بەر.../ تریفەی مانگەشەوی کاڵ.../ بیاندەرە دەستی حەزی منالّێکی شاعیرەوە*). ئەو هەر بە ڕووتبوونەوەی ئەو قایل نییە،

---

[٢١٦]) هاوژین سلێوە، ڕەهەندی دەروونی لە شیعرەکانی لەتیف هەڵمەت دا، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١٣، ل ١٦٦

[٢١٧]) دیدەنی هاوژین سلێوە لەگەڵ لەتیف هەڵمەت، ١٩ / ٣ / ٢٠١٢

دەیەوێ مەمکە ڕووتەکانی بۆ ئەو بداتە بەر شەماڵ و تریفەی مـانگ و بیانکاتـە پرتـەقاڵ بـۆ منداڵێکی شاعیر.

لە ترۆپکی لەزەت و نزیك بوونەوە لە چرکەساتی (ئۆرگازمی ڕۆحی و شـیعری)، شـاعیر دایکی وەبیردێتەوە و یەکسەر دەبێتە منـداڵێکی چـوار پێـنج سـاڵانی دایـك مـردوو، کـە بـۆ پرتەقاڵێك بە کوڵ دەگری!

لە دواین کۆپلەدا، دەستەواژەی: (*دەرم نەکـەی/ تـوڕە نـەبی/ دایکـت هەڵنەسـێنی..*)، بەڵگەن کە ئەو دڵدارە بۆی نایەتە ژووان و بەهاتنی ئەو بەو نیوە شەوە بۆ ژوورەکەی بی ئاگایە.

بڕوانن ڕستەی (*دوای دەمرم زۆر شەرمنم*)، پارادۆکسێکی کەتواری تێدایە. لە لایەك بـەو پەڕی بێشەرمی داوا دەکات کچە خۆی بۆ ڕووت بکاتەوە و مەمکەکانی....)، لە لایەکی دیکە دەڵێ لە شەرمان دەمرم، هەردووکیان ڕاستییان تێدایە، وەك عاشق، ئەو کراسی شەرم و شکۆی لەبەر خۆی دادڕیوە، وەك کەسیش، ئەو کەسێکی شەرمنە.بینیتان، کچە لەفزی لەزاری ناگەڕێ، هەر گوێمان لە دەقنووسە.

بۆ وردتر شـیتەڵکاری دەقێکـی دیکـەی شـاعیر، ئاوڕێـك لـە تیـۆری (سێگۆشـەی ئـەڤین) دەدەینـەوە کـە دەروونناسـی ئەمـەریکی( ڕۆبێـرت سـتێرنبێرگ Robert Sternberg)دایهێناوە.[218]

---

[218]) ڕۆبێرت ستێرنبێرگ (١٩٤٨ - )، پرۆفیسۆر لە زانستی گەشەی مرۆیی لە زانکۆی ( Cornell University)،سەرۆکی پێشتری زانکۆی(University of Wyoming)، زانای دەروونناسی و زانستی پێوانەی تاکو ئێستا (١٣) بڕوانامەی دکتۆرای فەخری پێشکێش کراوە و بڕی (٢٠) ملیۆن دولاری بۆ درێژەدان بە لێکۆڵینەوەکانی دراوەتێ. ئەو یەکێکە لەو (١٠٠) زانا دەروونناسانەی جیهان، کە لەلایەن (کۆمەڵەی دەروونناسانی ئەمریکا)، بە باشترین دەروونناسی سەدەی بیست دەست نیشان کراون. خاوەنی (١٦٠٠) وتار و چەندان کتێبی دەروونناسییە:

Sternberg، R. J. The Triangle of Love: Intimacy، Passion، Commitment. New York: Basic Books; 1988. (كتێب )

بڕوانه ئەم هێڵکارییە:




پووختەی تیۆرییەکە ئەمەیە: پێکهاتە سەرەکییەکانی ئەڤین (خۆشەویستی) بریتییە لەو (٣) توخمە: (حەز/ هۆگری)، (ئەڤیداریی بۆش/ پابەندبوون)، (عیش و شەیدایی/ سۆز). کە هەر یەکێکیان دەبنە بەردی بناغەی گۆشەیەك لەو سێگۆشەیەی کە ئەو وێنەی کێشاوە. ڕێژە و ڕادەی خۆشەویستی هەست پێکراوی دڵ و دەروونی تۆ بەندە بە هێز و لاوازی هەر توخمێك لەو (٣) توخمە. جا قۆناغەکانی خۆشەویستی، دەرهاویشتەی گەیاندنی (٢ یان ٣ ) لەو گۆشانەیە بەیەکەوە، ئەو خۆشەویستییەی کە هەڵگری هەر یەك تاکە توخمە، نەزۆك و زرو عومرکورتە.

مەبەست لە حەز (هۆگری) ئەو لێکچوون و نزیك بوونەوەیە، کە لەنێوان کەسەکاندا هەیە، جا لە بیرورا و بۆچوون بێ، یان لە مەزاج و چێژ و پەیام و ئامانج و چالاکی...تاد. ئەمەیش ڕوکنێکی بنەڕەتی دۆستایەتی و ئەڤینی ڕۆمانسییە.

توخمی عیشق و سـۆز، پاژە هەستەوەرەکەی حەز و ئارەزووی پەیوەندییە خۆشەویستییەکانە.

هەرچی توخمی سێیەمە: ئەڤینداریی بۆش (پابەندبوون)، بەو واتایەی کە خۆشەویستییەکە، نە دەرهاویشتەی حەز و ئارەزووی ڕۆمانسی و شەهوەتی سێکسییە، نە هۆگریی و لـێ نزیکـی، بەڵکو تاکە کۆڵەگەکەی پابەند بوونە، بەس پابەند بوون بریاڕدەری ئەو خۆشەویستییەیە.

لە بەیەك گەیشتنی دوو یان سێ لەو گۆشانەی ئەم سێگۆشەیە، ئەم (٤) جۆرە خۆشەویستییە دروست دەبن:

١. *دۆستایەتی = هۆگری + پابەندبوون*

(لایەکەی دەستە ڕاستی سێگکۆشەکە) لەم خۆشەویستییە ئارەزوو و شەهوەتبازی بوونی نییە و ماوەکەشی بەندە بە گەرم و گوڕی ئەو هۆگریی و پابەندبوونە.

٢. *ئەڤینی ڕۆمانسی = هۆگری + سـۆز*

(لایەکەی دەستە چەپی سێگۆشەکە)، لێرەدا سۆز و عیشق و شەیدایی زۆر بەهێزە، ئەڤینەکە جیهانی ڕۆح و جیهانی جەستە داگیر دەکات.، بەڵام ئەمە مەرج نییە تا سەر بێ.

٣. *گەوجە ئەڤین = پابەندبوون + سـۆز*

(ئەمەیان بنکەی سێگۆشەکەیە)، پەیوەندییەکە خێرا گڕدەسێنێ، بەڵام خاو و هێـواش گەشـە دەکات، هاندەرەکەی سۆزێکی بەتینە کە بەربـەرەکانێ کردنـی ئەسـتەمە، بـە گەوجـە ئـەڤین ناوزەند کراوە، چونکە ئاکامەکەی زۆر جار هاوسەرگیرییەکی نەزۆك و عومورکورتە، یان هـەر زوو پەیوەندییەکە هەڵدەوەشێتەوە و لەبار دەچێ.

٤. *خۆشەوییستیی کامڵ = هۆگریی + عیشق + پابەندبوون*

(ئەمە دڵی سێگۆشەکەیە)، کە بە خۆشەویستی نموونەی ناسراوە، گەیشتن بەم خۆشەویسـتییە لە هەموو ئەوانی دیکە زەحمەتترە، بەڵام خۆشـترین ئاسـوودەیی و دڵنـەوایی بـە خاوەنـەکانی دەبەخشێ، تەنیا مەرگ لێکیان دادەبڕێنێ.

چونکە پرۆفیسۆر (ڕۆبێرت ستێرنبێرگ (بۆخۆی زانای دەروونناسی پێوانەیی بووە، بە گوێرەی ئەم سێگۆشەیە نمرەی بۆ جۆرەکانی خۆشەویستی داناوە، بەگوێرەی هێز و خەست و خۆڵی و کرچ وکاڵی تۆخمەکان.

با ئێستا لە سۆنگەی (تیۆری سێگۆشەی ئەڤینداری)، ئەم دەقەی لەتیف هەڵمەت بخوێنینەوە و هەڵسەنگێنین. فەرموو ئەمە دەقەکەیە:

***(خەوەکەی لالە سەرحەد)***

***تاقە دڵدارێکم هەیە... ئەو دڵدارەش تۆی...***

***تاقە شارێکم هەیە... ئەو شارەش تۆی***

***بەغدا پایتەختی عێراقە***

***تۆش... دەسگیرانی منی...***

***پایتەختی منی...***

***من... لەهەموو ڕێگایەکەوە... بۆلای تۆ دێم***

***بۆلای تۆ دێمو***

***لە ڕوخسارە زیزەکەتا... خەمی هەمووماڵەکانی***

***سەرکارێز بەدی ئەکەم...***

***ئەگەر ڕۆژێ... فەرمانی بەند کردنم دەرچێ...***

***حەز ئەکەم لە توێی باسکەکانی تۆدا... کۆت کرێم...***

***گەر فەرمانی هەڵواسینم دەرچێ...***

***حەزدەکەم بە گلۆڵەی قژەکەی تۆدا هەڵواسرێم...***

***من نازانم نەتەوە یەکگرتووەکان***

***بۆچی...***

***دڵداری قەدەغە ئەکەن...؟***

***ئای ئەگەر من ڕووبارێك بام***

***کێ دەڵێ مانگەشەوێکی هاوین***

لە شەپۆلەکانمدا بە ڕووتی گۆرانیت نەدەوت...!
ئەوە هەموو زامەکانم... بیانکەرە چەترێکی
فراوان...
لە ژێر لێزمەی زەنگۆڵەی بارانەکانی زستاندا
گۆرانی دڵداری بڵێ
ئەوە هەموو زامەکانم... بیانکەرە کەپرێکی
جوان...
لە ژێر شەپۆلی قرچەی گەرمای هاوینا... لاوکی
خۆشەویستی بڵێ
ئەوە هەموو زامەکانم... بیانکە بە چەپکێ گوڵی
گەش و...
لە جەژنی لەدایکبوونی خۆرێکی تازەدا بیاندە لە تاڤگەی
قژە درێژەکەت...
گەر دەریابم... من حەز ئەکەم. شەپۆلەکانم... هەر
لمی زیوینی...
کیشوەری لەشی تۆ تەڕ بکات
گەر هەتاو بم... من حەز ئەکەم هەر لە چاوەکانی تۆدا...
هەڵ بێم و ئاوابم...
گەر پەپوولە بم... من حەز ئەکەم هەر لە دارستانی
قژەکەتا...
گەردەلوولی ئاوارەیی ونم بکات
تینوومە گیانە... مەگەر ڕووباری دەستە پیرۆزەکانت
کڵۆی برۆنزی تینوێتیم بشکێنێ...
برسیم گیانە... مەگەر سێوە لاسوورەی ماچەکانت

تێرم بکات...
تۆ ئەوەندەی هەتاو لەمنەوە دووری...
هەتاو ئەوەندەی تۆ لە شارەکەمەوە دوورە...
شارەکەشم ئەوەندەی دایکم خەمبارە...
نەء گیانەکەم نەمن دەس بەرداری تۆ دەبم ونە سەوزایی
لە دارستانەکانی کوێستان
دەبڕێ و.. نە بێستانەکانی گەرمیان بێ شەمامە دەبن..
نەء فەرهاد واز لە شیرین ناهێنێ...
نەء نە فەرهاد ئەمجارە خۆی دەکوژێ و
نە من واز لە تۆ دێنم و..
نە گوڵ لە زەوی دەبڕێ..
خۆشەویستەکەم.. بەفر لە ئاودا ئەتوێتەوەو..
منیش لە خۆشەویستی تۆدا ئەتوێمەوە..
کچێ.. ئەگەر ئەمجارە وتیان: دڵدارەکەت
شێتە...
ئەگەر ئەمجارە وتیان: لەتیف هەڵمەت شێتە..
پێیان بڵێ: شێتی... منە شێتی بارانێکی ترە...
شێتی بەهارە...بەهاری کورد...
شیرینو...فەرهاد... لاس... و... خەزاڵ...
تۆو... من...
دڵدارو شار، ڕەگ و زەوی. مەل و لانە. هەرگیز لە یەك جیانابنەوە...
نەء ئازیزەکەم. دڵداری پاتری نییە..سکراب
بێ...
نەء گیانەکەم.. دڵداری.. دەریا نییە بڵێین وشکی

*کرد..*

*دڵداری ئۆکسجینی ژیانە..*

*دڵداری هیمۆگڵبینە و*

*لەهەموو دڵۆپە خوێنێکماندا*

*لانەی هەیە...*

*زەوی هی جوتیارە..*

*کوردستان نیشتمانی کوردەو جێ ژووانی مەمو زینەو*

*تۆش... هەر بۆ منی و*

*منیش ئەو شاعیرە شێتەم*

*کە لمی هەموو ڕەشەباکان*

*چەمی هۆنراوەم لێخەن ناکات و*

*پەڕو باڵی سیمرخی ئەندێشەم*

*ناوەرێنێ و*

*چاوی ڕوانینم ناخاتە گلێ و*

*هەوری شەستە بارانی ئەوینم*

*لە ئاسمانی چاوەکانت دوور ناخاتەوە و*

*دیواری دڵم ناسمێ و*

*ڕێگای هەڵگوردم لێ ون ناکات...*[٢١٩]

هەرچەندە ناونیشانی ئەم دەقە درێژە، ئیحای ئـەوە هەڵـدەگرێ کـە کرۆکـی دەقەکـە لـە جیهانی واقیعییدا دوورە و خۆی لە ئامێزی خەون و خەیاڵ و زیندەخەون دەبینێتەوە، لـێ ئێمـە هەوڵدەدەین ئـەو خـەون و خەیاڵـە وەك نیشـانەیەکی نەخۆشـی (خۆشەویسـتی) سـەیرکەین و هاوچەرخانە شیتەڵکاری دەروونی بۆ بکەین. لێـرەدا مەبەسـت لـە (خەوەکـەی لالەسـەرحەد)،

---

[٢١٩]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٢٠١ - ٢٠٣

خەونەکانی (لەتیف هەڵمەت)ە لە زەمن و مەکانێکی دیاریکراوی تەمەنیدا، سەربوردەی ئەو خەون و (لالە سەرحەد)ەش لەتیف هەڵمەت وای گێڕایەوە: " لالۆ سەرحەد کەسایەتییەکی زۆر ناسراوە لەناو کوردەواریدا، من کە منداڵ بووم لەو کۆمەڵگادا زۆر ناسرابوو، لالۆسەرحەد خەونێك دەبینی دەڵێ لە خەونما خوام بینیوە ئیتر ئەم چووە بۆلای خودا و لەمەجلیسی خودا دانیشتووە، خوا قەنەیەکیشی داوەتێ، ئیتر لەم جۆرە خەونانەی لالە سەرحەد، زۆر بوو لەکۆمەڵگادا، چۆن مەلا نەسرەدین و ئەشعەب لە ئەدەبی گەلاندا ناویان هەیە، ئەو تەمەنەی منیش کە منداڵ بووم بەتایبەتی لەتەمەنی دوازدە ساڵی دا، خەونەکانی لالە سەرحەد بەربڵاوبوون، بەتایبەتی لەو مەجلیسانەی باوکم، منیش کە لەشیعردا بەکارم هێناوە، ویستم بە زیندوێتی بیهێڵم و بەردەوامی خەون ببینم بەناوی ئەوەوە."[٢٢٠]

لە پراکتیزەکردنی دەقەکە بە گوێرەی (٣) توخمەکەی (تیۆری سێگۆشەی ئەڤینداری)، توخمەکان ئەم دێڕە شیعرانەیان بەردەکەوێ:

١. توخمی حەز (هۆگریی)

- *تاقە دڵدارێکم هەیە... ئەو دڵدارەش تۆی...*
- *تاقە شارێکم هەیە... ئەو شارەش تۆی*
- *تۆش.. دەسگیرانی منی...*
- *پایتەختی منی...*
- *من... لەهەموو رێگایەکەوە.. بۆلای تۆ دێم*
- *ئەوە هەموو زامەکانم... بیانکەرە چەترێکی فراوان...*
- *ئەوە هەموو زامەکانم.. بیانکەرە کەپرێکی جوان...*
- *ئەوە هەموو زامەکانم... بیانکە بە چەپکێ گوڵی گەش و...*

---

[٢٢٠]) دیدەنی هاوژین سلێوە لەگەڵ لەتیف هەڵمەت دا، سلێمانی، ٦ / ٧ /٢٠١٧

○ نەء گیانەکەم نەمن دەس بەرداری تۆ دەبم ونە سەوزایی

لەدارستانەکانی کوێستان

دەبڕێو.. نە بێستانەکانی گەرمیان بێ شەمامە دەبن...

○ نە فەرهاد واز لە شیرین ناهێنێ...

نە نە فەرهاد ئەمجارە خۆی دەکوژێو

نە من واز لە تۆ دێنم و...

نە گوڵ لە زەوی دەبڕێ...

○ شیرینو...فەرهاد... لاس... و... خەزال...

تۆو... من...

○ دڵدارو شار، ڕەگ و زەوی. مەل و لانە. هەرگیز لە یەك جیانابنەوە...

○ دڵداری ئۆکسجینی ژیانە..

دڵداری هیمۆگڵبینە و

لەهەموو دڵۆپە خوێنێکماندالانەی هەیە...

○ زەوی هی جوتیارە..

کوردستان نیشتمانی کوردەو جێ ژووانی مەم و زینەو

تۆش... هەر بۆ منیو

٢. <u>توخمی ئەڤینداری بۆش (پابەندبوون)</u>

○ ئەگەر ڕۆژێ... فەرمانی بەند کردنم دەرچێ...

حەز ئەکەم لە توێی باسکەکانی تۆدا... کۆت کرێم...

○ گەر فەرمانی هەڵواسینم دەرچێ...

حەزدەکەم بە گڵۆڵەی قژەکەی تۆدا هەڵواسرێم...

○ نەء ئازیزەکەم. دڵداری پاتری نییە...سکرابی بێ...

○ نەء گیانەکەم... دڵداری... دەریا نییە بڵێن وشکی کرد..

٣. <u>توخمی عیشق و شەیدایی (سـۆز)</u>

○ ئای ئەگەر من ڕووبارێك بام

کێ دەڵێ مانگەشەوێکی هاوین

لە شەپۆلەکانمدا بە ڕووتی گۆرانیت نەدەوت...!

○ گەر دەریابم... من حەز ئەکەم. شەپۆلەکانم... هەر

لمی زیوینی...

کیشوەری لەشی تۆ تەڕ بکات

○ گەر هەتاو بم... من حەز ئەکەم هەر لە چاوەکانی تۆدا...

هەڵ بێم و ئاوابم...

○ گەر پەپوولە بم... من حەز ئەکەم هەر لە دارستانی

قژەکەتا...

گەردەلوولی ئاوارەیی ونم بکات

○ تینوومە گیانە... مەگەر ڕووباری دەستە پیرۆزەکانت

کڵۆی برۆنزی تینوێتیم بشکێنێ...

○ برسیم گیانە... مەگەر سێوە لاسوورەی ماچەکانت

تێرم بکات...

○ خۆشەویستەکەم.. بەفر لە ئاودا ئەتوێتەوە و..

منیش لە خۆشەویستی تۆدا ئەتوێمەوە..

○ پێیان بڵێ: شێتی.. منە شێتی بارانێکی ترە...

جا بەگوێرەی هاوکێشەکانی تیۆرییەکە، خۆشەویستییەکەی دەقنووس پەلوپۆی لێدەبێتەوە و پتر لە ناونیشانێك وەردەگرێت، بۆ نموونە:

هۆگریی + پابەندبوون= دۆستایەتی، کەواتە چونکە هەر دوو توخم: (هۆگریی و پابەندبوون) هەنە، خۆشەویستییەکە دەچێتە ژێر چەتری دۆستایەتی و هاوڕێیەتییەوە.

هۆگریی + سۆز= ئەڤینی ڕۆمانسی، ئەم دوو توخمەش هەر هەنە، کەواتە خۆشەویستییەکی ڕۆمانسی لە ئارادایە.

*پابەندبوون + سۆز = گەوجە ئەڤین*، ناچارین، دەبێ بڵێین ئەم جۆرەشیان هەر هەیە، هاوکیشەکانی تیۆرییەکە وادەڵێ نەك ئێمە.

بۆ ڕوونکردنەوەی هەموو گۆشەکانی بابەتەکە. واباشترە ئەم (٣) خاڵەش بخەینە ڕوو:

١. به هیچ شێوەیەك تەرەفی دووەمی خۆشەویستییەکە، کە (دولبەرەکەیە) نە دیارە و نە بوونی هەیە، وەك ڕۆح و هەست و سۆز و زمان. ئەوە هەر دەقنووسە دوکەڵی ئاوری سینەی بەبا دادەدا و وەسفی خۆشەویستی و سۆز و ئەمەکداریی خۆیمان بۆ دەکات.

لەم دێڕانەی خوارەوە تێدەگەین کە دەقنووس خۆشی بەوە دەزانێ کە، (دولبەرەکەی) لە تەکی نییە و زۆر لێی دوورە، جا وەك یادەوەرنووسی فەرەنسی (ڕۆگەر دی ڕابوتن Roger de Rabutin١٦١٨ ـ ١٦٩٣) دەڵێ:" دووری لە خۆشەویستیدا وەك ڕەشەبا وایە، ئاگری بچووك دەکوژێنێتەوە و ئاگری گەورەش هێندەی دی خۆش دەکات." [٢٢١]

- تۆ ئەوەندەی هەتاو لەمنەوە دووری...
- هەتاو ئەوەندەی تۆ لە شارەکەمەوە دوورە...
- شارەکەشم ئەوەندەی دایکم خەمبارە...

٢. دەقەکە بە تارایەکی نەخشینی ئاڵوواڵای زیندەخەون داپۆشراوە، ناونیشانەکەشی هەر (خەوەکەی لالە سەرحەد)ە، ئەمانە هەمووی هۆکارن بۆ هەڵتەکاندن و هەڵوەشانەوەی هاوکێشەی (خۆشەوییستیی کامڵ = هۆگریی + عێشق + پابەندبوون). بۆچی؟ ئاخر ئەوە هەر دەقنووسە، کە ئەو هەموو هۆگرییەی بەکۆڵی خۆی داداوە و بەم هەموو عیشق و سۆزەوە خۆی گرفتار

---

[٢٢١] www.britannica.com/biography/Roger-de-Bussy-Rabutin

کردووه و بەم هەموو مەرج و شەرت و شـروتە خـۆی پابەنـد کـردووە. پێویسـتە هـەمان (٣) توخمەکە لە لایەن تەرەفی دووەمیشەوە ڕەنگدانەوەیان هەبێ، (کە نییانە).

لە دەقەکەدا (٢) جار وشەی (دایك) ئاماژەی پێدراوە: *(لە جـەژنی لـەدایکبوونی خـۆرێکی تازەدا)*، کە دژی مەرگ و لەگۆڕنانە، وە *(شارەکەشم ئەوەندەی دایکم خـەمبارە...)*، ئەمـەی دووەمیان کاریگەریی قورسی هەیە، لەلایەك گەورەیی و دژواری خەمەکانی دایکی دەقنـووس دیاریکراوە، کە بە قەد خەمی شارێکە و لە لایەکی دیکە دەقنووس نـەیتوانیوە لـە گەرمـەی زیندەخەوەکەشیدا دایکی فەرامۆش و لەبیر بکات.

(لە پووختەی تەوەرەکە بەراوردی خۆشەویستییەکان دەکەین: هی دایك و دولبەر)

لەڕوو زمانی شیعری و وێنەی هونەری و بەربلاوی خەیاڵ و خۆش ئاوازی دەنگ و مۆسیقای دەقەکە، شاعیر وەستایانە بەهرە و کارامەیی خۆی نواندوە و فەزایەکی یەکجار فراوانی هەسارە و زەمەنێکی بێ مێژووی لە ناو دێڕەکاندا نمایش کردووە، لە کۆتا کۆپلەشدا، جۆرە نەمرییەك بە شیعرەکانی خۆی دەدات، کە نیشانەی خەستی باوەڕداری ئەوە بـە ئاینـدەی کـراوە، هەرچـەندە دەبوایە ئەمە بڕیاری خوێنەر و ڕەخنەکارەکان بوایە، نەك شاعیر خۆی!

***منیش ئەو شاعیرە شێتەم***
***کەلی هەموو ڕەشەباکان***
***چەمی هۆنراوەم لێخەن ناکات و***
***پەڕو باڵی سیمرخی ئەندێشەم***
***ناوەرێنێ و***
***چاوی ڕوانینم ناخاتە گلێ و....***

نووسەری ئەمەریکی (میگنۆن ماك لۆون Mignon McLaughlin ١٩١٣ ـ ١٩٨٣) جوانی گوتووە:" لە خۆشەویستیدا، یەك کۆ یەك یەکسانە بە هەموو شتەکان، لێ دوو کەم یەك یەکسانە بە سفر یان (هیچ)". [٢٢٢]

لە شیتەڵکاریی دەقێکی دیکەی شاعیر، بە گوێرەی بۆچوونەکەی (میگنۆن ماك لۆون) بێت، دەبێ بڵێین ڕەوسەی شاعیر لە خەرمانی خۆشەویستیدا، هەر خەیاڵ و ئاه و هەناسەهەڵکێشان بێ. ئەو هەموو فەن و فنوونێکی بەکارهێناوە بۆ نیشاندانی ڕادەی خۆشەویستی خۆی و هەوڵدان بۆ ڕازیکردن و ڕاوکردنی ئەو کچە دوورەی کە هەر بەچاوی خەیاڵ دێتە بەر دیدەی.

ناونیشانی دەقەکە: *(تۆ هەر لە دڵمای ئەی خەونە دوورەکە)*، نیگەرانی و ناڕەحەتی دەقنووس پشت ڕاست دەکاتەوە و دەستەواژەی (تۆ هەر)، نوێکردنەوەی بەڵێن و پابەندبوونی ئەوە، سەرەڕای ئەوەی کە چاك دەزانێ (خۆشەویستەکەی) ئەو خەونە دوورەیە کە ویساڵی مەحاڵە.

دەقەکە ڕیزبەندێکە لە پرسیارە و پرسیارەکانیش تێکەڵەیەکن لە ڕەستەی خەبەری و ڕستەی نەرێنی و ڕستەی وەڵام نادیار و ڕستەی تەموومژاوی و ڕستەی میتافیزیکی... کە هێندێکیان ئادگاری فەلسەفی و لاهۆتی و ئەفسانەییان پێوە دیارە. شاعیر پرسیار دەکات، نەك بۆ وەرگرتنەوەی وەڵام، بەڵکو بۆ ئیقناعکردنی دڵی دولبەرەکەی و ڕەواندنە گومان و داتەکاندنی تەپ و تۆزی شك، لە خۆشەویستییە بێگەردەکەی خۆی. دەقەکە لێوان لێوە لە زنجیرەیەك وێنەی هونەری.شاعیر دەپرسێ:

---

[٢٢٢]http://www.notablequotes.com/m/mclaughlin_mignon.html




یەكەمجارە دەقنووس، لە نێو حەرفی بەیتەكانیدا، ئیشارەتێكمان نیشـان دەدات، كـە ئـەو وەك سەربازێكی شكاو و یەخسیر، بەدەر لە ئیرادەی خۆی، تەسلیمی باوەشـی خۆشەویسـتەكەی بووە و و باوەشی دایكی فەرامۆش كردووە. هەرچەندە دان بـەوەدا دێـنێ كـە نـازانێ سـیحر و هۆكاری ئەو گۆڕانەی دڵ چییە و چ شتێك وای كردووە، لـەتیف هەڵمـەتی دوو سـێ سـاڵان بـە شێوەیەكی جیاواز سەیری جۆلانە و مەمك و بووكەشووشەكانی بكات! ئەو دەپرسێ:

***زۆر جار دەڵێم بۆچی منداڵ***

***لە جۆلانێ وەڕس دەبێ و تیا ناخەوێ...***

***مەمکی دایکی و شیری لەبیر دەچێتەوە...***

***بووکە شووشەو مووروویی لەبەر چاو دەکەوێ...***

ئەوەی کەوای کردووە دەقنووس ڕاڕا بێت و هەمیشە بەترسەوە بۆ پێشوازی خۆشەویستەکەی بچێت ئەوەیە: کە هەست دەکات خۆشەویستی کچەکان وەك ئەو خۆشەویستییە و هۆگرییە نییە کە لەباوەشی دایکیدا هەستی پێدەکرد، بۆیە هەڕەشە و گەف دەکات و بە بێزارییەوە دەڵێ:

***زۆرجار دەڵێیم تۆ لەدڵی خۆم دەردەکەم***

***دەرگای دڵم لەتۆ تون تون دادەخەم***

***باخی زامە تینووەکانم***

***بۆ کچێکی تر ڕادەخەم...***

ئەم دەقەش، وەك دوو دەقەکەی سەرەوە، پڕە لە دەلالەت، کە شاعیر وێڵە بەدوای خۆشەویست و خۆشەویستییەك کە چاك دەزانێ هەمان ئارامی و ئاسوودەیی ئەو خۆشەویستییەی پێنابەخشن، کە عومەرێك بوو پێی ئاشنابوو: خۆشەویستی دایکی. فەرموون ئەمە تەواوی دەقەکەی (*تۆ هەر لە دڵمای ئەی خەونە دوورەکە*)یە:

***بەفر جارێك***

***دەتوێتەوە...***

***ئەی بۆچی دڵ بۆ دڵدارێك***

***هەزاران جار دەکرێتەوە...؟***

***کە داری سەوز لە ڕەگەوە دەسوتێنن***

***ئیتر هەرگیز ناڕوێتەوە***

***باڵندەیەك لە هەرچ دێ یەك***

***هێلانەکەی بڕوخێنن...***

***لەهەچ جێ یەك***

پەڕو باڵی هەڵوەڕێنن...
بەجێی دیلێ و ناچێتەوە...
ئەی بۆچی دڵ لە خۆشەویست بێزار نابێ و
هەر گۆرانی بۆ دەڵێت‌و دەیلێتەوە...؟
من نازانم زەرنەقوتە چۆن لە هێلکە سەر دەردێنێ
من نازانم ئەستێرە چۆن لە ڕووباری شیناییدا
مەلە دەکاو دەجریوێنێ
من نازانم
تۆ لە کوێوە وەکو تیشکێ
کشای بۆناو چەمی گیانم
تۆ چۆن زانیت منی خەمبار
بێ وڵات‌و دەزگیرانم...
زۆرجار دەڵێم تۆ لەدڵی خۆم دەردەکەم
دەرگای دڵم لەتۆ تون تون دادەخەم
باخی زامە تینووەکانم
بۆ کچێکی تر ڕادەخەم...
زۆر جار دەڵێم بۆچی مناڵ
لە جۆلانێ وەڕس دەبێ‌و تیا ناخەوێ...
مەمکی دایکی و شیری لەبیر دەچێتەوە...
بووکە شووشەو مووررووی لەبەر چاو دەکەوێ...
ئەی بۆچی من... بۆ... تۆم لەبیر ناچێتەوە...
بۆ دڵی من هەر تۆی دەوێ...؟
هەزاران ساڵ
دەمم لەناو دەمتدا بێ

*تێر ناخۆم و وا دەزانم ماچێکیشم نەکردووە*

*هەزاران ساڵ*

*خەوم لەناو پرچ و پەرچەمتدا بێ*

*وا دەزانم خەوم هەر لێ نەکەوتووە*

*کچێ ئەگەر هەرچی ساتێ ئەم دڵەی من*

*تۆی خۆش نەوێ...*

*چەقۆ دەنێم لە گەردنی وەکو کەوێ...*

*گوڵت دیوە تۆ چۆن دەڕۆیت...*

*ئەی کۆتری ئەو کێوانەت نەدیوە چۆن هەڵدەفڕێت*

*ئەی نەتدیوە سوێسکەی نیوەڕوانی هاوین*

*لەو هەردانە چۆن مژ دەدا لە دڵۆپی ئاوی شیرین...*

*ئەی دیوتە چۆن خۆر دەکەوێ...؟*

*منیش ئاوا تۆم خۆش دەوێ...* [٢٢٣]

[٢٢٣]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ١٣٥ ـ ١٣٦

پووختەی تەوەرە:

کۆبەرهەمی شاعیر دەوڵەمەندە بە چەندان دەقی دیکە، کە بۆنوبەرامەی خۆشەویستی دایك و دڵدارەکەی تێکەڵ بەیەکتری بووین و دەکرێ ناوی لـێ بنـێین: (عــەتری خۆشەویســتی لــەتیف هەڵمەت). لە تۆژینەوەو هەڵسەنگاندنی دەقەکان دەگەینە ئەم ئاکامانە:

- فــەزای خۆشەویســتی دڵدارەکــەی زۆرە، بــەڵام هــی دایکــی دیــارتر و جێگیرتــر و بێگەردترە، خاڵییە لە گومان و ڕاڕایی.
- فەزای خۆشەویستی دڵدارەکەی نەیتوانیوە فەزای خۆشەویستی دایکی بشــارێتە و یــان کاڵ و ئاچوغی بکاتەوە.
- پارسەنگی خۆشەویستی دەقنووس بۆ ئەو دووانە لە هەڵبەز و دابــەز دایــە، ئەمــەیش دوودڵی ناخی دەقنووس نیشان دەدات، چونکە هەرگیز تێرنەبووە لە خۆشەویستی.
- لە کێبڕکێی گوریس ڕاکێشانی نێوان دایك و دڵدار (دڵدارەکانی)دا، کەسیان براوە نین، ئەوەی براوەیە دەقنووسە، کە بە سایەی ئەوانەوە بۆتە خاوەن ئەم دەقانە لــە ئــەدەبی هاوچەرخی کوردیدا.

لەتیف هەڵمەت دەڵێ: "من کتێبێکم پێشکەشی باوکم کردووە، دەتوانم بڵێم ژیانی باوکم لە ((ژنە جنۆکەکانی شێمەحمود))دا بەدەردەکەوێ، وەکو شیعر ئەگــەر چــی مــن خۆشەویســتی شیعر لەباوکمەوە فێربووم، چونکە ئەو هەمیشە شیعرەکانی خانی و سەعدی و... هتد بۆ بــاس دەکردم، بەڵام شیعرم بۆ باوکم نەگوتووە، هەر بەتەبیعەت لەماڵەوە برام هەبوو خوشکم هــەبوو، خوشکەکانم خۆشتر دەویست لەبراکانم تەبعی من وایە، کە مێینەم خۆشتر بوێ لە نێرینە."[٢٢٤]

---

[٢٢٤]) دیدەنی هاوژین سڵیوە لەگەڵ لەتیف هەڵمەت، ١٩/ ٣/ ٢٠١٢

## ( ٦ )

## دایــك لە جیهــانی خەونــدا

خەون ماڵی ڕاستەقینەی شاعیرە. ئەگەر خەون چەند ڕەنگێکی دیاری ڕشتە ئەدەبییــەکان بێت، ئەوا لە شیعردا، هەموو ڕەنگە سەرەکییەکانی سروشت و بوون و گەردوونە. کەم ئەدیب و نووسەر بەقەد شاعیر خەون دەبینن. خــەون و خــەیاڵ بــۆ شــاعیر هەمیشــە هــەوێنی ئیلــهام و شیعرن. مەغزای خۆدەخیلکرنە خەون بۆمەبەستی خەیاڵفراوانی و گێڕانەوەی بابەتەکان لە قالبی خەیاڵێکی چڕ، چ وەك بینینی خەون و زیندەخەون و تێهەڵکێش کردنیان لــەنێو شــیعرەکانی دا تەوزیفکراوە. پەیوەندی پتەو لەنێوان شیعر و خەوندا هەیە، هــەردووکیان بنــەوان لــە نەســتەوە هەڵدەبەستن و تێکەڵ بە خەیاڵ و کەتوار (واقع) دەبن. نووسەری (چینی) براوەی خەڵاتی نۆبل لە ئەدەبدا (گاو خنگجیان Goa Xingjian) دبێژێ" خەون لە خودی واقیع ڕاستەقینەترە، چونکە نزیکترە لە ناخی دەروون و ڕۆح." [٢٢٥]

لەم بارەیەوە سەباح رەنجدەر دەڵێ:"پەرە بەخەون بینین دەدەم، خەون لەدەربڕیندا بنــەڕەتی واقیع وناکات، ملکەچی دەستەڵاتیش نابێ، بەرهەم هێنەری ترپەو ئاوازی نوێیــە بــۆدەربڕین و

---

[٢٢٥] P. ،Published ٢٠٠١ by Harper Perennial ، by Gao Xingjian،Soul Mountain)
٤٥ (کتێب)

بەڕێوەچوونی واقیع لە ناو دەقی فەنتازیادا."[٢٢٦] لێ هەرچی (سیگمۆند فرۆید)ە دەڵێ: ((خەون ئازادکردنی ڕۆحە لە فشارە زۆرەکانی ئەو دیوی سروشتەوە، واتا پچڕاندنی ڕۆحە لە هەموو کۆت و پێوەندە ماددییەکان.))[٢٢٧] فازیل شەوڕۆش لە کتێبی (ڕەهەندەکانی خەون لە شیعری کوردیدا) بەم شێوەیە باسی خەون دەکات:"مرۆڤ بەردەوامە لە خەوبینین، چونکە پرۆسەی خەوبینین وەستانی نییە ."[٢٢٨] د. عەلی تاهیر بەرزنجی لەبارەی خەونەوە دەڵێ: "خەون ڕۆڵێکی گرینگ لە پێکهاتەو سروشتی شیعردا دەبینێت، دیارە لەلایەن سروشت و بوونی شیعرەوە، زۆر باسی ڕەنگدانەوەی خەون و خەیاڵ و یادگە و خەیاڵدان کراوە، کە هەر لەکۆنەوە، ڕەخنەگران و تیۆردارێژانی ئەدەب زۆریان لەسەر وتووە." [٢٢٩]

لە خوێندنەوەی کۆبەرهەمە شیعرییەکانی لەتیف هەڵمەت، هەستدەکرێت کە شاعیر تابڵێت خەونبینە، بۆیە ئاساییە کە پەلوپۆی دارگوێزی خەونەکانی سێبەریان بەسەر جیهانی (دایك)یشیەوە کردبێ، گەر بڵێین ئەو هەر لە منداڵییەوە تا ئەم ساتە وەختە، خەریکی بینینی خەونێکی ئەلقە ئەلقەی پێکەوە بەستراوە و بەردەوامە، ڕێی تێدەچێ.لەم (٤) دەقە شیعرانە، کە پەیوەستن بە جیهانی دایك، (٤) تەزرە خەون شیدەکەینەوە کە شاعیر لە کۆبەرهەمەکەیدا. زۆر پێیانەوە وابەستەیە:

**یەك: خەون لە ناو خەوندا:**

---

[٢٢٦]) سەباح ڕەنجدەر، دووکتێب لەبارەی شیعرەوە، چاپخانەی ڕۆژهەلات، ٢٠١١، ل ١٦

[٢٢٧])Sigmund Freud، The Interpretation of Dreams، translated by James Strachey، ١٩٦٥، Published by Avon Books، P. ٥٥ (کتێب)

[٢٢٨]) فازیل شەوڕۆ، ڕەهەندەکانی خەون لە شیعری کوردیدا، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٤، ل٢٢

[٢٢٩]) د. عەلی تاهیر بەرزنجی، چەند توێژینەوەیەکی ڕەخنەیی، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٤، ل ٧٠

له فەرهەنگی هەنبانە بۆرینەدا، بەرامبەر خەونی ناو خەون وشەی (هۆرم)بەکار هاتووە.[230] لە شیعرەکانی شێرکۆ بێکەس و کەریم دەشتی ئەم زاراوەیە دەبیندرێ. ئەدەبی جیهانیش دەوڵەمەندە بەم تەرحە خەونە، کە خۆی لە دوو شێوەدا نمایش دەکات، جۆری یەکەم، خەونبین لە یەك کاتدا هەم خەون دەبینی و هەم لەخەونەکەشدا خەون دەبینێ. هەرچی جۆری دووەم، دوای خەون بینیینەکە، خەونەکە درێژە و بەردەوامی هەیە، وەك بڵێی هێشتا خەونبین لە بینینی خەونەکەی هەر بەردەوامە. وەك لەم دەقەی خوارەوە دیارە، شاعیر بە گێڕانەوەی خەونەکەی بۆ دایکی، درێژە بە خەونەکە دەدات. ئەو دەڵێ:

***- دایە نووستم خەوم بینی***

***+ خێر رۆڵە گیان***

***- خەوم بینی جۆگەڵەکان یەکیان گرت و بوون بە ڕووبار***

***ڕووبارەکەش بوو بە هەڵم و***

***سەرکەوت بەرە و ئاسمانی شار***

***باران باری و باران باری و لافاوێ سوور زەوی برد***

***چەند منداڵێك لە ئاسمانەوە دابەزین***

***زەوییەکی لەم زەوییە گەورەتریان دروست کرد...!***

***+ وسبە رۆڵە. وسبە رۆڵە***

***ئەم خەوەی خۆت***

***بۆ گەردنت مەکە بە کۆت***

***منداڵەکە: باران باری و باران باری و لافاوی سوور زەوی برد***

***((وسبە رۆڵە. وسبە رۆڵە))***

***کۆرس: چەند منداڵێك لە ئاسمانەوە دابەزین***

---

[230]) فەرهەنگی هەنبانە بۆرینەدا وا نووسراوە، (هۆرم: خەوێ کە لەخەودا ئەیبینین)، هەژار، چاپی چوارەم، ١٣٨٤، ل ٩٥٦

لەم دەقەدا، بە زەقی ئەم خاڵانە دێنە پێش چاو: وەك هەمیشە، شاعیر دایك دەکاتە نزیکترین و خەمخۆرترین کەسی خۆی، بۆیە خەونەکەی بۆ ئەو دەگێڕێتەوە، لە کەلتووری کورەواریدا، خەون بۆ کەسانی نزیك و خۆشەویست دەگێڕدرێتەوە، نەك بۆ نەناسیاو و غەریب و غەوارە. لێرەدا، دایك، دایکایەتی خۆی بۆ خەونبین نیشاندەدا، لە دڵسۆزی و دڵ پێوەبوون. لێرەدا دەبێ کەوانەیەك بکەینەوە، ئەم دەقە ئاماژە بۆ زەمەن و مەکانێکی دیاری کراو لە مێژووی کوردا دەکات، ئەو سەردەمانەی کە تەنانەت گێڕانەوەی خەونیش جێگەی مەترسی بوو.[232] خەونەکە جەفەنگە و دەوڵەمەندە بە دیمەن و گرتەکانی جیهانی خەون، ئەمەیش بەهرەمەندی دەقنووس نیشاندەدا، لە هەڵبەستنی ڕووداوی خەوناویدا.

بۆ وابەستەکردنی ناوەرۆکی خەونەکە بە ژینگەی ئارامی کوڕ و دایکەکە، دەقنووس (کۆڕسێك لە منداڵ) دەهێنێتە سەر سەکۆی خەونەکە، ئەمەیش خەونێکی دیکەی شاعیرە کە ئەو منداڵانە دەکاتە فریشتەی جیهانسازی ئەو گەردوونە نوێیەی شاعیر خەونی پێوە دەبینێ. لێرەشدا ئاسمان بۆتە ماڵی ڕاستەقینەی منداڵەکان. لە کەلتووری کوردەواریشدا دەگوترێت منداڵە کۆچکردووەکان دەگەڕێنەوە ئاسمان. بونیاتی دەقەکە لەسەر شێوەی دایەلۆگە، وادەکات خوێنەر خۆشتر چێژ لە گێڕانەوی خەونەکە و شیعرەکە وەرگرن، لەهەمان کاتیش دا خەونەکە خەیاڵفراوانی بەشیعرەکە بەخشیووە.

---

[231]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٤٥٧ ـ ٤٥٨

[232]) دەگێڕنەوە لە سەردەمی حوکمی سەددام حوسێن دا، کارگوزارێك لە بەغدا لە سێدارە دەدەن، گوایە خەونی بە ڕووخانی ڕژێمی بەعسەوە دیوە و خەونەکەی بۆ هاوڕێکانی گێڕاوەتەوە.(دەقنووس لێرەشدا دەڵێ: *(وسبە ڕۆڵە. وسبە ڕۆڵە/ ئەم خەوەی خۆت/ بۆ گەردنت مەکە بە کۆت)*. (نووسەران)

**دوو: خەونی ئەزەلی:**

دەکرێ ئەو خەونە دوو ڕەنگ بێ: ڕەنگی یەکەمیان خۆی لە شێوەی ڕووداوێك یان ئاوات و مراز و خەونێك نیشانبدا، کە خاوەنەکەی تاکو مردن، خەونی پێوەدەبینێ. هەرچی ڕەنگی دووەمیانە، ئەو خەونە دەگێڕێتەوە، کە جارێك بینیویەتی و تا هەتایە لەبیر ناچێتەوە ـ ڕەنگ بێ لە ژیانی زۆربەماندا ئەم تەرزە خەونە هەبێ. شاعیر دەیەوێ پەیامێك بگەیێنێ کە "لەوەتەی لە دایك بووە عاشق و ئەڤینداری ئەم نیشتمانتەیە." جا سەرەتای لەدایك بوونی ئەو عیشقە دەگەڕێنێتەوە بۆ ساتەوەختی گۆرپەیی خۆی، پێش بەسەرچوونی (چلەی). ئا لەو تەمەنەی کە ڕۆژەکان بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن، دەقنووس خەون دەبینێ. دەکرێ بۆ ئەم دەقە ئەم سەرە قەڵەمانە تۆمار بکەین: دەقنووس سەرەتای یەکەم خۆشەویستی ـ کە خۆشەویستی نیشتمانە ـ دەگەڕێنێتەوە بۆ باوەشی دایك، وەك ئاماژەیەك بۆ ئەوەی کە دایك نیشتمانە و نیشتمانیش دایکە. هاتنەخوارەوەی فریشتە و بەخشینی ئەو خۆشەویستییە لە باوەشی دایکدا، دوو مەغزای هەیە: یەك پاکی و خاوێنی و بێ غەلوغەشی ئەو خۆشەویستییە، چونکە دەستی فریشتە موتفەرك و مبارەکە و هەمیشە سپی و تەهورە. دوو: نزیك بوونەوەی فریشتەکە لە دایك، بەخشینی سیفەتەکانی فریشتەیە بەو دایکە، لە کوردەواریدا دەگوترێ: پەری و فریشتە لەو جێگایانە نزیك نابنەوە کە جن و شەیتان و پیاوخراپی لێبێ.

دەقەکە تەواو وابەستەی ژینگەی کوردەوارییە، بڕوانە ئەو زاراوانە: *(چلەم نەچوو بوو/ لە بێشکەدام/ فریشتەیەك...)*. زۆر جاران کە منداڵی خەوتووی سەر بێشکە زەردەخەنەی دێتێ، دەڵێن: (بسمیلا، ئەوە خەون دەبینێ)، دەکرێ دەقەکە بەم نەریتەوە لێکگرێبدەین و شاعیر لێرەدا تەوزیفی کردبێ.

ئەوەی سیفەتی ئەزەلی بە خەونەکە دەبەخشێ، ڕاستگۆیی دەقنووسە لە خۆشەویستییەکەی و بەردەوام بوونی خەونەکەیە، لەتیف هەڵمەت بە شاعیرێکی ئەمەکداری نیشتمانپەروەر ناسراوە، ژیاننامەیەکی خاوێن و پاکی هەیە و تا ئەم ساتە وەختە، سەرەڕای

هەموو کێشە و بەر بەستەکان، خۆشەویستییەکەی بۆ نیشتمان لە تۆخبوونی بەردەوام دایە نەك کاڵبوونەوە.شاعیر لە دەقی *(یەکەم خۆشەویستی)* دا دەڵێ:

***هێشتا چلەم نەچوو بوو***

***نەمدەزانی لە بێشکەدام***

***یا زیندان...***

***نەمدەزانی دایکم ناشیرینە یا جوان...***

***هیچی ترم نەدەزانی***

***هەر گریان...***

***خەوم بینی فریشتەیەك***

***سپی وەکو شەستەباران***

***چاو سەوز وەکو دارستان***

***هێدی... هێدی***

***هاتە خوارەوە لە ئاسمان***

***جومگەی سینگمی یەکە یەکە***

***لێك ترازان...***

***ئەڤینی ئەم: چەم و دۆڵ و***

***شاخ و داخەی***

***لە دڵما چان...***

***ئێستا دڵم***

***هیچی تری تیادا نییە***

***هەر کوردستان و کوردستان...*** [٢٣٣]

---

[٢٣٣]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٢٦١

## سێ: خەون وەك خەون:

لەتیف هەڵمەت دەڵێ: "ئەتوانم بڵێم بەدەگمەن لەبیرم نایێ، چەند جار خەونم بەدایکمەوە دیوە، یەعنی زۆر زۆر بەدەگمەن ئەتوانم بڵێم بەهەموو تەمەنم دووجار ڕەنگە بینیبێتم. وەکو عەرەب دەڵێت: (لمح بصر) بینیومە، بیرم نایێ دانیشتبێتین گفتوگۆیەکمان کردبێ، یان نانمان پێکەوە خواردبێ، یان لەلای خەوتبێتم. بیرم نایێ کە بینیبێتم."[٢٣٤] ئەمە زانستییانە بۆچی دەگەڕێتەوە؟ دەروونناسانیش هۆکارەکە وا ڕاڤەدەکەن،کە شاعیر بەبەردەوامی لەشیعرەکانی دا باسی دایکی دەکا. ئەوباسکردنانە تێکەڵ بە خەیاڵ و زیندەخەونی ئەو بووە. هەڵبەتە مرۆڤ کاتێك زۆر بیر لەشتێك بکاتەوە و نەینووسێتەوە، ئەوا خەونی پێوەدەبینێ، بەڵام ئەگەر بینووسێتەوە، یان زۆری باس بکا ئەوا لەڕێی

نووسینەوە و زۆر باس کردن، خاڵی دەبێتەوە و کەمتر خەونی پێوە دەبینێ، شیعریش ڕەگێکی لەخەونەو نووسینەوەی خەون و خەیاڵ و هەست و نەست و مەشاعیرەکانی شاعیرە.

بەهەر حاڵ، شاعیر وەك مرۆڤی ئاسایی خەون دەبینێ، لە ئەدەبی کوردیشدا چەند نموونەیەك لەو دەقە شیعرانەی کە ئیلهام و ناوەڕۆکییان لە خەونی حەقیقییەوە هەڵێنجاوە تۆمارکراون. دەقنووس دەڵێ:

***بەهار بە گوڵ... گوڵی شەنگ و ئێسك سووك***
***چیمەنەکان ئەنەخشێنێ وەکو بووك***
***گەردەلولی ڕەشی پایز... پایزی زەرد***
***لەناکاوا ئەیانکاتە تۆزو گەرد***
***ئەو وێنانەی کە لە خەوا ئەیانبینین***
***دەستی ونبون ئەیان درێ کە ڕاپەڕین***

---

[٢٣٤]) دیدەنی: هاوژین سلێوە لەگەڵ لەتیف هەڵمەت، ١٩ / ٣ / ٢٠١٢

*تۆش تا دوێنێ.. دایە بە نیگای شیرین*

*بە قسەی خۆش... بە ئاوازی پێکەنین*

*بە دڵسۆزی بە خۆشەویستی بەتین*

*کامەرانیت ئەبەخشیە منی خەمگین*

*شنەت ئەهات لە بەهاری ژیانا*

*گوڵی خۆزگەت چەپك ئەکرد لە گوڵدانا*

*بەڵام ئێستا شێوەی جوانیت تیشکی نەما*

*برووسکە بووی خنکای لە ناو شەوی تەما*

*جوانەمەرگ بوو دایە ئەو تەمەنەی تۆ*

*ئاخ بۆ سۆزی ورشەی زەردەخەنەی تۆ*

*وەها دیارە خەزان کۆتایی نایە*

*ئەم ژیانە ئیتر هەتا هەتایە*

*بێ جوانیە... بێ شادیە... بێ بەهارە*

*بۆ گیانی من... چقڵی دەردە... ئازارە* [235]

دەقنووس لەم دەقەدا، ئەو تەمەنەی خۆی و دایکی کە پێکەوبوون، بە خەون دەشوبهێنێ، گوتراویشە ژیان جگە لە خەونێکی کورت هیچیتر نییە.لێرەدا هاتنی وشەی خەون مانای بوونی راستەقینەی خەون نییە، ئەگەر چی لەناونیشانەکەیەوە نووسیومانە خەون وەك خەون، ئەو خەون وەك خەونە، خەیاڵ فراوانی بەشاعیر دەدات، لەڕێی خستنە ڕووی وشەی خەونەوە، بڕوانە لەم دەقەدا، هەرچی ئاوەڵناوی جوانی و خۆشی و پیرۆزییە، شاعیر بەخشیویەتە ئەو فەترەیەی کە دایکی لەگەڵی دابووە: (*بەهار/ گوڵ/ گوڵی شەنگ/ ئێسك سووك/* چیمەنەکان/ *بووك/ نیگای شیرین/ قسەی خۆش/ ئاوازی پێکەنین/ دڵسۆزی/ خۆشەویستی/ کامەرانی/ شنە/ بەهاری ژیان/ گوڵی خۆزگە/ گوڵدان*)، بەڵام هەر کە ئەو کۆچ دەکات، سەرتاپای هەموو دیمەنەکان ترسناکانە

[235]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٣٤٢

دەگۆڕێن، بۆیە ئەو دەڵێ: (*ئەم ژیانە ئیتر هەتا هەتایە/ بێ جوانیە... بێ شادیە... بێ بەهارە/ بۆ گیانی من... چقڵی دەردە... ئازارە*). لە ژیانەدا خەون ئاسایە، هەر دوو وەرز بوونی هەیە: وەرزی بەهار، کە دروستکەرەکەی دایکە، وە وەرزی خەزان کە هێنەرەکەی کۆچکردنی دایکە. ئەمەیش مەزنییەتی و خۆشەویستی دەقنووس بۆ دایك نیشان دەدات. لە دیدی دەقنووس ژیان و بوون یەکسانە بە دایك، مردن و عەدەمیش یەکسانن بە نەمانی دایك. ئەم دوو وەرزەش پێناسەی فەلسەفییان هەر بەم نەغمەیە بۆ کراوە.

**چوار: زیندەخەون:**

خەون و زیندەخەون، دوو زاراوەن کە هەمیشە دەبیسترێن، "خەون بەهێزترین و کاریگەرترین داینەمۆی بەردەوام بوونی ژیان و بوونە. کاتێ لە بەرهەم و داهێنانەکانی مرۆڤ تێدەفکری، تێدەگەی کە خەون مۆتیڤێکی چەندە خولقێنەر و تواناسازو بەکارە. ئەشێ بڵێین ئەدەب خەونە، هونەر خەونە، زانست خەونە، شیعریش، کە ئەستێرە هەزار ڕەنگە درەوشاوەکەی ئەدەبە خەونی ڕەنگ پەلکەزێڕینە پۆشی ئەم ژیان و بوونەیە، چوون خودی ژیان خەونە."[٢٣٦] مرۆڤ ناتوانێ دەست بەرداری خەون بێت، چونکە خەون شتێك نییە لەژێر ویست و ئیرادەی مرۆڤ بێت، بەڵکو شتێکە پەیوەندی بە جیهانی نائاگایی مرۆڤەوە هەیە و خۆی دێت و خۆی نمایش دەکات، بەبێ ئەوەی حەز بکەین، یان حەز نەکەین. ئەمە ئەگەر مەفهوم و چەمکی خەون بێت، ئەی زیندە خەو چییە کە سەر بەهەمان عێل و تیرەیە. زیندە خەون" ئەم زاراوەیە لە دوو وشە پێکهاتووە، زیندە: واتا بێداری، خەون واتا: بێئاگایی." [٢٣٧] کەواتا جۆرە خەونێکە ڕەگێکی لە جیهانی واقیع دایە و ڕەگێکی دیکەی لە جیهانی بێئاگایی، ئەم حاڵەتە چۆنە؟ هەڵبەتە" خەوبینین لەدەرەوەی پڕۆسەی خەوی سەرجێگا جۆرە خەوبینینێك لەباوەشی دەگرێ کە

---

[٢٣٦]) فازیل شەورۆ، ڕەهەندەکانی خەون لە شیعری کوردیدا، ل ٩

[٢٣٧]) سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٣

ڕاستەخۆ بەستراوەتەوە بە دەورووبەری ژینگەی ڕاستەقینەی ئەو." [238] فرۆید بەم شێوەیە باسی زیندەخەون دەکات: " هەندێ جار مرۆڤ هێزی ئەوەی هەیە لە رێی زیندە خەونـەوە ئاواتـەکانی لەوەختی بەخەبەریدا بهێنێتـە دی." [239] شـاعیر لـە چـەند دەقێکـی دا، بەتایبـەتی ئەوانـەی بۆدایکی نووسیوە، ڕۆدەچێتە نێو خەیاڵێکی خەست و ئیلهامەکانی لە زینـدە خەونـەوە بنـەوان دەگرن و خۆیان نمایش دەکەن. شاعیر لە شیعری (چاوی سەوز)دا دەڵێ:

***(چاوی سەوز)***

***لە گشت نمە بارانێکدا***

***بۆنی چەمی ڕەشی پرچی دایکم دەکەم***

***ئەرێ بشێ هی ئەوە بێ***

***لە نیوەڕۆی زستانێکا***

***چاوی دایکم وەری وەك پەڕی پاساری***

***باران نم نم... باران تاڵ تاڵ***

***وەکو تاڵی پرچی دایکم بەدەم شانەوە هەڵوەرێ***

***وا دەباری...!***

*****

***هەر دارێکی سەوز دەبینم***

***بۆنی چاوی دایکم دەکەم...***

***پڕ بە هەردوو سیی ئەوینم***

***ئەرێ بشێ هی ئەوە بێ***

***وەك گەڵای هەزار دار بەڕوو***

***چاوی دایکم سەوز سەوز بوو...***

---

[238]) سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٣

[239]) علي الوردي، الاحلام بين العلوم و العقيدة، ط٢، دار الورق للنشر، ٢٠١٢، ص ١٠٢

***

*بۆچی هەرچەند خۆر دەبینم*

*خەندەی دایکم دەبارێتە ناو برینم*

*ئەریٚ بشێ هی ئەوە بێ*

*دایکم هێندە دڵی پاك بوو*

*بزەی لێوی وەك لقی هەتاو ڕووناك بوو...*

***

*ئەریٚ بۆچی هەر ئەستێرەیەك دەرکەویٚ*

*وا دەزانم کە دایکمەو هاتووە بۆ ئاسمانی ئێرە*

*ئەریٚ بشێ دایکم بوویێ:*

*بە هەزار ئەستێرە...!!!* [٢٤٠]

پێکهاتەی ئەم شیعرە، لەسەر بنەمای چوار کۆپلە نمایش کراوە، کە دایك ڕاستەوخۆ بەستراوەتەوە بە دیاردەکانی سروشتەوە، بەڵام شاعیر زۆر قوڵ شۆڕدەبێتەوە بۆ نێو دونیای زیندەخەون و خەیاڵی چڕ و بیرۆکەکانی دەخاتە ڕوو. لەکۆپلەی یەکەم دا ئەوە دەخاتە ڕوو کە دایکی لە نیوەڕۆی زستانێکە مردووە. لەو وەرزەشدا باران دەباریٚ، ئەوبارانەش دەیکاتە سیلاو و چەم و ڕووباری لیٚ پێکدیٚ، چەمەکە پرچی دایکیەتی. لە کۆپلەی دووەم دا، شاعیر دیسان دێتەوە ناو پێکهاتەکانی سروشت و چاوە سەوزەکانی دایکی بەگەڵا سەوزەکان دەچوێنیٚ. حاڵەتی نووسینی ئەم شیعرە وردبوونەوەیە لە سیمای دایکی کە وەك ئەلبوومێکی وێنەکانی دایکی پەڕەکانی یەك یەك هەڵداوەتەوە. یان وەك گرتە فیدیۆی پچڕپچڕ لەڕێی ئەو زیندەخەونەوە، جارێکی دی مۆنتاژیان دەکاتەوە. لە دواین کۆپلەدا ئەو خۆرەتاوی بە بزەی دایکی دادەنیٚ لەگوتەی (*بزەی لێوی وەك لقی هەتاو ڕووناك بوو*)، وێنەیەکی شیعری سەرنجڕاکێشە. لە دەرکەوتنی هەر ئەستێرەیەکیش ئەو دایکی وەبیردێتەوە، چونکە سیمای

---

[٢٤٠] ) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٥٤٤

دایکی له هەموو ئەستێرەکاندا دەبینێتەوە. لەگوتەی (ئەرێ بشێ دایکم بووبێبە هەزار ئەستێرە). نمایشی ئەو وێنانەن کە ئاوێتەی بیرەوەری و جیهانی شاعیر بوون، بەسایەی زیندەخەون و خەیاڵفراوانی خۆیەوە دەقنووس جارێکی دیکە، بە فەن و فنوونێکی دیکە وەسفی دایکی دەکات.

پووختەی تەوەرە:

**یەك:** دەقنووس خەونبینێکی بەئاگایە و زیرەکانە مامەڵەی لەگەڵ دیاردەی (خەون) کردوە. زۆریش باوەڕی بە خەونە تا ئەو ڕادەییەی دەڵێ: (*خەون دەڵێ من کچی خەونامەکان نیم.. کچی فەلسەفەم*).[٢٤١]

**دوو:** تەوزیفکردنی خەون لە شیعری لەتیف هەڵمەتدا، سیمایەکی دیاری دەقنووسە و لە چەندان قەسیدەدا سوودی لە بینیوە و وەستاکاری شیعری خۆشی تێدا کردووە.

**سێ:** لە وابەستەکردنی شیعر بە خەون و دایکەوە، دەبینین دایك لێرەشدا بوونەوەرە پیرۆز و جوان و مەزنەکەیە، وێنەکردنی دایك لە خەوندا، پتر سەرنجی خوێنەران ڕادەکێشێت، حەز لەو دیمەن و چیرۆك و حیکایەت و شیعرانە دەکەن کە خەونپۆشن.

[٢٤١]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٩٠٢

## ( ٧ )

## دایك و پەیام

شیعر پەیامە، بە زمانێکی تایبەت. دەکرێ ئەو پێناسەیە چوار وشەییە بخەینە سەر خەرمانی پێناسە زۆرەکانی شیعر. پەیامیش ئەو نامە و گوتار و ئامانجەیە کە لە ئاسمانەوە خودا لە کتێبە پیرۆزەکانیدا بە ئێمەی بەخشیوە و لەسەر زەویش زانا و داناکان بە درێژایی مێژوو لە پێناو خۆشی و ئاشتی و سەربەستیدا کاریان لەسەر کردووە. گوتار و ناوەخنی پەیامەکان یەکسانە بە ژمارەی خەون و ئاوات و مرازەکانی مرۆڤ، واتا بێسنوور و لەبن نەهاتوون. شاعیر یەکێکە لەو سەدان پەیامبەرانەی پەیامەکانی خۆیان بە زمان و شێوازی تایبەت بەخۆیان، ڕاگەیاندووە، گەر دەشپرسن پەیامەکانی ئەوان چین؟ دەڵێین هەموو ئەو پەیامانەن، کە تۆ خەونیان پێوە دەبینی و بەدوایاندا وێڵی. جا چونکە گۆڕان و گۆڕانکاری خەسڵەتێکی بنەڕەتی ژیانە، ئەوا پەیامەکانیش لە گەڵ زەمان و مەکانەکاندا هەمیشە لە گۆڕانکاریدان. ئەگەر پەیامی شاعیرانی عەرەبی سەردەمی جاهیلی نیوەدورگەی عەرەب، ڕاگرتنی شکۆی خێڵ و جۆشدانی پیاوە شەڕکەرەکانیان بوو بێ، ئەوا پەیامی شیعرەکانی شێکسپیری ئینگلیز، دەروونناسی مرۆڤەکانە، لەکاتێکدا پەیامی پابلۆ نیرۆدای ئیسپانی بەرقەرارکردنی ئاشتی و ئاشتەوایی بووە.

تەنانەت شاعیرانی یەك نەتەوەش زۆرجار هەڵگری پەیامی جیاوازن، ئەوەتا مەحوی بەرێبازی تەسەوفدا، بە زمانی شیعر، پەیامەکانی خۆی تۆمار دەکات و حاجی قادری کۆیی پەیامی وورووژاندنی هەستی نەتەوەپەروەری ڕادەگەیێنێ و گۆران سیحری زمان و جوانی سروشت

له قالبێكی نوێدا داده‌ڕێژێته‌وه و (شێركۆ بێكه‌س)یش خه‌می نه‌ته‌وه‌یه‌ك بۆ مێژوو ده‌كاته‌ په‌یامی خۆی.

كه‌واته بۆ تێگه‌یشتن له مه‌قسه‌د و مه‌غزای په‌یامی شاعیر، زۆرجار پێویسته ئه‌و تۆپه‌ڵه به‌فره ئاگرینه بتووێنینه‌وه. په‌یامه‌كانی شیعری له‌تیف هه‌ڵمه‌ت تێكه‌ڵه‌یێكی فره‌چه‌شنی ڕه‌نگاوڕه‌نگی هاوته‌ریب و كۆنتراست و پێكچوو و جیاوازی بیروبۆچوون و فه‌لسه‌فه‌كانییه‌تی ـ ناكرێ لێره‌دا دۆسییه‌یان بۆ بكه‌ینه‌وه، بۆیه پتر وابه‌سته‌ی په‌یامی دایك ده‌بین له شیعره‌كانی شاعیردا كه ئه‌و بۆی تۆماركردووین. پێش ئه‌وه‌ی شیته‌ڵكاری ڕه‌خنه‌یی ئه‌ده‌بی و ده‌روونی ئه‌و ده‌قانه ده‌ست پێبكه‌ین، حه‌ز ده‌كه‌ین، ئاماژه به‌وه بكه‌ین، كه چه‌ند ده‌قێك لێره‌دا بۆ مێرمنداڵ و هه‌رزه‌كار نووسراون، له دیدی شاعیریشه‌وه هاوسه‌نگكردنی ته‌مه‌نی منداڵ و ناوئاخنی ده‌قی شیعری منداڵان ده‌بێ به هه‌ند وه‌بگیرێت.

نموونه‌ی ئه‌و ده‌قه شیعرانه‌ی بارگاویكراون به په‌یامی دایك، له كۆبه‌رهه‌می شاعیردا زۆرن، ئێمه‌ن ته‌نیا (چه‌ند) ده‌قمان بۆ هه‌ڵبژاردوون. له شیته‌ڵكاریی ئه‌و ته‌رزه ده‌قه‌دا، ده‌بینین شاعیر له سایه‌یی (٢) ته‌كنیكی شیعرییه‌وه، نیشانه‌كانی خۆی پێكاوه:

**ته‌كنیكی یه‌كه‌م:** دایك ده‌كاته ئامرازێك بۆ گه‌یاندنی په‌یامه‌كه، واتا شاعیرداڕێژه‌ر و په‌یامنووسه و دایك ڕاگه‌یێنه‌ر و په‌خشه‌ری په‌یامه‌كه‌یه.

هه‌رچی **ته‌كنیكی دووه‌مه**، دایك بۆخۆی هه‌م په‌یامه و هه‌م ده‌نگ و سه‌دای په‌یامه‌كه‌شه ـ واتا ئامراز و ئاكامه.

له ته‌كنێكی یه‌كه‌میشدا، ده‌قنووس زۆر ورده ته‌كنیكی شاراوه‌ی ته‌وزیفكردوه، هه‌ر بۆ نموونه له‌م ده‌قه‌ی خواره‌وه، ده‌بینین په‌یامی ده‌قنووس هه‌ر (٣) وشه‌یه: (مرۆڤ موسته‌حیل ناناسێ)، لێ ئه‌و وتاره مه‌زنه كورتبڕه، به ته‌كنیكێكی جوان و تۆكمه ڕاده‌ستی دایك كراوه تا بیگه‌یێنێته هه‌مووان ـ منداڵ و گه‌وره ـ. لێره‌شدا دایك بۆته هه‌ڵگری ئه‌و په‌یامه پیرۆز و مانابه‌خشه. بۆ؟ چونكه مرۆڤی جوان و مه‌زن و پیرۆز، ده‌بێ ئه‌و په‌یامانه بگه‌یێنن، كه جوان و مه‌زن و پیرۆزن. پێچه‌وانه‌كه‌شی دروسته. شاعیر له‌م ده‌قه دا ده‌ڵێ:

دوو دڵدار بوون

شمشێرێ کەوتە نێوانیان

بوون بە دوو ئەستێرەی جوان جوان

دە ساڵ جارێ

نیوە شەوێ تێکەڵ دەبن

وەك ڕووبارێ

دایکم دەیوت: منداڵ پاکە

هەر کە جارێ تێکەڵ بوونی

ئەو دوو دڵدارە شێتەی دی

هەر ئاوات و خۆزگەیەکی

لە دڵدا بێ

بۆی دێتە دی

ئەو شەوە خەو وەك پاساری

بە باخی چاومدا باری

بەیانی کەلە خەو هەڵسام

پڕ بە ژوورەکەمان گریام

دایکم وتی:

ڕۆڵە مەگری

مرۆڤ کاتێ دەبێ بە پیاو

دەتوانێ بەرد بکا بە ئاو. [٢٤٢]

---

[٢٤٢]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٣٧٢ ـ ٣٧٣

بڕوانن سنوورەکانی (دوو دڵدار) بە چەند قۆناغدا تێدەپەڕن و ئاکامەکەی، دەقنووس تووشی سەرسوڕمان دەکات، لە ناخۆشترین چرکەساتدا، دایکی دەیگاتێ و دەبێتە فریادڕەس و مانەفێستی پەیامەکەی بۆدەخوێنێتەوە: *(مرۆڤ کاتێ دەبێ بە پیاو/ دەتوانێ بەرد بکا بە ئاو):*

**2 دڵدار (†) 2 ئەستێرە ⟵ 2 ڕووبار ⟵ (مناڵ + بینینی 2 دڵدار + ئامانجەکانی) = پەیامەکەی دایک**

شاعیر دەبێژی:

***بە مناڵی بە درێژایی ڕۆژ***
***ڕاوە چۆلەکەم دەکرد...***
***کە دایکم تێی گەیاندم***
***برسێتی چۆلەکەکان ناچار دەکات***
***کە بکەونە فاقەکەمەوە...***
***ئیتر داوو فاقەکانم شکاند***
***کەوتمە دڵداری کردن***
***لەگەڵ چۆلەکەکاندا***
***دانم بۆ روو دەکردن و***
***نەمدەهێشت منالآن بەردیان تێ گرن...***
***ئەی تۆ کەی لە زمانی شاعیر***
***تێ دەگەیت و***
***فێری خۆشەویستیی شیعر دەبی***
***ئەی کچە دڵ مەڕمەڕەکە...؟!*** [٢٤٣]

---

[٢٤٣]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٣١١ ـ ٣١٣

دەقنووس جیهانی منداڵی و جیهانی هەرزەکاری تێکەڵ دەکات و بەرەو دونیای شیعرمان دەبات. بۆ گەیاندنی پەیامێکی پڕ تۆڕەیی و سکالا و دڵشکان، لە ئەزموونێکی سەردەمی منداڵی خۆی، دەرس و عیبرەتێك وەردەگرێ و لێرەشدا مامۆستای ئەو دەرس و دەورە هەر دایکە، بڕوانن دیسان دایك کراوەتە پەیامبەری پەیامە جوان و پڕ بەهاکان. ئەوەندەش بە بۆن و عەتری هەرزەکارانە گوڵاوپڕژێن کراوە و پەیامەکەش بۆ هەموانە. بەراوردکارییەکی هونەریش لە نێوان منداڵ و دڵداردا کراوە، ئەویش بەم جۆرە:

**منداڵ = دڵدار**

**چۆلەکە = دولبەر**

**ڕاوە چۆلەکە = دڵداری و کچ ڕاوکردن**

**برسییەتی سك = برسییەتی هەوەس و حەز و ئارەزووەکان**

**دان ڕووکردن بۆ نێچیرەکان (چۆلەکەکان) = زمانی شیعر بۆ نێچیرەکان (کیژۆلەکان)**

**گۆڕینی تەکنیکی ڕاوەکە = گۆڕینی تەکنیکی دڵدارییەکە**

دیقەت بدەن چۆن شاعیر دایك دەکاتە مامۆستا و ڕێنیشاندەر و چەندە دەقنووس پابەندی پەیامەکەی دایکەتی، پەیامێك کە دژی کردە ناپەسندەکانی مرۆڤە، بەرانبەر هاوگیانەکانی لە بوونەوەرەکانی دیکە، دەشبینین کە دەقنووس ئەو پەیامەی بۆ گەیشتن بە مەرامێکی دیکە تەوزیف کردووە، ئەویش گەیشتن بە دڵدارەکەیەتی، کە لە ئاست ئەودا دڵەکەی لە مەڕمەڕ ڕەقترە.

شاعیر لە شیعری (هاوارم کرد) دەڵێ:

***هاوارم کرد: دایە.. دایە***

***وا ئەبرەهەو لەشکری فیل***

*تەنیویانە ئەم دنیایە*

*وتی: رۆڵە*

*دڵۆپ دڵۆپ حەرامت بێ*

*بۆنی بای ئەم خاکو خۆڵە*

*حەرامت بێ ئاوازی قەڵبەزی زیوین*

*رووناکایی ئاسمانی شین*

*گوڵەسوورەی ئەم گشت شاخو*

*شیوو دۆڵە*

*حەرامت بێ ئەو شیرەی کە*

*تنۆك تنۆك بە گەرووتدا رژاوە..*

*ئەگەر نەبی بە هەوری خەستی ئاگرو*

*بەسەریاندا نەبارێنی پشکۆی رقی هۆنراوە...*[٢٤٤]

شاعیر زیرەکانە هەر پێنج هەستەکەی مرۆڤی ئاوێتەی شیعرەکە کردووە، لەسەرەتا گەڕاوەتەوە بۆ بەسەرهاتێکی ئاینی، کە ئەبراها بە لەشکری فیلەوە هێرشی کردە سەر مەکە، دواتر خودا غەزەبی بەسەرداباراند، تەیرە عەبابیلەی نارد، کە هەرتەیرەی پارچە بەردێکی بەدنووکەوە گرت و بەردبارانی لەشکرە زۆرو زەوەندەکەیان کردوو، لەشکرەکەیان تێکشکاند. شاعیر گوتەکانی دایکی دەگێڕێتەوە، هەڵبەتە دایك پیرۆزی و مەزنی خۆی هەیە لەلای شاعیرو لەلای خوێنەریش. ئەوەتا سەرتا پێی دەڵێ گەر وانەکەی، کە ڕووبەڕووی دوژمن نەبیتەوە، بۆنی خاکت لێحەرام بێ. لەدوای هەستی بۆنکردنەوە، ئاوازیشی لێحەرام دەکات، واتا هەستی بیستنیشی لێحەرام دەکات. ئینجا بینینی ڕۆشنایی و بینینی گوڵی جوان و گوڵی سوور. دوای ئەویش شیری خۆی لێحەرام دەکات، لەو دەربڕینەش هەستی چەشتن وجودی هەیە. پێنجەمین هەست هەستی بەرکەوتنە، کەدەلێ: (*ئەگەر نەبی بە هەوری خەستی ئاگرو بەسەریاندا نەبارێنی*

---

[٢٤٤]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٢٢٤

*پشکۆی ڕقی هۆنراوه*)، کەواتە وەك ڕووداوەکەی ئەبرەها و لەشکری فیل. شاعیر دەبێ ڕۆڵی ئەو تـەیرە عەبابیلانـە بینـێ و پشـکۆ و ئاگریـان بەسـەردا ببـارێنێ و بیانسـووتێنێ. پشـکۆ و ئاگرەکانیش لە هۆنراوەکانییەوە بەرپا دەبن. بەگەڕخستنی ئەو پێنج هەسـتەوەرانەش بۆئەوەیـە لە شیعرەدا خوێنەر لەرێی هەموو هەستەوەرەکانییەوە هەست بە ماهیەتی ئەم شیعرە بکات.

کەواتە هەر لە چوارچێوەی تەکنیکی گەیاندنی پەیامەکان بە زاری دایکەوە، دەقێکی ئاگراوی و ئاگرین دەخەینە ڕوو، کە ترۆپکی تورەیی و یاخی بوون و هەڵگەڕانـەوە و بەرەنگاربوونـەوەی شاعیر بەرانبەر بە (ستەم و زوڵمـە گـەورەکان) نیشـاندەدات. هەرچـەندە لەسـەرەتای تەمـەنی شیعرنووسـینییەوە، لـەتیف هەڵمـەت بەیـداخی یـاخی بـوون و بەڕەنگاربوونـەوەو کۆڵنـەدانی بەرزکردۆتەوە ـ لێ ئەم دەقە هەموو خەسڵەتەکانی شیعری گەردوونی لەخۆ گرتووە، جا ئـەوەی کە شکۆ و پایەیی دەقەکەی بەرزترکردۆتەوە، هانا بردنە بۆ دایك و بەهاناهاتنی ئەو دایکەیـە. بڕوانن دایکەکە (۳) جاران دەستەواژەی: (*حەرامت بێ*) بەکار دێنێ و هەمووشمان دەزانین کە لە کەلتووری کوردەواریدا ئەم دەستەواژەیە چەند بایەخدار و هانـدەر و ورەبەخشـە. دەقنـووس لـە پەیامەکەی دایکدا کە ئاماژە بە: (*هەوری خەستی ئاگرو/ بارینی پشکۆی ڕقی هۆنراوە*)دەکات. هاوار هاوارەکەی دەقنووسـیش (۲) پـەیامی تێدایـە: لەلایـەکی پـەیامی خـودی شـاعیرە لـە پێشبینیکردن لە هاتنی لافاو و لەشکرێکی بێئامان و ترسناك، لە لایـەکی دیکەشـدا هـاواری هەموو مرۆڤایەتییە، چونکە ئەو لافاو و ئـەو لەشـکرەی بەڕێوەیـە مەترسـییە بـۆ هـەر چـوار ئیقلیمی ئەم جیهانە.

بڕوانن پەیامەکەی دایك چەند مرۆڤدۆستانە و ئاشتیخوازانەیە، لە کاتێکدا شاعیر خەبـەری هاتنی (ئەبرەهە و لەشکری فیل)ی بۆ دێنێ، دایك هانی نادات بچێ بە مەنجەنیق و شمشێر و رم و ژەهر بەرەنگارییان ببێتەوە، بەڵکو داوادەکات بـە (پشـکۆی ڕقـی هـونراوە و ئـاگری هـەور) بەرانبەریان بوەستێتەوە. ئێستا لە چەند دەقێکی دیکەدا، شیی دەکەینەوە کە چۆن شاعیر دایك دەکاتە پەیام و پەیامهەڵگر.

شاعیر دەڵێ:

***پێتان دەڵێم: هیچ سەگێك ئەوەندەی***

***ناپاك گڵاو نییە و***

***هیچ تاوانێك ئەوەندەی بەرگری لە وڵات نەکردن***

***گەورە نییە***

***نیشتمان دایکە دایك***

***ئەریێ کەستان پێتان خۆشە***

***دایکی خۆتان ڕووت کەنەوە...؟*** [٢٤٥]

هەمیشە گوتراوە نیشتیمان دایکە، وەك چۆن دایك بەشیری مەمکەکانی کۆرپە بەخێو دەکات و پەروەردەی دەکات، بەهەمان پێودانیش مرۆڤ لەو خاکەی تیایدا دەژی خۆراك بەرهەم دێنێ و هەوای هەڵدەمژی و گەشەدەکات و چالاکییەکانی خۆی دەخاتە ڕوو. بۆیە شاعیر ئەو گوتەیە دووبارە دەکاتەوە کە دەڵێت (نیشتمان دایکە)، هەرچەندە ئەمە کۆنتێکستێکی کلاسیکی گەردوونییە و زۆربەی نەتەوەکان بەکاریان هێناوە، لێ دەقنووس لێرەدا بە هونەری شیعری، بەشێوەیەکی سەنجڕاکێشەر هەستی خوێنەر دەورووژێنێ، ئەمەش بە ئاماژەکردن بە دەستدرێژیکردنی عەرز و نامووسی ئەودایکە. شاعیر دەڵێ:

***خوێنی لێ دێ... خوێن... خوێن... خوێن خەونی شەهیدان***

***بە پەڕە مووچی ئەوین***

***تابلۆیەك لەو خوێنە دروست دەکەم***

***ناوی لێ دەنێم نیشتمان***

***لەوانەیە ناوی لێ بنێم دایکم***

***کام ناویان بێ وەك یەك وایە***

***چونکە هەردووکیان مردوون...!*** [٢٤٦]

---

[٢٤٥]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٣٢٢ ـ ٣٢٣

شاعیر پەیامی گەورەیی و مەزنی و شکۆداری شەهید لەڕێی دایکەوە دەگەیێنیٚ، جا چونکە دایکی شاعیر کۆچی دوایی کردووە و شەهیدیش ڕۆحە بەرزەفڕەکەی ئێرەی بەجێهێشتووە، پەیامەکە بە زمانێکی شیعری زۆر شیرین نیگارکێش دەکات و دەڵێ: (نیشتیمانێك بەخوێن نەخشەکێشراوە، دایکمە)، لەهەمان کاتدا شەهید و دایك دەخاتە یەك تای تەرازووی نەمریی و پاکییەوە.

***دایە.. دایە***

***ئەی ئەو دەنگەی***

***کە پڕ بە هەموو دنیایە***

***ئەی ئەو وێنە شۆخ و شەنگەی***

***کە پڕ بە هەموو دنیایە***

***چریکەی سۆزی ئەو زەنگەی***

***کەپڕ بە هەموو دنیایە***

***من عەرعەرێك دەپەرستم***

***وێنەیە تۆم لەسەریدا هەڵکۆڵیوە***

***بە پەنجەی خەندەی هەڵبەستم***

***هەموو ڕۆژێك دار عەرعەرەکە دەسووتێت***

***دووکەڵەکەی***

***بۆنی پرچەکەی تۆی لیٚ دێت...!*** [٢٤٧]

دەقنووس دایك دەکاتە پەیامێك، مێژووی ئەنفال تۆماردەکات و تووڕەیی و خەمخۆری و سووتانی شاعیر لە ڕێی تێکەڵکردنی دایك و عەرعەر و شیعر لەیەك بۆتەدا، خەمە گەورەکە و ستەمە ڕەشەکەی ئەنفال نمایش دەکات.

---

[٢٤٦]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ١١٧٧

[٢٤٧]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٥١٦

شاعیر لە قەسیدەی (لایلایە) دا دەڵێ:

***- لای لایە ڕۆڵەکەم لای لایە***

***+ لای لایەم بۆ مەکە ئەی دایە***

***- ڕۆڵەکەم سەگ وەڕە هەواڵی ناخۆشی هێناوە ئەم بایە***

***نابینی چۆن دەدات لە هەموو دەرگایەك***

***لای لایە ڕۆڵەکەم لای لایە***

***+ لای لایەم بۆ مەکە ئەی دایە***

***من نانووم ئەمەوێ بزانم چی دەڵێ ئەم بایە***

***- ئەستێرە،تەم دایگرت***

***تریفەی مانگ سرەوت***

***داربەڕوو پەلوپۆی لە گۆ کەوت***

***تا چەمیش بێزار بوو لە گرمەو لە ناڵە***

***خامۆش بوو بۆ خۆی خەوت***

***لەو دیوی ئەو یاڵە...***

***تۆش ماندووی ئەی ڕۆڵە... زۆر ماندووی***

***بۆ نانووی ڕۆڵە گیان بۆ نانوی***

***+ نا دایە...***

***من نانوم تاوەکو نەزانم***

***چی دەڵێ ئەم بایە...***

***نا دایە***

***من نانووم تاوەکو خۆرێ نوێ***

***هێلانە نەکات لە ترۆپکی ئەو چیایە***

### من نانووم... نادایه...! [248]

هەرچەندە پەیامی دایك لێرە ئەوەیە کە کوڕەکەی بخەوێ، کوڕە بەقسەی ئەو ناکـا، دایکـی پێی دەڵێ ئەستێرە و خۆر و مانگ نووسـتوون و تـۆش، مانـدوویت، بـەڵام کوڕەکـەی هەسـت بەمەترسییەك دەکات، بۆیە خەوی نایە، نایەوێ بخەوێ، لێرە دا نەخـەوتن ڕەمـزی کۆڵنـەدان و خەبات و بەرخودان و ڕەمزی بەئاگاییە.

شـاعیر هێنـدە یاخییـە تەنانـەت پـەیامی دایکیشـی ڕەتدەکاتـە و سەرکێشـانە بـەدوای ئاشکراکردنی نهێنییەکانی (با)ێکدا دەگەڕێ، کە هەم چـەفەنگە و هـەم هـەواڵگری ڕۆژگـار و ڕووداوێکی بەشووم و ترسـناك و دژوار و خەماوییـە. دوو پـەیامی دژبەیـەك لـە یـەك دەقـدا شەڕیانە: پەیامی دایك: کە پـەیامی هەمیشـەیی دایکـە بـۆ پارێزگـاری کـردن لـە نەتـەوە و ڕۆڵەکانی، هەروەها پەیامی شاعیرشە، کە ڕووبەڕووبوونەوەیە لەگـەڵ (با)یـەکان و گەیشـتن بـە لوتکەی خۆری ئازادی ـ هەموو خۆرەکان و هەموو ئازادییەکان.

پووختەی تەوەرە:

لەم بڕگەیەدا (٢) ئەنجامان لە پەیامەکانی شاعیر هەڵێنجا، تایبەت بە پێگەی دایك:

١) شاعیر (دایك)ی وەك پەیامهەڵگر تـەوزیفکردووە بـۆ گەیانـدنی خـەون و مەقسـەد و بیروبۆچوونەکانی خۆی، لێرەشدا هیچ پەڵەیـەکی ناشـیرین نـابینین و هـیچ دەنگێکـی نەشاز نایەتە بەرگوێمان. هەموو پەیامەکانی بـە دایـك بەخشـراون جـوان و پـیرۆز و مرۆڤدۆستانەن.

٢) خودی دایك، وەك کائینێکی ڕۆح شیرین و ڕەفتار جوان و ئێسکسووك بۆخۆی کراوەتە قەلب و قـالبی پەیامـەکان: جارێـك نیشـتیمانە، جارێـك شـەهیدە، جارێـك تـابلۆی بەرجەستەکردنی ڕووداوێکی مەزنە.

---

[248]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٥٤٤ ـ ٥٤٥

( ٨ )

## گڵکـۆی دایـك

گۆڕ و گۆڕستان لـە دێـرین زەمانـەوە، جێگـەی خۆیـان لـە فۆلکلـۆر و ئـەدەب و شـیعردا کردۆتەوە. هەرچەندە مێژووی شوێنەواری گۆڕستان بە وردی دەست نیشان نەکراوە، بەڵام هەموو لێکۆڵینەوەکان نەریت و ئایین بە نەخشەدانەر و دیزاینەری گـۆڕ و گۆڕسـتانەکان دادەنـێن، بـە تایبەتی دوای هاتنی ئایینی مەسیحی، کە گۆڕستانەکانی بـۆ دەرەوەی کڵێسـا و پەرسـتگاکان گواستەوە. کورد وەك کۆمەڵگەیەکی موسڵمان بە چاوی ڕێز و حورمەتەوە تەماشـای گۆڕسـتان دەکات و ڕێوڕەسمی بەخاکسپاردنی مردوو و پرسە و زیارەتی گۆڕستان چەندان مەرج و ئـاداب و سوونەتی خۆی هەیە. چونکە لەتیف هەڵمەت لە خێزانێکی ئایینی پەروەردە بووە، پاشـخانێکی مەعریفی باشی دەربارەی مەرگ و مردن هەیە.

کۆبەرهەمی شیعری ئەو دەوڵەمەندە بە وشە و زاراوە و چەمکی تایبەت بە مەرگ و گـۆڕ و گۆڕستان و فەرهەنگێکی دەوڵەمەندی دەبارەی ئەو دیاردە تەم و ومژاوییەی لە مێشکی خۆیدا ئامارکردووە و لە چەندان دەقە شیعردا تەوزیفی کردوون. لە لێکدانەوەی دەروونی و شیعری ئەم زاتە، ئەم ڕاستییەمان بۆ بەدیاردەکەوێ، کە ئەوەی بۆتە مۆتیڤی گەشانەوەی بیر و بیرۆکەی گۆڕ و گۆڕستان لە دەقە شیعرەکانیدا، کۆچکردنی دایکییەتی، کاتێك لە تەمەنی هەرزەکاریدا، خۆی وەکو بێکەسێکی تەنیا و گۆشەگیر دەبینێتەوە و هەست ناکات کەسـێك هەیـە بتـوانێ جێگـە خاڵییەکەی دایکی لە دڵ و دەروونیدا پڕ بکاتەوە.

بۆچی گڵکۆ و گۆڕستان، ئەو پێگەو بایەخەیان لە شیعری لەتیف هەڵمەتدا هەیە؟

دەتوانین بڵێین زۆربەی شاعیرانی کورد، کەم تا زۆر، گۆڕ و گۆڕستانیان کردۆتە بیرۆکە و ناوئاخنی شیعرەکانیان، ئەوەی لەتیف هەڵمەت لەوان جیا دەکاتەوە، (٢) ڕەهەندی بەرچاوە:

١) شاعیر لەبەشێك دەقەکانیدا، کە ئاماژە بە گڵکۆ و گۆڕستان دەکات، شێوە و دیمەنی دایکی وەکو فریشتەیەکی پاکیزە، دێتە پێش چاو و دەبێتە بەشێك لە پێکهاتەی دەقە شیعرەکە.

٢) لە هیچ دەقە شیعرێکیدا، کە پەیوەست بە گۆڕ و گۆڕستانن، شاعیر نیشانی نادات، کە ڕۆحی دایکە کۆچکردووەکەی لە ناو گۆڕەکە دابێ، ئەمەیش بەڵگەیە کە ئەو باوەڕی بەوە هەیە کە ڕۆح دەگەڕێتەوە ئاسمان و ئەوەی ماوەتەوە هەر ئێسك و پرووسکە، بۆیە هەمیشە کە دێتە گۆڕستان و بەرامبەر گڵکۆی دایکی دادەنیشێ، قسە لە گەڵ کێل و خۆڵ و داروبەرد و تەیروتوارەکان دەکات. واتا دەمێکە دایکە پەریزادەکەی سەر زەوی بەجێهێشتووە. مانەوەی ڕۆحی مردوو لە ناو گۆڕدا نیشانەی ناچاکی ئەو مردوویە و هەر لە عەزابی قەبردا ماوتەوە. لە کۆنەوە ئەو بۆچوونە هەبووە کە مردن نووستنێکی کورتخایەنە و ئەو ڕۆحە جارێکی دیکە دەگەڕێتەوە جەستە خاك و خۆڵەکە. تەنانەت گریکەکۆنەکان بە گۆڕستانیان دەگوت (خەوتنستان).

خۆشەویستییە بەردەوامەکەی شاعیر بۆ دایکی ـ وەك پێشتریش ئاماژەمان پێدا، گەردوونییە، نەسەرەتای هەیە و نەکۆتای، پەیوەندی ئەو دوو ڕۆحە بە کۆچکردنی یەکێکیان درزی تێناکەوێ و لێکجیا نابنەوە. ئەمەیش وایکردوە دایك وا بەگەرم و گوڕی لە شیعرەکانیدا حزووری هەبێ. لە شیتەڵکاری ئەو (٦) دەقەشیعرەی خوارەوە، خەستتر ئەو خاڵانە ڕووندەکەینەوە. شاعیر لەم شیعرەدا وا هەستەکانی خۆی دەردەبڕێ:

***بە دیار کێلی گۆڕەکەی دایکمەوە***
***ڕادەوەستم و***
***لە گەڵیدا دەکەومە گفتوگۆ و***
***پێکەنین...***
***من پێدەکەنم، هەندێ کەس***
***وا دەزانن دەگریم...!***

***جا بۆ بگریم...***

***خۆ دایکم هەرچەند مردووە***

***ئەوە نییە لە هەموو هۆنراوەکانمدا***

***لایە لایەی دڵم دەکات...*** [٢٤٩]

شاعیر کاتێ سەیری گۆڕی دایکی دەکات، بەپێچەوانەی خەڵکی تر، کە بەدیار گـۆڕەوە دیگرین، ئەو دەڵێ پێدەکەنم! هۆکاری پێکەنینەکەوشی زیندویەتی دایکییێتـی، کـە هەمیشـە لەشیعرەکانیدا وجوودی هەیە. شاعیر هەم لەگەڵ کێلی گڵکۆی دایکیدا دەکەوێتە گفتوگۆ هەم زیندوویی دایکی نیشاندەدات: کە تاکو ئێستاش لایەلایەی بۆ کۆرپەکەی خۆی دەڵێت. باشـە، کە شاعیر دەزانێ دایکی کۆچی کردووە و لە دڵی خۆیدا ئەو دایکەی هەڵگرتووە، بـۆ زیـارەتی گڵکۆی دایکی دەکات؟

شاعیر کەسێکی دەروون گەرم و پرسن و تەنیایە، هەمیشە و بەردەوام لە گفتوگۆکردن دایە، لە دەروونناسیدا چەمکی (خۆ ئاخاوتن Intrapersonal communication)، ئاماژەیـە بۆ ئەو گفتوگۆ و ئاخاوتنانەی کەسەکان لەگەڵ خۆیاندا یان لە گەڵ شتەکانی دەوروبـەردا، وەك ئاوێنە و وێنە و گۆڕ و مانگ و ئەستێرە... تاد. دەیکەن بۆ بەتاڵکردنەوەی مێشکی جەنجاڵ و دەروونی پڕ سۆیان. ئەم گفتووگۆکردنە کارێکی زۆر تەندروستییە، وەك ئەو تۆز و خۆڵـە وایـە کە نەرمە بایەك دەیهێنێ و لە گۆشەیەکی ماڵەکەتدا کۆیدەکاتەوە، کەس نازانێ، ڕەنـگ بـێ گوڵێکی جوان یان گیایەکی سەوز، ڕۆژێ لە ڕۆژان، لە ناو ئەو خۆڵەدا شین بێ. [٢٥٠]

---

[٢٤٩] ) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٣١٦ ـ ٣١٨

[٢٥٠])Looking Out،، Looking In، By Ronald B. Adler، Russell F. Proctor II، Amazon.com، ١٩٧٦، ١٤th Edition، P. ١١٤ (کتێب)

دەقە شیعرەکە ئاماژەیەکی شاراوەشە بۆ مۆسیقای شیعرەکانی، بەو واتایە: لەتیف هەڵمەت زۆر پابەندی دەنگی مۆسیقاو ڕتم و ئاوازە و هارمۆنی نێوان حەرف و دەنگە لە شیعرەکانیدا، ئەمەیش دەگەڕێتەوە بۆ دەنگی مۆسیقای لایەلایەی دایکی، کە خۆی گوتەنی (ئەوە نییە لە هەموو هۆنراوەکانمدا) حزووریيان هەیە. شاعیر دەڵێ:

*من نارۆم و لەم زەوییە خۆشەویستە*
*جیانابمەوە...*
*هەموو: شوێن پێ و*
*گۆرانی و*
*شیعر و*
*خەندە و*
*فرمێسکەکانم.. لەم خاکەدایە...*
*چۆن پێیان بڵێم: من دەڕۆم و ئێوە جێدێلم...؟*
*یا چۆن کۆیان کەمەوە و*
*لەگەڵ خۆمدا بیانبەم...!*
*لە چ ئوتێلێکدا جێگایان دەبێتەوە...!*
*ئەی چۆن گۆڕەکەی دایکم*
*بۆ گورگی شەوە برسییەکان بەجێبێلم...؟*
*خۆ نە تۆ یەسقانی و نە من سەگم*
*بەڵام من لەوپەڕی زەویشدا دەربەدەر بم*
*تۆ بە بۆن دەدۆزمەوە...* [251]

---

[251] دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٢٣٠ ـ ٢٣١

زۆرجار دەگوترێ نیشتمان ئەو خاکەیە کە باب و باپیرانمانی لەسەر ژیاون و گۆڕ و گۆڕخانە و یادگارییەکانی ئەوانی تێدایە، بۆیە جێهێشتنی مەحاڵە و عەزابێکی گەورەیە.

شاعیر دڵی دولبەرەکەی دەداتەوە و دڵنیای دەکات، قەت لەهیچ ڕۆژگارێکدا ئەو ئامادەنییە ئەو خاکە جێبهێڵێ، کە (ئەوی) لەسەر دەژی و دەیدۆزێتەوە. بڕوانن شاعیر هەموو ئەوشتانەی لە لای ئەو ئازیزن و دڵی نایەت بەجێیان بهێڵێ، دەخاتە تای تەرازوویەك و گۆڕەکەی دایکی دەخاتە تایەکەی دیکە. واتا ئەو گۆڕە لەلای ئەو یەکسانە بە هەموو شوێن پێ و گۆرانی و شیعر و فرمێسکەکانی شاعیر .(بڕوانە هێڵکارییەکە). ڕەنگ بێ خوێنەر هەبێ، بیری بۆ ئەوە بچێ کە دوای (فرمێسکەکانی) ئێستا نا ئێستا شاعیر ئاماژە بە شەهید و مێژوو و دارستان و تاڤگە و کوێستان و گەرمەسێرەکان دەکات، کەچی دەبینین ڕاستەوخۆ مەزنایەتی و پیرۆزی (گۆڕەکەی دایکی) لەبەر نووکی قەڵەمەکەیدا قووت دەبێتەوە. بێگومان لە دیدی ڕەخنەکار و دەروونناسانەوە، ئەمە واقعێکی زۆر قورس و بایەخداری لە زەین و دەروون و مێشکی شاعیر دا هەیە.



هێڵکاریی هاوسەنگیی گڵکۆی دایکی شاعیر

زیارەتکردنی گۆڕستان، لە کەلتووری زۆربەی ئایین و کۆمەڵگاکاندا هەیە، جیاوازیش لە شێوازی داب و نەریتی زیارەتکردنەکە دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی لە فەلسەفە و دیدگای ئایین و کۆمەڵگاکان. خوێندنی قورئان و دانانی چەپکە گوڵ و ڕەیحان و دان و ئاو بۆ تەیروتواران لە سەر گۆڕی ئازیزان، لە کەلتووری کوردەواریدا تا ئێستا پەیڕەو دەکرێ. هەرچی مەسیحییەکانە، بەتایبەتی لە ڕۆژئاوادا، بەبێ چەپکە گوڵ زیارەتی گۆڕستان ناکەن، بۆیە ئاساییە، هەمیشە

گوڵفرۆشەکان لە بەرقاپی و سەر ڕێی گۆڕستانەکان ببینی. "لەکاتێکدا لە لای جوولەکەکان گوڵ دانان لەسەر گڵکۆ پەسند نییە، چونکە، لە دیدی ئەواندا، گـوڵ تەمـەن کورتـە و زوو سـیس و ژاگاو دەبێ، بۆیە دەبێ بەرد و بەردوکەی جوان و بەنرخ و ناوازە لـە جیـاتی گـوڵ لەسـەر گـۆڕ دانێن."[252]

لەتیف هەڵمەت، لە سەردانێکی بۆ سەرگۆڕی دایکی، دیارییەك لە گەڵ خۆی دەبات، کـە جیاوازی هەیە لەگەڵ دیارییە تەقلیدییەکانی زیارەتکەرانی دیکە، ئەویش جووتێك (مرواری)یە. هونەری شیعری دەقەکە، لە جۆری (مرواری)یەکە دایە، کە سەرچاوەکەی قاوغی ماسی دەریا و زەریاکان نییە، بەڵکو (گلێنەی) چاوەکانی خۆیەتی. بڕوانن شاعیر چ هەستێکی دەربڕیـوە، تـا ئەو جووتە گلێنە ڕەشەی چاوەکانی بکاتە جووتە مرواریەکی سپی و دڕەوشـاوە و بریسـکەدار! شاعیر دەڵێ:

***دایە ڕێم دەدەی جووتێ مرواری***
***بۆ کێلی گڵکۆت بکەم بە دیاری***
***نەڵێی کوڕەکەم دەسڕۆو بێخەمە***
***دایە ئەو جووتە مرواریەی هەمە***
***دوو گلارەکەی هەردوو دیدەمە***
***هێندە شتوونی فرمێسکی زاری***
**سپی سپی بون... بوون بە مرواری...**[253]

---

[252]) الیهودیة تاریخ و عقیدة، د. کامل سعفان، دار الاعتصام للطباعه و النشر و التوزیع، القاهره، ٢٠١٣، ص ١١١

[253]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٥٧٠

لە نێو وشەکاندا، خەمێکی گەردوونی دەبینرێ، ئەویش گریانی بەردەوام و بێ پسانەوەی شاعیرە، کە لە ساتەوەختی کۆچ کردنی دایکییەوە دەستپێکردووە و تاکو ئێستاش بەردەوامە، گریان و فرمێسك ڕشتنێك کە چاوەکانی سپی کردوونەتەوە. بیرۆکەکە لەوە دایە: کە شاعیر دەیەوێ بەنرخترین شت بکاتە دیاری بۆ سەر گۆڕی دایکی، ئەوەندەی سەردێنێ و سەر دەبات، شتێك نادۆزێتەوە لە مرواری بەنرختر بێ ـ بەتایبەتی کە ژنان زۆر حەزی لێدەکەن و خەون بە ملوانکە و گوارەی بە مرواریییەوە دەبینن ـ، بەڵام لە دیدی شاعیردا، نە مرواری سروشتی دەریا و نە مرواریییە دەستکردەکان، ئەو نرخ و قیمەتە مەزنەیان نییە، تا بکرێتە دیارییەکی شایستە بۆ سەر ئەو گلکۆ پیرۆزە. بۆیە شاعیر بۆیەکەمین جار، جۆرە مرواریییەك دادەهێنێ کە پێشتر نەبووە، ئەویش مرواریییەکە کە لە گلێنەی چاوەکانی شاعیرەوە دروستکراون. نابێ ئەوەش فەرامۆش بکەین، کە لە هەموو دونیا هەر ئەو جووتە مرواریییە وجوودیان هەیە. بۆ؟ چونکە شاعیر هەر دوو چاوی هەیە و وا ئەوانیشی کردوەتە ئەو جووتە مرواریییە. ئێستا قەپێلکەکانی چاوی ئەو بەتاڵ و حەتاڵن، هەر خوێن و زووخاو و کێمیان لێدێ! بڕوانن لێرەشدا شاعیر دیارییەکە بە کێلەکانی گۆڕەکەی دایکییەوە دەکات و نایخاتە ناو مستی، چونکە ئەو سەر زەوی جێهێشتووە!

شاعیر لە دەقێکی تەنز ئامێزدا، تەفسیری بوونی ئەو هەموو گۆڕستانەی سەر زەوی دەکات و دەڵێ، ئەوانە هەمووی پاشماوەی یادگاریییەکانی شایی و هەڵپەڕکێی جەنگە جیهانیییەکانن. ئەمەش گاڵتەکردنە بە ئەقڵی شەڕخواز و سەرکردە شەڕانییەکان، کە ئەم جیهانە بەڕێوەدەبەن. دەقنووس لە زاریی داپیریەوە دەڵێ:

***داپیرەم دەڵێ: ئەم گلکۆیانە***
***یادگاریی شایی جەنگی***
***یەکەم و***

***دووەمی***

***جیهانێن...***[٢٥٤]

*شاعیر لە دەقێکی تردا دەڵێ:*

***کە فرمێسکی من و خوێنی زامە کۆنەکانی هەور***

***گڵکۆی دایکمیان تەڕکرد***

***دایکە حەوا ئاوێنیەکی دامێ***

***لە ژوورەکەمدا هەڵمواسی***

***شەو مارێکی قژ درێژی لێ هاتەدەرێ***

***مارەکە کاژی فڕێداو بوو بەپەرییەکی***

***پڕ لەگۆگردی زایەند و***

***لەگەڵ قەڵەمەکەی دەستمدا***

***عاشقی یەکدی بوون***

***ئەوشەوە زانیم***

***ئەگەر دایکە حەوا نەبوایە***

***نەئادەم دوورگەی گوناهی دەدۆزیەوە و***

***نەکۆلۆمبس***

***وڵاتی هیندییە سوورەکانی لە پاپۆڕەکەی مارە دەکرد و***

***نەخدری زیندە تیۆری ماتماتیکی جاویدانی دەسدەکەوت و***

***نەپرۆمیسۆس***

***ئاگری لەخواوەندە ئەفسانەییەکان***

***دەدزی***

***نە قەڵەم شیعری دەبوو...*** [٢٥٥]

---

[٢٥٤]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٧٥١

شاعیر لەڕێی گریان و بیرکردنەوە لەمردن و سەیرکردنی گۆڕی دایکی، ڕۆدەچێتە جیهانێکی خەیاڵاوی و ئەفسانەی نوێ دادەهێنێت، لەوانە سەیرکردنی ئاوێنە و بینینی مار، ئینجا گۆڕانی مارەکە بۆ فریشتە، لـەڕێی کڵکۆکـەی دایکییـەوە کۆمـەڵێ شـتی لێکـداوە و نزیکایـەتییانی خستۆتە ڕوو، ئادەم و حەوا ـ کۆلۆمبس و وڵاتی هیندییە سوورەکان ـ خدریزینده و جاویدانی ـ قەڵەم و شیعر ـ ئەوەی کە زۆر ڕوون نییە و کەمێك شاراوەیە، لەتیف هەڵمەت و دایکـی. وەك چۆن هەریەك لەمانە هی شتێکەوە شتێکی تریان دۆزیوەتەوە، یان بوونەتە تەواوکەری یەکـدی، ئا بەمشێوەش لەتیف هەڵمەت لەڕێی مەرگی دایکییەوە جیهانی شیعرەکانی فراوانتر کردووە.

لە دەقێکی دیکەدا شاعیر دەڵێ:

**(بزر کردن)**

**کە دایکم مرد**

**لە ڕێگای گۆڕستان**

**منداڵیمم بزر کرد...** [٢٥٦]

ئەوکاتەی دایکی مردووە، تەمەنی لەتیف هەڵمەت بەرە و میردمنداڵی هەڵکشـابوو، بـەڵام هێشتا لە خۆشاوی منداڵی هەڵاوێر نەبووبوو، بەڵکو هەر لەگەڵی دەژیا، بەڵام کاتێ کە دایکـی دەمرێ، خۆشییەکان لەدەست دەدات و ناوی لە سەربازی دێتەوە و تەمەنی لـە حەڤدەسـاڵییەوە بەرەو ژوورتر هەنگاو هەڵدەگرێ و قۆناغی منداڵی بەجێ دێڵێ.

---

[٢٥٥] ) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ١١١٠ ـ ١١١١

[٢٥٦] ) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ١٢٦٨

پووختەی تەوەرە:

١) کاتێك دایك سەرزەوی بەجێدەهێڵێ و بەرەو ئاسمان باڵ لێکدەدات و دەچێتە گەڵ پۆلە پەری و فریشتەکانی دیکە، شاعیر هەر گڵکۆی خۆڵاوی شك دەبات، هاموشۆی بکات و نەختێ لە خەم و حەسرەتەکانی خۆی بۆ هەڵڕێژێ.

٢) لەسەردانکردنەکانی بۆ گۆڕستان، دەقنووس هەمیشە گڵکۆ و کێل و داروبەردەکان دەدوێنێ، وەك باوەڕدارێك، ئێسك وپروسك و کەزییە بێڕۆحەکەی ناو گۆڕ نالاوێنێتەوە. هەمیشە پایە و مەقامە پیرۆزەکان بە ڕۆحی چاکی ئەو دایکە دەبەخشێ، زیندوویی ڕۆحی مرۆڤە پاکەکان، وەك هی شەهیدەکان، لە ئایینی ئیسلامدا بەرز دەنرخێنرێت. خودا دەفەرمووێ: (مَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُمْ بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ.)[٢٥٧]

---

[٢٥٧]) قورئانی پیرۆز، سورەتی النحل، ئایەتی ٩٧

( ٩ )

## ســك بەخۆسووتان لە بێدایکیدا

لە تەوەرەی سێیەمی ئەم بەندەدا، پووختەیکمان دەربارەی (بێـدایکی) بـۆ نووسـین، لێـرەدا ڕەنگدانــەوەی ئاســەوارێکی دیکــەی ئــەو بێدایکییــە شــیدەکەینەوە، کــە ئــەویش ســك (زك)بەخۆسووتانە. لە دەروونناسیدا، جۆرەکانی سۆز (Emotion) بـە هـەردوو شـێوەکەیەوە: سۆزی ئەرێنی و سـۆزی نـەرێنی (Positive & Negative Emotions)، زۆر درێـژە و بـە دەیان لقی لێدەبێتەوە. یەکێك لە جۆرەکانێکی سۆزی نەرێنی، پێیدەکوترێت (سك بەخۆسـووتان Self – Pity) کە (کاسپەر ماك کلاود Caspar McCloud)، لە کتێبی (نمایشیکردنی ڕۆحی سك بەخۆسووتان) دا بە (٥) ڕستە پێناسەی دەکات و دەڵێ، دەکرێ سك بەخۆسووتان:

- بارو دۆخ و تەرحە ڕووداوێك بێ لە ژیان کە تەحەمولکردنی ئەستەم بێ.
- یان هەمیشە سـەرکۆنەکردنی خـودی خـۆت و کولاندنـەوەی برینـە کۆنـەکانی بیرەوەرییـە ناخۆشەکان بێت.
- یان خۆخواردنەوە و دڵتەنگی و ڕەشبینی بێت.
- یان وا هەست بکەی هەمیشە تۆ قوربانی کەسانی، یان ڕووداوی دەستی کەسانی دیکە بیت.
- یـان وا هەسـت بکـەی یـەکجار تینـووی سـۆز و حـەز و لاوانـەوەیت و دەتـەوێ کەسـانی دەوروپشتت ئەو تینوویەتییەت بشکێنن.

زاراوەی سك بەخۆسووتان وا دێتە پێش چاو، کە دیاردەکـە خودییـە و لـە نـاخی کەسـەکەدا هەڵدەقوڵێت، کەچی پێچەوانەکەی دروستە، ئەوا ژینگە و دوروپشتی ئەو کەسەیە ئـەو بـارە دەروونییەی بۆ دروستکردووە، دەنـا کەسـەکە بۆخـۆی کـە تەنیایـە هـیچ کێشـەیکی نییـە.

بەواتایەکی دیکە، هەرکاتێك ئەو کەسە خۆی بە کەسانی دەوروبەری بەراورد دەکات، هەست بە بوونی جۆرێك لە کەموکوڕی دەکات، لێرەدا بارە دەروونییەکە چەکەرە دەکات. بەڵام خاڵێکی بایەخدار هەیە کە لەلای هێندەکان شاراوەیە، کە ئەگەرچی سك بەخۆسووتان جۆرێکە لە سۆزی نەرێنی، بەڵام زۆرجار ئەو سۆزە نەرێنییە، دەبێتە مۆتیڤ و هاندەر و یارمەتیدەر بۆ داهێنان، جا لەهەر بوارێك بێ. بۆچی وە چۆن؟ خڕبوونەوە و پەنگخواردنەوەی سۆز لە دەروونداا، وەك کۆبوونەو و پەنگخواردنەوەی ئاوی ژێر زەوییە، لە هەر شوێن و کاتێکدا، درز و کون و کەلەبەرێك بدۆزێتەوە، لە شێوەی کانی و کارێز دەتەقێتەوە و جۆگە و جۆباری لەبەر دەڕوا.[٢٥٨]

ڕەنگدانەوەی ئەو دیاردەیە، بە زەقی لە شیعرەکانی لەتیف هەڵمەتدا بەدی دەکرێ، ئەو پێش ئەوەی شاعیر بێ، مرۆڤە، بۆیە زۆر ئاساییە کە هەڵگری چەندان لەو خەسڵەتانە بێ کە لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا هەیە، جا شاعیری سادق و ڕاستگۆ و بوێر، بێشەرم وشکۆ هەستەکانی خۆی لە دەقەکانیدا دەتوێنێتەوە.

لە دیدەنییەکدا، لە لەتیف هەڵمەت دەپرسن: ئایە تۆ هەست بەوە دەکەی نەقسێکت هەبێ؟ بۆچی ئەم شیعرەت گوتوە کە دەڵێ:

***کچێ نەکەی خەیاڵ بکەی، دەست گیران و دڵدارم بی***
***من سەرەڕای ئەوەی زۆر لات و زگار و غەمکینم،***
***هەتا بڵێی لەڕ و سیس و ناشیرنم.***

[٢٥٨]) Exposing the Spirit of Self-Pity،، by Caspar McCloud، Published by Amazon com.، ٢٠١١، PP.٤٣ – ٤٤ (کتێب)

له وەڵامدا، دەڵێ:" ئەشێ واش بێ ئەو لەحزەیە ئەو کچەم زۆر لا جوان بووبێ، خۆم زۆر بەناشیرین زانیبێ، ئەمە هێنی ئەوەشە کۆمەڵێ شیعرم بڵاوکردبووەوە، هەندێ کچ خوێندبوویانەوە، یەکیان وتبووی وەکو بیستمەوە، خۆزگە خۆشی وەکو شیعرەکانی جوان بوایە، ئەوەکەی تر گوتبووی بەخوا مادام ئەو شیعرەی وا جوانە خۆشی جوانە، بەخوا لە کوێیە من شووشی پێدەکەم، قسەکەم ئەوها بۆ هاتەوە. منیش خەبەرم بۆ هات و ئەم شیعرەم نووسی - له وەڵامی پرسیارێکی دیکەشدا دەڵێ: باری دەروونی وەکو سروشت وایە، زستان ئەگۆڕێ ئەبێ بەهاوین فەسلەکان دەگۆڕێن، باری دەروونیش بەڕای من هەروایە، هیچ ئینسانێك لەم گەردوونەدا تەنانەت پێغەمبەرەکانیش و پیاو چاکەکانیش هەر باری دەروونیان سابت نەبووە."[259]

ئێستا له شیکردنەوی چەند دەقە شیعرێکدا شیتەڵکاری بۆ باری دەروونی دەقنووس و ڕەخنەکاری بۆ دەقەکانی دەکەین، بەو مرازەی ئەو خاڵەی سەرەوە ساغبکەینەوە، کە چۆن سك بەخۆسووتان بۆی هەیە ببێتە مۆتیڤی داهێنان یان ئەداکردنی چالاکییەکی جوانی چاوەڕوان نەکراو. هەمووشیان لە ژێر ساباتی (دایك)دا.

شاعیر دەڵێ:

***پێش چەند ساڵێك خۆم و چەند هاورێیەك***
***لەبەر دەرگای تەجنیدی شارەکەمدا***
***چاوەروانی ئەوەمان دەکرد***
***کە بۆ سەربازیمان بەرن...***
***دایك و دڵداری هەموو هاورێکانم***
***بۆ خواحافیزی ئامادە بوو بوون و***

[259]) دیدەنی هاوژین سلێوە لەگەڵ لەتیف هەڵمەت، ١٩ / ٣ / ٢٠١٢

***ئاسمانی چاوەدوورەکانیان***
***ڕەشەبای گریان و سۆزو خۆشەویستی و خەم***
***دایگرتبوو...***
***برژانگەکانم بوون بە دارستانی فرمێسکی***
***قورس و***
***مەلی خەم...***
***چونکە من نە دایکم و نە خۆشەویستێك***
***بۆ بەرێ خستنم نەهاتبوون***
***ئای چی لە بێ دایکی و لەوە ناخۆشترە کە***
***لە زەوی دا***
***کچێك نەبێ لە زمانی شاعیرێك بگات...!***
*********
***کە سەربازیش بووم***
***جانتای هاورێ سەربازەکانم***
***کە لە ئیجازە دەهاتنەوە***
***بۆنی دایك و دەسگیرانەکانیانی لێ دەهات...***
***بەڵام جانتای من بۆنی گوڵی شیعری نامۆیی و***
***خەمی ئاگر...!*** [٢٦٠]

دەقنووس خاڵێکی پێناسەکەی (کاسپەر ماك کلاود) نمایش دەکات، کە دەڵێ: (سك بەخۆسووتاو وا هەست دەکات یەکجار تینووی سۆز و حەز و لاوانەوەیە و دەیەوێ کەسانی دەوروپشت ئەو تینوویەتییە بشکێنن. لێرەدا دوو لەو حەزانەی دەقنووس کە لە کات و شوێنێکی تایبەتدا تینووی بووە، دەخوێنینەوە: (کە دیمەنی بۆ سەربازی بردن... سەربازە

---

[٢٦٠]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٣٢٢ ـ ٣٢٣

هاوڕێیەکانی لە ئیجازە دەگەڕێنەوە). ئەو کەسانەی کە ئاگری سۆزی سك بەخۆسووتانەکە خۆشدەکەن: دیار نەبوونی دایك و خۆشەویستەکەیەتی ـ لەبەردەم قاپی دائیرەی تەجنەد و لە نەناردنی کولێچە و کێك و نوقڵ و مێوژوو و گوێزو...تاد. ئەمەیش ئەوە دەسەلمێنێ، کە هۆکاری هەستکردن بە سك بەخۆسووتانەکە دەوروبەرەکەیە- بێدایکی و بێ دەستگیرانی ـ نەك نەخۆشییەکی دەروونی یان جەستەیی.

لە دەقەکەدا (٢) پنت سەرنجمان ڕادەکێشێ: ١) هەستکردن بە بێدایکی و بێدەستگیرانی، لە دیدی دەقنووسدا، ناخۆشترین ناخۆشییە لە سەرزەویدا و قەت هیچ شتێك نییە بە قەد ئەو حاڵەتە سەخت و دژووار و قورس بێ، ئەو دەڵێ (*ئای چی لە بێ دایکی و لەوە ناخۆشترە کە/ لە زەوی دا/ کچێك نەبێ لە زمانی شاعیرێك بگات*). ٢) تەقینەوەی کاریزی ئەو هەستە پەنگخواردووە، چەندان وێنەی هونەری شیعری بە دەقنووس بەخشیوە، شاعیر قەرزاری ئەو سك بەخۆسووتانەیە. ئەو دەڵێ: (*ئاسمانی چاوە دوورەکانیان ڕەشەبای گریان و سۆز و خۆشەویستی و خەم/ دایگرتبوو.../ برژانگەکانم بوون بە دارستانی فرمێسکی/ قورس و/ مەلی خەم...*).
ئاسمانێکی دوور دوور، دیارە بەچاو، بڕوانن ئاسمان بۆخۆی دوورە دەقنووس دوورتریشی کردۆتەوە، لەو ئاسمانەدا ڕەشەبایەك هەڵدەکات لە جیاتی تۆز و خۆڵ، گریان و سۆز و خۆشەویستی و خەم دەهێنێ. دیمەنی گەڵا و لق و پۆی درەختی ئەو دارستانانە زۆر دڵگیر و حەزینە، کە چك چك دڵۆپە بارانیان لێ دەتکێتەوە، چەندە جوانە برژانگ ئەو دارستانە بێ و فرمێسك ئەو دڵۆپە باراننانە بێ. لەوەش جوانتر هەم فرمێسکەکان قورسن و لقوپۆی دارەکانیان شۆڕکردۆتەوە هەم تەیروتواری ئەو دارستانەی برژانکەکان، خەم و حەسرەت و چاوەڕوانین.

هەروەها ئەو دەڵێ: (*جانتای هاوڕێ سەربازەکانم/ کە لە ئیجازە دەهاتنەوە/ بۆنی دایك و دەسگیرانەکانیانی لێ دەهات.../ بەڵام جانتای من بۆنی گوڵی شیعری نامۆیی و/ خەمی ئاگر*). لەبەراوردکردنی ئەو (٢) جانتایە، هەست بە دژواری سك بەخۆسووتانەکەی دەقنووس دەکرێ. لەم دوو کۆپلەدا سەیرکەن بە ئاشکرا دەقنووس تینوویەتی خۆی نیشانددا بە ئاماژەکردنی بۆ (خەم ٣ جار/ سۆز/ خۆشەویستی )، تینوویەتیشی بۆ کەسەکان دیارە (دایك ٤

جار، خۆشەویست و کچ و دەستگیران) دووپاتکرنەوی وشەی (ئاگر)یش سەختی حالەتە دەروونیەکەی ئەو زەقتر دەکاتەوە.

شاعیر لە دەقەشیعری (ئەی مانگە دوورەکە)دا دەڵێ:

***ئەی مانگە دوورەکە خۆ من دەزگیرانم نییە***
***بڕۆم بە دزی دایك و باوکییەوە***
***لە پەنجەرەیەکی نهێنییەوە***
***نامەی لێ بدزم و***
***لە دەرگایەکی نهێنییەوە***
***بمباتە ژوورەوە و***
***لە ژێر پرچەکەی دا بمحەسێنێتەوە...***
***خۆ من دایکم نییە***
***نانی گەرمم بۆ هەڵگرێ و***
***هەرکە لە دەرگاکەمانم دا***
***تەقەی دەستم بناسێ و***
***ئەملاو ئەملام ماچ بکات و***
***بڵێ:***
***ئەرێ کوڕە شیرینەکەم***
***دنیا ئاڵۆزە و***
***مەرگ دەبارێ و***
***زەوی دەقلیشێتەوە و***
***پیاو قووت دەدات...***
***تۆ بۆ ئەم ئێوارەیە...***
***وا درەنگ هاتیتەوە...***
***ئەی مانگە دوورەکە...***

*لە شەقامێکدا ڕادەوستم و*

*سەیری تۆ دەکەم...*

*تیشکەکانی تۆ*

*بۆنی وڵاتە دوورەکەمیان لێ دێ...* [٢٦١]

مەسەلەی قسە کردنی مرۆڤ لەگەڵ دیاردەکانی سروشت، بەتایبەتی لەنێو شیعردا پانتاییەکی فراوانی هەیە، (بێکەس)ی شاعیر لەشیعری (ئەی مانگ)دا زۆر بە جوانی ڕاز و نیازی خۆی بۆ مانگ دەگێڕێتەوە و هاودەردی و دووری مانگ و ڕەنگ زەردی مانگ بە نەهامەتییەکانی خۆی دەچوێنێ، بەلاّم لەتیف هەڵمەت، مانگ بە کەسێکی هۆشمەند و دەروونناس دادەنێ، کە دەردە دڵی خۆی بۆ بەیان دەکات. شیعرەکە مۆنۆلۆگە (Monologue) لەگەڵ خۆی، ئاراستەی قسەکانی هەر بۆخودی خۆی و ناخی خۆیەتی، زۆر جار مرۆڤ کە دڵی پڕدەبێ، حەزدەکا دردەدڵی خۆی بۆکەسێك بەیان بکات، یان لەگەڵ خودی خۆی بدوێ، وەك ئەوەی ئەو کەسە دەبێت بە دوو کەس لەیەك جەستەدا، شاعیر هەست بەنامۆییەکی زۆر دەکات، ئەو بێبەشە لەسۆزی دایك، سەرەڕای ئەوەش، کەسێکی تر، دەستگیرانێك، ئافرەتێك نییە ئەوکەلێنە گەورەیەی بۆ پڕبکاتەوە. بۆیە تەنها سەیری مانگ دەکات، بەڵکو تالێك لە تریفەی ئەوەی بەربکەوێت و ناخی هەژاو و دەروونی شێواوی ڕووناك بکاتەوە. شاعیر دەڵێ: (*تیشکەکانی تۆ/ بۆنی وڵاتە دوورەکەمیان لێ دێ*)، ئەمەش بە بەخشینی سیفەتی بۆن بە (تیشك) کە بێ بۆنە. شێوەی بۆنەکەشی لە هەموو بۆنەکانی وڵاتەکەی خۆیدا دەبینێتەوە. وێنەکە بەشێوازی هەست گۆڕکێ وەردەگیرێ. لە زانستی (ڕەنگ)دا، سەلمێندراوە کە هەر ڕەنگێك دەنگێك یان ئاوازێك یان توونێکی (Tune) تایبەت بەخۆی هەیە. [٢٦٢] کەواتە دوور نییە ڕۆژێك زانست بیسەلمێنێ کە زۆر لە شتە بێبۆنەکانی وەك: (تیشك، تریفە، جلیوەی ئەستێرە، گەڤر، بەفر، شەکر، زێر و زیو و...تاد) بۆنی تایبەت بەخۆیان هەیە. شاعیر خاوەن

---

[٢٦١]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ١٦٤ ـ ١٦٥

[٢٦٢]) دەنگ لە شیعری کەریم دەشتیدا، فازیل شەوڕۆ، بلاّوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، هەولێر، ٢٠١٣، ل ٤٤

دەسەڵاتێکی باڵایە بە دەر لە جیهانی شیعر. ئەوان ڕەنگی ئەنفال و ڕەنگی تەنیایی و بۆنی تیشك و تامی خۆریان...تاد داهێناوە. لەم دەقەدا سك بەخۆسووتانی شاعیر بازنەکەی فراوان دەبێ و هێندە گاریگەرە.

شاعیر دەڵێ:

***کە منالْ بووم هەرچەند بیانووم بگرتایە***

***دایکم لێی دەپرسیم:***

***- کورە سەلارەکەم چیت دەوێ***

***ئای خۆ ئێستا دایکم نەماوە ژێرم کاتەوە***

***ئەگەر شەوێ کزەبایەکی پەمەیی***

***بۆنی خەمە قاوەییەکەی من***

***لە لووتی بپژێنێ***

***ئەوسا دەزانم چی دەڵێ:***

***- وایش کوێراییم دایێ کورەکەی من***

***منالێکی نازدارە...***

***ئەوە کێیە ئەوەندە سزای گیانیی دەدا...؟***

***ئای دایکم نازانێ ئێستا کورە شەرمنەکەی***

***گەورە بووە و***

***ئێستا ئەگەر ژنێکی شیرین***

***یا کچێکی بەناز ببینێ***

***وەکو کلۆ بەفری ناو گۆمێك لە شەرمێکی گەرمدا***

***ناتوێتەوە***

***ئێستا کورە شەرمنەکەی شاعیرە و***

***لەگەڵ کچە چاوبازەکاندا***

*دڵداری دەکا... و*

*کچێکی خۆش دەوێ ناوی ناوە:*

*شیرین...!* [٢٦٣]

لەم شیعرەدا هەرچەندە رەگێکی دەچێتەوە دونیای منداڵی بەڵام ڕەگەکەی تری ئەوئان و ساتەیە کە شیعرەکەی نووسیوە، شاعیر شۆڕدەبێتەوە یادی منداڵی و یادی دایکی دەکاتەوە، بەڵام ئەو دەقەیان وەك ئەوەی پێشوو ڕەشبینی پێوە دیار نییە، چونکە لەنێوان هەردوو تای تەرازووەکە، دایك و دەستگیران، ئەوا یادی دایکی دەکاتەوە، بەڵام بووە بەخاوەنی دەستگیران، خاوەنی کەسێك کە خۆشی دەوێ. هەست دەکرێ کەمێ بارە دەروونییە قورسەکەی هێوربۆتەوە، بەڵام بەڕوونیش دیارە کە هۆکارێکی سەرەکی هەستکردن بەو سك بەخۆسووتانە، بێدایکییە. شاعیر لە سەردەمی منداڵیدا هیچ کێشەیەکی نەبووە و ئەسڵەن نەشیزانیووە ئەو تەرزە حاڵەتە دەروونییە هەیە. بۆ؟ چونکە حزووری دایك لە ژیانی ئەودا، لەو سەردەمەدا، هەموو کەموکوڕی و نووقسانییەکانی پڕکردبۆوە، وەك شاعیر بۆخۆی دەڵێ: ((جگە لەوەی ئەو (دایك ) بوو هاوڕێشم بوو، یانی کەس نەبوو لەهەموو ژیانم بەقەد دایکم منی خۆش ویستبێ، خۆشەویستییەکی تایبەت لەنێوان من و دایکمدا هەبوو))[٢٦٤] لەم دەقەدا، دەقنووس دوای ئەو هەموو ساڵە دەقی گوتەکانی دایکی لەبیرنەچۆتەوە و بە زمانی ئەو دەنووسێ: (*وایش کوێراییم دایێ کوڕەکەی من/ منالێکی نازدارە...*). ئەمەش قولی ئەو خۆشەویستییە دەسەلمێنێ.

لە دەقەکەدا، وێنەیەکی پەڕادۆکس هەیە، کە شاعیر شەرمی شکاوە و بە تەحەداوە باسی ئاشکراکردنی ناوی خۆشەویستەکەی دەکات و کوڕەشەرمنەکەی جاری جارن نییە. باشە ئەم پەڕادۆکسە لە چییەوە سەرچاوەی گرتووە؟ (شیرین) دولبەرێکی خەیاڵییە، یان دولبەرێکی

---

[٢٦٣]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٢٥٤ ـ ٢٥٥

[٢٦٤]) دیدەنی هاوژین سلێوە لەگەڵ لەتیف هەڵمەت، ٢٠١٧

واقعییه، بەڵام ئەشێ ناوی شیرین نەبێ، شیرین ناوێکی خواستراو بێ، وەك داستانی دڵداری (شیرین و فەرهاد)، کە زۆر کەس دەستگیرانەکەی خۆی بەشیرین داناوە. شاعیر دەڵێ:

*کە دارێکی سەوز دەبڕنەوە*

*هەزاران پاساری بە دوایدا*

*گریان دەبارێنن وخەمێکی چەور دایان دگرێ*

*بەڵام کە من دەمرم...*

*نە دایکم هەیە... پرچم بۆ بڕنێ و*

*بڵاوێنێتەوە...*

*نە وێنەیەکیشم لە جانتای کچێکی جواندا*

*بەجێ دەمێنێ...*

*هەموو ئەو کچانەی کە خۆشم دەوێن...*

*ڕوخسارە ناشیرینە جوانەکەم و*

*لەشە لاوازەکەم... لەیاد دەکەن و*

*شیعرەکانم دەخوێننەوە و*

*هەر ناویشم نازانن...*

***

*هەموو شاعیرەکان*

*بەمەرەکەب هۆنراوە دەنووسن و*

*باسی سایەقەی چاو و*

*خەرمانی قژی دڵدارەکانیان دەکەن...*

*هەموو دڵدارەکانیش*

*هەر بەمەرەکەب نامە بۆ یەکتر*

*دەنووسن...*

*بەڵام من بە دڵۆپەی خوێنی جەرگی خۆم*

*شیعر بۆ چاوی ئەو کچانە دەنووسم*

*کە خۆشیان دەوێم و*

*خۆشیان ناوێم...*

*هەموو فەرهەنگەکان*

*بۆنی مەرەکەبیان لێ دێ...*

*بەڵام هۆنراوەکانی من...*

*بۆنی خوێنی خۆم...!*

*کێ وەکو من*

*گوڵی وشە*

*لەخوێنی دڵی خۆی*

*تێر دەکات...!* [٢٦٥]

شاعیر لە دەربڕینی بیرۆکەکانی، نامۆیی و بێمرادی خۆی دەخاتە ڕوو، بەڵام ئەم بێهێزی و خەم و خەفەتە بەوە هاوسەنگ دەکاتەوە، کە ئەو هەروا هاکەزایی نانووسێ، ئەو قەڵەمەی پێی دەنووسێ، مەرەکەبەکەی جیاوازەو لەهی شاعیران و ئەدبیانی تر ناچێ، شاعیر لەژێر سێبەری خودشەیدایی (نەرگسیەت) گوزارشت لە و ئیعجاب بوون بە بەهرەکان و وتەکانی خۆی دەکا. لەهەمان کاتیشد بەزەی بەحاڵی خۆیدا دێ، بۆیە وا بەجۆش و خرۆشەوە ئەو سك بەخۆسووتانەی خۆی لە خەمنامەکانیدا بەئەرشیف دەکات، جۆش و خرۆشێك لێوان لێو لە پەرۆشی و نامرادی و حەسرەت. لەم دەقەدا (٢) خاڵی بەرچاو، ڕەهەندی دەروونی و شیعری گەشتر دەکاتەوە:

١) دەقنووس مەودا و کاریگەری سك بەخۆسووتانەکەی نەك هەر کردۆتە هاوتەمەنی خۆی، بەڵکو لە دوای مەرگیشیدا درێژە و بەردەوامی دەبێ. ئەمەیشە نیشانەی قورسی و سەختی ئەو بارە دەروونییەیە کە (کاسپەر ماك کلاود) ئاماژەی پێداوە. دەقنووس دەڵێ: (بەڵام کەمن

[٢٦٥]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٢٧٩ ـ ٢٣٠

*دەمرم...نەدایکم هەیە... پرچم بۆ برنێ و/ بڵاوێنێتەوە.../ نە وێنەیەکیشم لە جانتای کچێکی جواندا/ بەجێ دەمێنێ...)*

٢) دەقنووس بێشەرم و شاردنەوە ئاماژە بە ڕوخسار و شێوەی خۆی دەکات، ئەمەیش بوێری و ڕاستگۆیی و باوەڕبەخۆ بوونی ئەو نیشاندەدات. ئەو دەڵێ: (*هەموو ئەو کچانەی کە خۆشم دەوێن.../ ڕوخسارە ناشیرینە جوانەکەم و/ لەشە لاوازەکەم... لەیاد دەکەن و/ شیعرەکانم دەخوێننەوە و/ هەر ناویشم نازانن...*). ئەوەی هێز و تین و ئومێدی بەو بەخشیوە، نەمری و زیندوویی شیعرەکانیەتی کە بەردەوام دەخوێندرێنەوە.

شاعیران بە مەرەکەبی جیاواز شیعر دەنووسنەوە، ئەوەتا پابلۆنیرۆدا، بە مەرەکەبی سەوز شیعرەکانی دەنووسێ و شێرکۆ بێکەس هەمیشە بە قەڵەمی ڕەشی نووسیوە و یادەوەرییەکانیشی ناوناوە (نووسین بەئاوی خۆڵەمێش)، هەرچی (لەتیف هەڵمەت)ە شیعرەکانی بە خوێن دەنووسێ، بەمەیش دەیەوێ دوو نیشانە پێکەوە بشکێنێ: لەلایەك دەڵێ: شیعرەکانم بەرهەمی خوێن و زوخاو و شەونخونی و ڕەنجی خۆمە، بە قەد خوێن بە نرخ و قیمەتن، کە خوێن ئەو مادە شلە بەبەهایەی نێو جەستەی مرۆڤە ژیانی بە ئەوەوە پەیوەستە. لە لایەکی دیکە، خۆشەویستی و قەدرزانی خۆی بۆ شیعرەکانی نیشاندەدات و هێندە لەلای پیرۆز و موتفەرکن بە خوێن دەیاننووسێتەوە .(*هەموو فەرهەنگەکان/ بۆنی مەرەکەبیان لێ دێ.../ بەڵام هۆنراوەکانی من.../ بۆنی خوێنی خۆم...!*) [٢٦٦]

ئەمانە هەمووی بەڵگەن، کە ئەو سك بەخۆ سووتانە، بۆ شاعیر بۆتە مۆتیڤی داهێنانی شیعر، کە چێژی خۆشییەکی تایبەت بەو دەبەخشن .(نالی)مان وەبیردێنێتەوە کە دەڵێ:

---

[٢٦٦]) لەم سەردەمەدا هێندێك کەس، کە تاتۆ لەسەر جەستەی خۆیان دەکەن، مەرەکەبی تاتۆیەکە (Pigment)، لەگەڵ چەند دڵۆپە خوێنێکی (خۆشەویستەکەیان) تێکەڵ دەکەن، وەك نیشانەی وەفاداری و ئەمەکداری. (نووسەران)

***...شیعری خەڵقی کەی دەگاتە شیعری من بۆ نازکی***
***کەی لە دیقەتدا پەتك دەعوا لەگەڵ هەودا دەکا...*** [٢٦٧]

وەك ئاماژەمان پێکردبوو، ئەو جۆرە ستایلەی نووسین لە شیعرەکەی نالی و (لەتیف هەڵمەت)یش ئاوێتەی خودشەیدایی شاعیرن و شانازی بە بەهرەی خۆیانەوە دەکەن.

دەقنووس لە کۆپلەیەکدا دەبێژێ:

***کە شتێکی جوان دەبینم..***
***کە لەبەر کۆگایەکدا رادەوەستم و***
***شتێکی دەگمەن***
***سەرنجی شاعیرانەم، دەدزێ...***
***دەڵێم چەند ژەمێ نان ناخۆم و***
***پارە کۆ دەکەمەوەو دەیکڕم...***
***بەڵام ئای ئاخر بۆ کێی بکڕم...؟***
***خۆ من...***
***نە دایکم هەیە و...***
***نە دەسگیران...***
***نە کچێکیش داوای دیارییەکم***
***لێ دەکات...!*** [٢٦٨]

لەنێوان دێڕەکانی ئەم شیعرەدا، ئاماژەیەکی شاراوە هەیە، کە هەر بێدایکی و بێ دولبەری نییە ئەوی وا پەرێشان و زەبوون کردووە، بەڵکو بێ منداڵیش، داشێکی شەترەنجی ئەو

[٢٦٧]) مەلا عەبدولکەریمی مدرس و فاتح عبدالكريم، دیوانی نالی، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٦، ل ١٠٧

[٢٦٨]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٣٠٤ ـ ٣٠٦

یارییە خەماوییەیە لە نێوان (ئەو و خویدا). ڕاوەستان لەبەردەمی جامخانــەکان و بینــینی شــتی سەرنجراکێش و جوان، حەتمەن شت و یاری و گەمــەی منداڵانیشــی دەگرێتــەوە. دەقنــووس بــە حەسرەتەوە دەڵێ: (*بەڵام ئای! ئاخر بۆ کێی بکڕم...؟*). ئەوەی کە پەیامگر موتەئسیر دەکـات بڕینی نان و ژەمەکانییەتی بۆ کۆکردنەوەی چەند قروشێك تا دیارییــەکانی پــێ بکڕێـت. ئەمــە تەنزێکی ژەهراوییە، کە لە سەرەتایی هەزارەی سێیەمدا، شاعیری کـورد چـۆن دەژیـت و چـۆن گوزەران دەکات .(لەکاتێکدا شاعیرانی مەزنی وڵاتــە پێشــکەوتووەکان چـەکی بـانقی کـراوە و پەساپۆرتی دیبلۆماسی و زۆر ئیمتیازاتی دیکەیان هەیە). حەیف و مەخابن! لــەتیف هەڵمــەت دەڵێت: " ئەتوانم بڵێم لەناوەندی هەشتاکاندا، چــەند ســاڵێك نەمئــەمتوانی بــەئارەزووی خــۆم کتێب بکڕم، نەمئەتوانی بەئارەزووی خۆم برادەران لەشارەکانی ترو فلان شاعیر هاوڕێمــە بتــوانم بەئارەزووی خۆم ببینم و مناقەشەی ئەدەبی بکەین، گەلێ جار لەوانەیە لە کۆڕێ شــتێ بـانگ کرابم، ڕەنگە زۆرجار نەچوبێتم، چونکە ئەو پارەیەی کە ئەمدا بەم سەفەرە بڕۆم و بــێم، ڕەنگــە ئەوسا پانزە دیناری تێچووبوایە، ئەو دە پازدە دینارە هەستم دەکرد، کە ئەبێ لەشــتێکی تــردا سەرفی بکەم، کە ڕەنگە هەندێ حاڵاتی ئەدەبی و بازنەی ڕۆشنبیری تیا بێبەش بووبێتم، لەبــەر ئەوەی نەمتوانیووە سەفەربکەم بۆ ئەم شوێنانە لەهەشتاکاندا، لەسەرەتای نەوەتەکانیشدا تەنگ و چەڵەمەی ئابووری هەمووی گرتبووەوە ئەو چەند ساڵە منیشی گرتبووەوە."[٢٦٩]

شــاعیر لەشــیعرێکی دیکــە دا، ئیرەیــی بــردن بــە ڕۆبــۆت و بووکەشووشــە. لوتکــەی ســك بەخۆسووتانی شاعیرە. دواتر ڕۆبۆتیش لەخۆی بەبەختەوەرتر دەزانێ:

***ئەگەر من ڕۆبۆتێك بوومایە***

***بووکەشووشەم خۆشدەویست***

٢٦٩ - دیدەنی هاوژین سلێوە لەگەڵ لەتیف هەڵمەت، ١٩ / ٣ / ٢٠١٢

*یا پەنجەرەیەك؟*

*ئەگەر ڕۆبۆت و بووكەشووشە*

*جووت نەبن*

*نیترۆن دروست نابێ..؟*

*هەرچۆنێ بێ*

*ڕۆبۆت بەختەوەرە*

*چونكە دایكی نییە كەبمرێ بەدوایدا بگری و*

*نیشتمانیشی نییە*

*بەتۆبزی ڕاپێچی سەربازی بكات..!* [270]

ئەزموونی نووسین و خستنە ڕووی بیرۆكەكان لەلای (لەتیف هەڵمەت) سەرەتاتكێ بەنێو زۆر كەلێن و كەلەبەردادەكەن، زۆر پەنجەرەی نوێ دەكاتەوە، شاعیر خەمە گەورەكەی لەدەستدانی دایكی، هەر بەبەراورد كردنی بە مرۆڤەكان و سروشت پێوانە ناكات، بەڵكو پەنا بۆ ڕۆبۆتیش دەبات بۆئەوەی لەپاڵ ئەوەوە، هەستە پەنكخواردووەكەی ناخی خۆی دەربڕێ، خۆزگە بەوە دەخوازێ، هەرچەندە ڕۆبۆت كاردەكات و ئەركی پێدەسپێردراوەكانی خۆی بە ڕێك و پێكی ئەنجامدەدا، بەڵام خاڵییە لە مەشاعیر و هەست و بیركردنەوە، شاعیر حەزدەكات وەك ڕۆبۆت بێت هیچی تر نەكەوێتە كێژاوی ئازار و بیركردنەوە.

[270] دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٩٢٦ ـ ٩٢٧

پووختەی تەوەرە:

١) دەقنووس وەك هەموو مرۆڤێك چەندان شێوەی سۆزی لە دڵ و دەرووندایە، سك بەخۆسووتان وەك سۆزی نەرێنی، بەزەقی لە بەرهەمە شیعرەکاندا دیارە. دروستکەرەکانی ئەو دیاردەیە زۆرن، بۆ قارەمەنەکەی ئەم لێکۆڵینەوە، بێدایکی دواتر بێ یاریی و بێدەستگیرانی هۆکاری سەرەکی چەکەرەکردن و سەوزبوونی ئەم دیاردە دەروونییەن.

٢) دیاردەکە بۆتە مۆتیڤی دارِشتی چەندان دەقەشیعر. ئەمەیش بۆچوونە زانستییەکان پشتڕاست دەکاتەوە، کە پەنکخواردنەوەی سۆز ـ هەر سۆزێك، بۆی هەیە ببێتە هاندەر و یارمەتیدەری تەقاندنەوەی کانیاوی بەهرەی خاوەنەکەی.

٣) دەقەکانی ئەم تەوەرەش ڕاستگۆیی شاعیر لە دەربڕینەکانیدا نیشان دەدەن، ڕیالیزمی لە پاڵ چەندان ڕێبازی ئەدەبی دیکە، خەسڵەتێکی بەچاوی شیعرەکانی ئەوە.

## ( ١٠ )

## دایــك، ســاباتی سێبووری

نووسەری ئەمەریکی (تۆماس جی. فیفەر Thomas G. Fiffer)کە هەڵگری بڕوانامــەی ماستەرە لە (نووسینی داهێنەرانە) دەڵێ: "چرکەساتێکی سەختە کە جار هەیە لــە ژیانمانــدا، دەگەینە کەناری ڕووبارێك کە هیچ پرد و دارەڕێییەکی بەسەرەوە نییــە، ناچــاریت دەســت بــە هەموو شتێکەوە بگریت بە (هیچەیشەوە) بــەو ئومێــدەی بەســەلامەتی بگەیتــە ئــەو بــەری کەنارەکە، کە نــە نەخشــەی دیــارە و نــە سروشــت. هــەر ئەوەنــدە دەزانــی کــە ئــەو شــوێنە مەملەکــەتێکی مەجهولــە و گەڕانــەوەش بــۆ ئەوبــەر ئەســتەمە."[٢٧١] کۆچــکردنی خــاتوو (سەعدیە)ی دایکی لەتیف هەڵمەت، ئەو چرکەساتە بوو کە کوڕەکەی گەیاندە سەر ئەو ڕووبارە بێ پرد و قەیاغە. جا لەدەقــە شــیعرەکانیدا هەســت دەکــەیت، کــە ئــەو بێدایکییــە دەســتی پێڕادەگات و دەیەوەێ بیگەێنێتە ئەو بەری ڕووبارەکە، تەنها سێبوورییە.

پلە و ئاست و جۆری سێبووری پەیوەستە بە شێوازی پەروەردەکردن و بوونی بــاوەڕ و فەلســەفەی کەسەکە لە ژیان و تێڕوانینی بۆ بەردەوامبوونی ژیان و بوون. بۆ نموونــە باوەڕدارێــك بــە قــەزاو

---

[٢٧١] http://solaceinabook.com/site/٢٠١٣/٠٨/slice-of-solace-thomas-g-fiffer/

قەدەری خودا، پتر سێبوورە و خۆڕاگرە بەبەراورد بەو کەسەی کە لە پەراوێزی ژیاندا ڕۆژگار بەسەر دەبات.

لەشیتەڵکاری شیعرەکانی لەتیف هەڵمەت، بۆنوبەرامەی ئەو سێبووری و ورەبەرزییە لە دوو شتدا دەخوێنینەوە: **یەك:** سێبووریدەری ئەو بە پلەی یەکەم شیعرەکانیەتی. **دوو:** لەساباتی دایکە کۆچکردووەکەیدا، هەست بە بوونی سێبووری و ئارامی دەکات. بۆیە بەئاشکرا لە ساتەوەختی دلپڕیی و نائومێدی و ڕەشبینیدا، زوو بە (شیعرەکان و بە دایکییەوە) سێبووری خۆی دەداتەوە.

شاعیر بەرجەستەی وتەکەی (تۆماس جی. فیفەر)ی کردووە بە بێ ئەوەی خۆی پێبزانێ. لە ساتەوەختێکدا خۆی لەکەناری ئەو ڕووبارە دەبینێتەوە و ئەو شتەی دەستی بۆ دەبات و دەیکاتە فریادڕەسی خۆی لەو گێژاوە بە تەوژم و بە خوڕەدا، وشەی (دایك)ە، بەو ئومێدەی بیپەڕێنێتەوە کەناری ئارامی. واتە وشەکە سێبوورییەکی دەروونی و ڕۆحی پێدەبەخشێ. لە بەراوردکاریی دەقە شیعرەکە و وتەکە، ئەمە دەخوێنینەوە: شاعیر دەڵێ:

***ئەم وشەیە***
***کام دایکەیە***
***کە ڕێی سۆراخی ڕۆڵەی ون***
***هێناوێتی بۆ باڵەخانەی گیانی من...!*** [٢٧٢]

[٢٧٢]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٥٠٩

| | | |
|---|---|---|
| ڕێی سۆراغ | ← | ڕووبارەکەی سەر ڕێگای ژیان |
| باڵەخانە | ← | ئەو بەری کەناری ڕووبارەکە، ئارامگەی ڕۆح |
| دایکەکە | ← | ئەو شتەیە کە بۆ پەرینەوەکە دەستی پێوەدەگری |
| گیانی من | ← | ژیانی من |
| ئەم وشەیە | ← | هەموو وتەکەی ( تۆماس جی. فیفەر ) |

شاعیر لە قەسیدەی *(دڵم هۆنراوەی لێ دەبارێ)*، دەڵێ:

***من گوێ نادەمێ لەم شـارە تەسکەدا***

***ئەگەر زوو بڕۆمەوە و***

***ئەگەر دڕەنگ بڕۆمەوە...***

***دەربەسـت نیم...***

***گەر لە پەنای تاریکی شـەقامێکدا***

***بخەوم....***

***یا لە ژووری ئوتێلێکدا....***

***من هەر تەنیام***

***نە دایکم هەیە دڵی لام بێ و***

***نە دەزگیرانیشم هەیە***

***لە چاوەڕوانی مندا***

***دڵی ژەنگ بگرێ...***

***دڵم وەکو دەستی هەژارە لادێیی یەکان***

***قڵیشاوە و***

***لە باتی ژان هۆنراوەی لێ دەبارێ...*** [٢٧٣]

---

[٢٧٣]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ١٥٧

لەبەراوردی ئەدەبی چەندان جۆر کاریگەری هەیە، یەك لەو جۆرانە کاریگەری (خودی)یــە، کاریگەری خودی ئەوەیە، شاعیر پێشتر شیعرێکی نووسیوە، بەڵام دوای مــاوەك شــیعرێکی تــر دەنووسێ، خوێنەر هەست دەکا، شیعرە نوێیەکە لەئاوی کانیاوی شــیعرە کۆنەکــە دەخواتــەوە، پێشتر ئەودەقەمان خستە ڕوو کەشاعیر حەزناکات لەسەربازی بێتەوە و بــە ئیجــازە بگەڕێتــەوە ماڵ، چونکە ئەو نەدەسگیرانی هەیە نەیار. ئەم دەقەشیان هەر سەربەو هەوارەیە، بەڵام بەڕەنگ و ڕووێکی دیکە دەخرێتە ڕوو. دەتوانین بڵێین سەدا سەد ئەوەی پێشوو نییــە، چــونکە هەرچــەند پێکدەچن، بەڵام هەریەك لەشیعرەکان بۆن و بەرامە و تام و چێژی خۆی هەیە.

لە ساتەوەختێکی یەکجار دژوار و سەختدا، کە دەروونی دەقنووس هێندە پڕ و غەمگینە، کە پەیامگر تووشی سەرسوڕمان دەکات و چەندان پرسیاری بە مێشك دادێ: بۆ شارەکەی دەقنووس وا تەسك و تەنگ و تاریك بووە؟ بۆ هێندە خۆی بەبێکەسی دەبینی، خۆ زۆرن ئەوانەی بێ دایك و بێ دەزگیرانن؟ بۆچی دڵی وا قەڵش قەڵش بووە؟ جا دوای ســەفەرێك بــەناو (*شــاری تەســك و بێدەربەستی و پەنای شەقام و ژووری ئوتێــل و تــەنیایی و بێــدایکی و بێــدەزگیرانی*)، دەبیــنین شاعیر زوو بەئاگادێتەوە و ڕێنادات چیتر ئەو تەنیاییە و ئەو بێکەسییە هەرەسی پێبێنێ و دڵــی دابمرکێنتەوە، بۆیە سێبووری خۆی بە شیعرەکانی دەداتەوە و دڵی خۆی دەشوبهێنێ بە قڵشی نێو پەلی جوتیار و پاڵە و ڕەنجدەران، جیاوازییەکەی ئەوەیە دەستی ئەوان ژان و ئازاری لێ دەبارێ و دڵی شاعیریش ڕێژنەی هــونراوە. پرســیارەکە ئەوەیــە، ئەگــەر شــیعر ســێبووری بــە دڵــی ئــەو نەبەخشی بووایا، شاعیر چی دەکرد؟ بەردەوام دەبــوو لــەو خۆخواردنــەوە و دڵتەنگییــە؟ خــۆی دەکوشت؟ خەم دەیکوشت؟ زۆر پرسیاری تریش. بڕوانن لەم دەقەشدا دایك و دەزگیران حــزووری گەرمیان هەیە گەرچی وەك (نادیار)یش ئاماژەیان پێدراوە.

***ئەو منداڵەی کە ئێوارە دایکی مرد***

***بە پارچە قەڵەمێکی بچووك***

***لە دەفتەری وێنەکێشانەکەیدا***

***وێنەی ژنێکی دروستکرد***

***خۆی هەڵدایە باوەشی و خەوت***
***کە دیوار و شوورای شەو کەوت***
***وێنەکە لە خەو هەستا زوو***
***خێرا بۆ مووبەقەکە چوو***
***قاوەڵتی بەیانی سازکرد***
***بۆ منداڵێك کە دایکی مردو نەمرد...*** [٢٧٤]

کاری هونەری سەرەڕای حەز و ئارەزوو بەتاڵکردنەوەشە لەگرژی و ئاڵۆزییەکان، پەیوەندییەکی بەتین لە نێوان هونەری نیگارکێشان و شیعر هەیە، شاعیر بە وشە وێنە دەکیشێ، نیگارکێشیش لەرێی زمانی بۆیە و ڕەنگ، سیدی لویس لەپێناسەی وێنەی شیعریدا دەڵێ: "وێنەی شیعری لە سادەترین مانایدا وێنە کێشانە بە وشە."[٢٧٥] کەواتە، ئەشێ هەر منداڵە خودی شاعیر بێ بەخەیاڵ یان بەشیعر وێنەی دایکی کێشابێ، یان شاعیر منداڵی تری بێدایکی هاتبێتە بەرچاو. لە گوتەی (خێرا بۆ مووبەقەکە چوو، قاوەڵتی بەیانی سازکرد - بۆ منداڵێك کە دایکی مردو نەمرد). لە گوتەی بۆمنداڵێك کە دایکی مردو نەمرد، چەند لێکدانەوەیەك هەڵدەگرێ. یەکەم: دایکی مرد، واتا دان بەوە دادەنێ کە دایکی منداڵەکە مرد. دوو: نەمرد، واتا ئەو دایکە مردووە، بەڵام ئەوەتا لە خەیاڵ و خەون و وێنەکانی ئەو منداڵە وجودی هەیە و قسەی لەگەڵ دەکاو خواردنی دەداتێ. سێ: منداڵە وێنە کێشەکە خودی شاعیرە، کە بە شیعر وێنەی دەکێشێ، کەمردووە، لەهەمان کات دا زیندووە، ئەوەتا لەدوتوێی شیعرەکانیدایە، لەخەیاڵی دایە، لەماڵەکەیدا وجوودی هەیە.

دەقنووس دەڵێ:

---

[٢٧٤]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ١٣٤٦

[٢٧٥]) سی ـ دی ـ لویس، ت ـ د. أحمد نصیف الجنابي مالك میري ـ سلمان حسن ابراهیم، الصورة الشعریة، دارالرشید النشر، بغداد، ١٩٨٢ ص ٢١.

*ئەی دایە گیان.. من دوات دەکەوم*

*وەك ئەو سەگانەی*

*دوای بۆنی نانی گەرم و*

*گۆشت...*

*دەکەون...*

*وەك چۆن شیعر...*

*دوای دڵم...*

*دەکەوێ...*

*وەك چۆن سیخورەکان*

*دوای شاعیر دەکەون...*[٢٧٦]

لەم دەقەدا، شاعیر (دایك) دەکاتە (**نانی گەرم و گۆشت و دڵ و شاعیر**)، خۆشی دەکاتە (**سەگ و شیعر و سیخۆر**) هونەرکایی دەقەکە لەوەدایە، کە دەقنووس دەیەوێ هەرچی ڕێگا و وەسیلە هەیە بیگرێتەبەر و بەکاربێنێ، هیچ بەلایەوە گرنگ نییە کە ئەو وەسیلانە پەسند و شیاو گونجاون بۆ کەسێتی ئەو یان نا. گرنگ ئەوەیە ببێتە سێبەری ئەو (دایکە) و لەسایەی ساباتی سێبووری ئەودا بحەسێتە و هێوربێتەوە و سەرخەوێکی خۆش بشکێنێ. دەقەکەشی ناوناوە (*ئەی دایە گیان*)، کە پتر شێوەی زمانی منداڵی پێوە دیارە.

پووختەی تەوەرە:

چونکە دەقنووس کەسێکە سەرەڕای ئەوەی هەمیشە دڵپڕ و خەونبین و نیگەران و ڕاڕایە، بەدوای ترووسکەی گزنگێك و چرۆی باغێك و شنەی دارستانێك و نمەی بارانێکدا وێڵە، کە

---

[٢٧٦]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل١٢٧ (ئەم دەقە دووبارە بۆتەوە، چونکە لەم ڕەهەندەشەوە خوێندنەوە هەڵدەگرێ.)

ئایندەی ئاسوودە بکات و چرای ژیانی هەمیشە بدرەوشێنێتەوە و ڕووناکی ببەخشێ، لە سایەی شیعرەکان و لە سایەی دایك دا سێبووری خۆی دەداتەوە و بەردەوام دەبێ لە هەنگاو نان بەرە و داهاتوو. ئەو داهاتووەی نغرۆیە لە (نادیاریی و مەجهولی). لێرەشدا دایك مەقامێکی بەرچاو و کاریگەری هەیە لە بەخشینی ئەو سێبوورییە.

## ( ١١ )

# دایـك و سروشت و شـیعر

پەیوەندی نێوان شیعر و سروشت گەردوونییە. سروشت یەکێك لـەو کایانـەی کـە بووەتـە موگناتیسێك شاعیر و ئەدیبان بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت. بەچاوخشانێك بـە نەخشـەی شـیعری کوردی، دەبینین ڕەنگدانەوەی سروشت یەکجار تۆخ و بەرچاوە لـە دەقەکانیـدا. شـاعیری کـورد شاعیری سروشتە، ڕەنگ بێ ئەو (٤) هۆکارە دروستکەری ئەو حاڵەتە تایبەتمەندە بن:

- جوانی و دڵگیری دیمەنەکانی سروشتی کوردستان بێنەزیر و کەم هاوتان، تا ئـەو ڕادەیـە، جوانییەکەیان بە جوانی بەهەشت تەشبیهکردووە.
- شاعیری کورد نەك لەو سروشتە نزیکە، بەڵکو لەباوەشی ئەو سروشتەدا دەژی. ڕەنگ بێ سروشتی خوداوەندی بۆ شاعیرێك کە لە شاری بەغدا یان قاهیرە، یان دوبـەی دەژی، هـەر لـە وێنـە و تەلەڤزیۆنـدا وجـوودی هـەبێ، تەنانـەت مانگەشەوەکانیشـیان بـە تیشـکی گلۆپـە تریسکەدارەکانیان خامۆش و ڕووبەتەمە.
- پەیوەندییەکی تۆکمە لـەنێوان خـەیاڵ و سروشـت دا هەیـە، ئـەو سروشـتە دڵڕفێنانـەی کوردستان خەیاڵ بەسەر داروبەردیشدا دەبارێنن. خەیاڵیش کلیکی دەرگای شیعرە.
- سروشتی کوردستان لە هەر ڕۆژ و مانگ و وەرزێکدا بە ڕەنگێك خۆی دەنوێنێ، ئەمەیش زۆرترین ڕەنگ و کەرەستە دەخاتە بەر دەستی شاعیری نیگارکێش. بۆ

نموونه شاعیرێکی ئینگلیز هەر زستان و پاییزی هەیە، بەهارەکەی چەند حەفتەیەکە و هاوێنیش نابینێ، ئەمە بۆ شاعیرێکی کەنداوی عەرەبیشی دروستە کە وەرزی هاوێن داگیرکەری ڕۆژەکانی ساڵە لەوێ.[277]

ڕەنگدانەوەی سروشت لە شیعرەکانی لەتیف هەڵمەتدا شکانەوەی تیشك و شەپۆلی ڕەنگەکانی سروشتە لە قەسیدە (بەهارییەکەی حاجی قادری کۆیی) و دواتریش شیعرەکانی (گۆران)، بەڵام بە زمان و بونیات و بیرۆکە و مەراز و پەیامی جیاوازتر. دەکرێ کورترین پێناسەی کۆبەرهەمی شیعری لەتیف هەڵمەت لەیەك ڕستەدا دابڕێژن و بڵێن: (شیعری لەتیف هەڵمەت ڕەنگکردنەوەی سروشتە بە بۆیەیی خوێن و ئارەقە و فرمێسکی ستەمدیدەکان، بە فڵچەکانی ژانی مرۆڤایەتی، لەسەر کەنڤەسی ((Canvas ویژدانی مێژوو.) (سروشت لە جیهانبینی شیعری لەتیف هەڵمەتدا) بابەتێکە کتێبێك هەڵدەگرێ. لەبەر چڕ و پڕیی بابەتەکە و پەیوەستبوونمان بە ڕێڕەوی لێکۆڵینەوەکە، لێرەدا شیتەڵکارییەکەمان هەر لە بازنەی (دایك و سروشت و شیعر) خەستدەکەینەوە. بۆ ئاسانکاری کارەکەمان، دەقەشیعرەکان بەسەر (٣) هۆبەدا پۆلین دەکەین بەوناونیشانانە: *ڕەنگکرنەوەی دیمەنەکانی سروشت بە وشە. ئاوێتەکردنی سروشت و بە پەیامەکانی شاعیر. بەخشینی ڕۆحی مرۆڤ و مرۆڤایەتی بە سروشت (بەمرۆڤکردنی سروشت).*

---

[277]) هونەرمەندی نیگارکێش محەمد عارف دەڵێ: کاتێك بەرانبەر دیمەنی چیاکانی دەوری ڕەواندز دادەنیشم، دەبینم لە هەر چەند سەعاتێکدا ڕەنگ و سیبەرەکان دەگۆڕێن و شێوەیەکی جیاوازی ئەو دیمەنانە نیشان دەدەن. لە گزنگی بەیانییەوە تا خۆرئاوابوون، شاخەکان و گردوڵکەکان بەچەندان دیمەن خۆیان دەنوێنن. (سەرچاوە: دیداری تەلەڤزیونی. ساڵی ١٩٩٠)

- <u>ڕەنگکرنەوەی دیمەنەکانی سروشت بە وشە:</u>

شـاعیری ئەمــەریکی (ڕاڵـف والّـدۆ ئیمرســەن (Ralph waldo Emerson) (١٨٠٣ – ١٨٨٢) دەڵێ:" سروشت هەمیشە ڕەنگی ڕۆح وەردەگرێت و دەپۆشێ." [٢٧٨]

ئەم گوتەیە ڕێك لـە دەقەشـیعرەکانی لـەتیف هەڵمەتـدا ڕەنگیداوەتـەوە. ڕەنگـی ئـەو هەورەی ئەو دەیبینێ، هەمان ئەو ڕەنگە نییە کە تۆ دەیبینێ. بۆ؟ چونکە ئەو بەچـاوی ڕۆح تەماشــادەکات و دەبــینێ. ئــەوە جگــە لــەو تــەکنیك و وەســتاکارییە شــیعرییەی لــە تەوزیفکردنەکەدا بەکاری دێنێ. تێڕوانینی شـاعیران بۆدیاردەکـانی سروشـت جیـاوازە ئـەوتا بەختیار عەلی دەڵێت: " سروشت لای گۆران خودی سروشتە لەوپەری سـاتەکانی سەرسـامی و مەستیا بەجوانی خۆی، بەڵام سروشتی شێرکۆیی سروشتێکی تـرە سروشـتێکی خەسـڵەتەکانی مرۆڤ تێکەڵاو ماناکانی بووە و ئامانجی دیکـە بەوێنــە ئاڵۆزەکـانی سـپێردراوە. بەئینسـانی کردنی سروشت یان مرۆڤاندنی سروشت، ئەگەر ئەم ناونانە بشێت، پانتاییەکی زۆر گەورەی لە شیعری شێرکۆدا داگیر کردووە."[٢٧٩]. جا ئەگەر تێڕوانینەکە لەنێوان ئەم دوو شـاعیرە فـراوانتر بکەینەوە، ئەوا تێڕوانینی لەتیف هەڵمەت بۆ سروشت ڕەهەندەکانی ئیجگار زۆرن، یەکێك لەو ڕەهەندانە مەسەلەی دایك و سروشتە. لەم دەقەی خوارەوە (دایك)، سەر زەوی بەجێهێشتووە و دەبێتە هەور. کام هەور؟ ئەو هەورەی هەمیشە وەك شاعیر لـە ڕێـی گۆڕسـتانانە و سـەردانی گلکۆی ئازیزانی دەکات. بڕوانە چۆن سروشتی ڕەنگ کردۆتەوە، ئەو دەڵێ:

---

[٢٧٨] https://www.brainyquote.com/quotes/topics/topic_nature.html)

[٢٧٩] ) شێرزاد حەسەن وکۆمەڵێ نووسەری تر، تیرۆژەکان و شیعری شێرکۆ بێکەس، بڕوانە نووسینەکەی بەختیار عەلی، نەرسیی و کوژراو تراژیدیای کەرنەڤاڵی، پەیوەندی بەمێژووەوە لە شیعری شێرکۆ بێکەس دا، چاپخانەی داناز، سلێمانی، ١٩٩٩، ل ٤٦.

***(هەندێ پرسیار)***

***ئای دەشێ***

***ئەو هەورە ڕەش ڕەشە***

***هەور نەبێ***

***دایکێکی کلۆڵی***

***بێ زەردەخەنە بێ***

***کش و مات ڕێ بە ڕێ***

***بۆ تەرمی کوڕەکەی بگرێ...!*** [280]

لەم شیعرەدا وێنەکە ئـاوەژوو کراوەتـەوە، هـەور: مانـای بـەرزی، ڕۆح، نادیـاری دایـك دەگەیێنێ. خۆی دایکی شاعیر مردووە، بەڵام ئەو وادادەنێ، کە شاعیر بەدوایدا دەگەڕێ. هـەر پەیوەندی بەخاکەوە هەیە، کە لەڕێی رایەڵەکانی باران کون و کەلەبەرەکانی خاك دەدۆزێتـەوە. بۆیە زۆرجار لە دەقی ئەدەبی گوتراوە: (چاوی هەور). یان (هەوری گەڕیـدە)، ئـەم ڕەهەندانـە لەبوندیادێکی وێنەی شیعرییەوە هەڵێنجراون.

ئەوەتا شاعیربە دڵپڕی و توڕەییەوە دەڵێ:

***نازانم بۆنی دووکەڵی دێیەکی سووتاوە دێ***

***یا دڵی دایکی شەهیدێك***

***ئێوارە شەڕ گەرم بوو***

***ئەمە بەفرە کرێوە دەکا یا ... کفن!***

***ئەی سەگەلی شەو بێدەنگ بن***

***ئیتر وارۆژە و نۆرەی دڵی منە بوەرێ***

***ئەی بارانی خەم من چەترم نیە***

***بەڵام هەرگیز ئەو چەترەم لەبیرناچێتەوە***

---

[280]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٦٧٦

***کەمن و کچێك ناوی ـ جوان ـ بوو***
***لەنیوەرۆیەکی سلێمانیدا...*** [281]

(*شەوێکی تووڕەیە ـ پارچە تەمێکی ڕەشی لەخۆی ئالاندوە*)، دەقنووس تەماشای کۆمەڵێك دیمەنەکانی سروشتی کوردستان دەکات، بەڵام ڕەنگی هیچیان وەك ڕەنگە سروشتییەکەی خۆیان باس ناکا، هەر بۆ نموونە، دەزانین بەفر سپییە، بەڵام لە زانستی ڕەنگدا کە نزیکەی (٣١) ملیۆن جۆرە ڕەنگ هەیە، ڕەنگی سپی بە سەدان شێوە خۆی دەنوێنێ، دەقنووس سپییەتی کفنی بە بەفرەکە بەخشیوە. بۆ؟ چونکە ئەو بە چاوی ڕۆح دەبینێ، ڕۆحێك نغرۆکراوە لە کەش و و هەوای وڵاتێك ڕەشداگەڕاو بە دوکەڵ و خوێن و شەڕ و وەڕین و خەم و...تاد، کە وایانکردووە ڕەنگەکانیش بشێوێن و بگۆڕێن. لێرەدا جگە لە هەستەوەری بینین، هەستەوەری بۆنکردن و کۆئەندامی ئاخاوتنیشی هێناوەتە نێو دەقەکە. وەك لە ناونیشانەکە دیارە، تۆڕەبییەکەی شەو، شاعیریشی بە جۆرێك تورەکردوە، کە ئەم شیعر گوتنەی خۆی بە (وەڕین) شوبهاندووە ـ لەکاتێکدا ئەو گوزارشتە کەم لە شیعرەکانی ئەودا بەرچاو دەکەون.

دەبینین دایك، دایکێکی کوڕ شەهیدکراوە و بوکرووز لە دڵی دێ.

لێرەشدا دایك بە بوونەورێکی چەوساوە و موعەزەب نیشاندەدا. ئەو دەڵێ:

***من نازانم***
***دەشێ ئەم ئەستێرانە***
***چرای ماڵی خدری زیندەبن***
***کێ دەڵێ چاوی بێداری ئەو دایکانە نین***
***کە کوڕەکانیان***
***بۆ جەنگی تەروادە چوون***
***هەروەها دەشێ***
***مانگ... مانگ نەبێ***

---

[281] دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٧٣٥

***زەردێنەی هێلکەی***
***باڵندەیەکی ئەفسانەیی بێ...*** [282]

تۆ گەر لەشەوێکی هاوێندا سەرهەڵبڕی، هەر مانگ و ئەستێرەکان دەبینی، جا ئەگەر منداڵ ئاسا، بە خەیاڵ لەناویاندا پیاسەد دەکردبێ، لەخۆت پرسیووە: ئەرێ! ئەوانە چین؟ سەیرە دەقنووس، کە هەمان پرسیاری تۆی کردووە، چ لێکدانەوەیەکی بۆ ئەسڵ و فەسڵ و ڕەچەڵەکی وان کردووە. لەم دەقەشدا (٣) وشە پتر سەرنجمان ڕادەکێشێ: (١) **خدریزیندە:** ئەمە نیشانەیە، کە شاعیر هەمیشە خێرخواز و مرۆڤدۆستە. خۆ ئەگەر بە دڵێ ئەو بێ ئەوا ئەو هەموو ملیار ئەستێریە و خدری زیندە دەستی مرۆڤەکانی سەرزەوی دەگرن و دەبنە ڕێبەریان. ئاماژەشە بۆ کەلتووری کوردی .(٢) **چاوی دایك:** لێرەشدا (جەنگی تروادە)، ئاماژەیە بۆ هەموو شەڕە گەورەکان، کە لەخت و خۆڕایی خەڵکێکی زۆریان کردۆتە قوربانی .(٣) **باڵندەی ئەفسووناوی:** پانتای جیهانی خەیاڵی دەقنووس نیشاندەدا. بڕوانە شاعیر لە ئاسمانەوە سروشت بەرەو زەوی ڕادەکێشێ و شاعیرانە ڕاڤەیان بۆ دەکا.

شاعیر دەڵێ:

***دایك و باوکی***
***بەجێیان***
***هێشتووە***
***هەمیشە لە سەر ئەو کەژ و لووتکانە***
***ڕادەکات و***
***جگەرە لە دوای جگەرە پێدەکات***
***هەور.*** [283]

---

[282]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٩٩٢

[283]) شیعری دژەشیعر یا یارییەکی کۆن و نوێ، لەتیف هەڵمەت، ل ٣٣

له ڕەنگەکانی ئەم دەقە، تابلۆیەکی پاییزی سەرنجڕاکێشی ئاسمان دەبینین، له نێوان ڕەنگی وشەکاندا، دەروونناسانە، ناخی دەقنووس ورد ورد دەخوێنینەوەی، جا هەر وشەیەکی ڕەنگرێژکراوی ئەم تابلۆ دەق ئامێزە، بۆ لەتیف هەڵمەتناسەکان، گوزارشتی زۆر هەڵدەگرێ، بۆیە گوناحە لێرەدا وشەکان وەك وشە سەیر بکرێن و بخوێندرێنەوە. لەم قسەیەدا مەبەستمان ئەو خوێنەرە کەم ڕۆشنبیرەیە، کە سەرپێیی کتێبان دەخوێنێتەوە. ئاخر لێرەدا وشەکان وشەی ئاسایی نین:

دایك و باوك: دایکە سەعدییەی سووتاو باوکە قەلەندەرەکەی شاعیر.

بەجێهێشتوە: جێهێشتنی هەرزەکارێکی (بەتەمەن) لە دونیای غەریبی و سەرگەردانی و محنەتدا.

کەژ و لوتکە: ئەو شاخ و داخانەی شاعیر بە تافی لاوی بۆیان بووە پێشمەرگە و ئێستاش بە تفەنگی قەڵەم پاسەوانیانە.

*ڕاکردن:* لە شەڕ و خوێن و نەهاماتی و زوڵم و چەوسانەوە و داپلۆساندن. ڕاکردن بەرەو نادیار لە نادیارەوە.

*هەور:* جگەرە خۆرێکی ئاڵودەی دوکەڵاوی سەر شین و ڕەش و ئاچووغ.

بەکوردی و کرمانجی، هەورەکە لەتیف هەڵمەتە و ئاسمانەکە جیهانەکەیەتی و سەرزەوی زیندانە خەمرێژکراوەکەیەتی.

- <u>ئاوێتەکردنی سروشت و بە پەیامەکانی شاعیر.</u>

شیعری ڕەسەن هەڵگری پەیامی مەزنە، زاراوەی پەیام نابێ هەر لە بازنەی گوتاری (بەها و ئایین و فەلسەفە) قەتیس بکرێنەوە. بەخشینی زەردەخەنەیەك، فەرەحنایەتییەك، کردنەوەی گرێگوێرەیەکی دڵ، خەون و خەیاڵێك، تاسە و مرازێك...تاد. هەموویان پەیامن، لێ بە ڕەنگ و

دەنگی جیاواز. چونکە شاعیر بۆ گەیاندنی پەیامەکانی پێویستی بە کەرەستەیە، زۆر جار کەرەستەکان لە سروشتەوە دەخوازێتەوە.

شاعیر دەبێژێ:

***(سوورەتی عەشق و تەنیایی)***

***شەپۆل زۆر زۆر بێ ئەمەکە***

***لە دێوەرەی ئاسوودەیی***

***کەناردا لە دایك دەبێ***

***کە کۆچ دەکات‌و دەڕوات***

***ببڕای ببڕ سەر لە دایکە***

***میهرەبانەکەی خۆی نادات.*** [284]

چاوی شاعیر دەبێتە چاوی یەمامەی یەمەنی و زۆر دوور دەبینێ. دەگاتە کەنار دەریا پان و پۆڕەکانی ئەو سەری جیهان. لەویدا شەپۆڵەکان سەرنجی ڕادەکێشن و دەقەشیعرێکی پێدەبەخشن. لە دەقەکەدا (٣) پنت جێگەی تێڕامانە: (ا) فراوان و قوڵی خەیاڵی شاعیر، کە لە کوردستانەوە دەستی دەگرێ و دەیباتە ئەو سەری دونیا و لە کەنار دەریایەك بەجێی دەهێڵێ .(ب) بەراوردکردنی دڵی وەفای خۆی بە بێوەفایی شەپۆڵەکان. ئەمەیش نیشانیدەدات، کە ئەو دەقنووسە لەو پەڕی دنیاشدا ناتوانی دەستبەرداری وەفای پاك و بێگەردی دایکی بێ .(ج) ناونیشانی دەقەشیعرەکە (سوورەتی عەشق و تەنیایی)یە، کە هەر یەك لەو سێ وشە لێکدانەوەی زۆر هەڵدەگرێ: سوورەت، پەیوەستە بە قورئان، لێرەدا پیرۆزیی دێتە ئاراوە. عەشق، هەوێنی شیعری ئەوە، لێرەدا سۆز دێتە ئاراوە، تەنیایی دەربڕی نامۆیی شاعیرە، ئەمەیش بارە دەروونییەکەی ئەو نمایش دەکات. لەبیرمان نەچێ لێرەدا (٢) دایك دەبینین، دایکی شەپۆلەکان کە دەریایە و دایکی شاعیر کە خاتوو سەعدییە ـ گەرچی دەقنووس ئاماژەی بە ناویشی نەکردووە. پەیامی دەقنووس ئەوەیە کە: بێوەفایی دەرحەق بە دایك ئەستەمە. لەتیف هەڵمەت

---

[284]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ١٣٣٤

ئەوەندە لەبابەتی دایك وردبووەتەوە كە پێی وایــە هەمووشــتێك دایكــی هەیــە، بەتایبــەتی لــە دیاردەكانی سروشتدا، بۆیە دایكی بۆ شەپۆل خەلق كردووە، وەك چــۆن هەســت بــە پەیــدابوونی شەپۆل دەكەین دواتر لەناو دەچێت، پەیدابوون، واتا لەدایك بوون، لە ناوچــوونی شــەپۆل، واتــای مردن دەگەیێنیٚ. شاعیر دەڵیٚ:

*(تارماییەكان ئەتوێنەوە)*
*درێژایی خۆێی تەمەنی شەوگار*
*گوریسێكە لە گەردنمایە*
*چاوی براكانم*
*پەرژینی رێگا ون بووەكانە*
*ئەڵێن جانەوەرێكی برسی*
*یاریەكانیانی دزیوە*
*دایە تەمی بێشكەكان بشۆرە*
*با كۆرپەكان نەخلیسكێنە*
*خۆڵەمێشی بەهارەوە*
*ئەی بەفری گومەزە بیٚ سێبەرەكان*
*تاكەی فرمێسكی چاوی شارەكەمی*
*تاكەی بەری دارەكانمان تاڵ ئەكەی*
*گیانە لەناو بۆگەنی تەرمەكانا بۆت ئەگەڕێم*
*دەستت بۆ درێژ ئەكەم*
*ئەگەر باوەڕ ناكەی*
*وا تفەنگەكەم گۆرانیت بۆ ئەڵیٚ.* [285]

---

[285]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٤٩

"بۆ من ئەو شیعرانەی بۆ بەفر بارین وتوومە ئەو جوانییەی لەبەفربارینە بینیومە لەبەهارە نەمبینیوە، ڕەنگە لەپاییزیشە هەستم بەم خەمە زۆرە نەکردبێ، کە شاعیران خەمی پێدەخۆن، ڕەنگە زۆر جار پاییزم لەبەهار بەلاوە جوانتر بێ، پاییزم بەئامادەکارییەك داناوە بۆ نوێبوونەوەیەکی تر، کە گەڵاکان دەوەرێن و دارەکان ڕووت ئەبنەوە خۆیان ئامادە دەکەن بۆ ئەوەی جارێکی تر لەدایك ببنەوە، ڕەنگە زۆرجار من بڵێم ئەرکی جوانی پاییز لەهەموو وەرزەکان بەهێزترە، چونکە هەمیشە لەئامادەکارییدایە، کە سروشت جوانتربکا." [٢٨٦]

- <u>بەخشینی ڕۆحی مرۆڤ و مرۆڤایەتی بە سروشت .(بەمرۆڤکردنی سروشت).</u>

مرۆڤاندنی ( بەمرڤکردنی ) شتەکان و سروشتیش وەك یەکێك لەو شتانە، لە دێرینەوە تەکنیکێکی هونەری باو بووە، بەزمان هێنانی بێ زمانەکان لە ئەدەبدا بە زاراوەی (Anthropomorphist) ئاماژەی پێدەکرێت. لەتیف هەڵمەتیش، لە ڕووبەرێکی زۆر پان و فراوان بە چەندین ڕەهەند و ئارستەی جیاواز، مامەڵەی لەگەڵ ئەو هونەرە ئەدەبییەیی کردوە. لاسایی نەکردنە و جوینەوە و وێنەکێشانەوەی دیمەنە هونەرییەکانی کەسانی دیکە، تا ڕادەیەکی بەرچاو تابۆیە لە مانفێستی شیعر نووسینی ئەودا. سەدان شاعیر بارانیان کردۆتە فرمێسك و شەوگاریان کردۆتە عەبای ڕەش و ڕووباریان کردۆتە سوارچاك، لێ کاتێك لەتیف هەڵمەت هەمان وشەی *(فرمێسك و عەبا و سوارچاك)* وێنەدەکات، لە هەموو ڕووەکانەوە جیاوازە.

لەم دەقەی خوارەوە، هەوری گرینۆك کراوەتە دز و بۆ ڕێژنەکانی، دەچێ فرمێسکی چاوی دایکی شەهیدان دەدزێ. لێرەشدا لێشاوی بەردەوامی فرمێسکی چاوی دایکی شەهیدان بەرز و شکۆدار ئاماژەی پێدراوە. ئەوەتا دەڵێ:

---

[٢٨٦]) دیدەنی: هاوژین سلێوە لەگەڵ لەتیف هەڵمەت، ١٩/ ٣ / ٢٠١٢

***بۆ کێ دەگری...***
***ئەم هەمو زەنگۆڵە فرمێسکە***
***لە دایکی چ شەهیدێك***
***دەدزێ... هەور؟*** [٢٨٧]

زۆر لەشاعیران سەرەتاتکێکی مانگیان لە نێوان پەڵە هەورەکاندا، لـە دەقەشـیعرییەکاندا تـەوزیفکردووە. شـاعیر لێـرە شـەو و مـانگ و هـەور و ئەسـتێرەی کردۆتـە کارەکتـەری شانۆنامەیەکی یەك پەردەیی. شـانۆگەرییەك ئاوێتەیەکـە لـە تراژیـدیا و کۆمێـدیا. خوێنـەر دەتوانی ببێتە تەماشاچی ئەو شانۆگەرییە، کە دەقنووس بەم شێوەیە دایڕشتووەتەوە:

***ئەو دەڵێ: شەو***
***ئەو کراسە***
***ڕەشەی***
***لەدایکی بووکێك دزیوە..!***
***هەورو مانگ لەتوێی تاریکیدا***
***یەکدی ڕاودەنێن***
***ئەستێرەکان***
***بەدزییەوە***
***پێیان پێدەکەنن***
***ئەمە کۆمیدیایە یا تراژیدیا.*** [٢٨٨]

لەدەقێکی دیکەدا دەڵێ:

---

[٢٨٧]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ١٣٦٩

[٢٨٨]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٧٠٣

***(دایك)***

***لە کلاو ڕۆژنەی ماڵێکەوە... منداڵێك***

***هاواری کرد... دایە... دایە***

***(سەرنج بدەن... ئەها دایکم***

***لە ناو ئەو هەورەدایە)***

***هەور بازی داو ڕانەوەستا***

***لەسەر شووشەی تەڵخی کلاوڕۆژنەکەدا***

***چەند فرمێسکێك جێما بۆ ـ با ـ***

***من نازانم فرمێسکی منداڵەکەبوو***

***یاخود شوێن پێی ئەو هەورەی کە بە هایوهوو***

***بە شمشێری درێژەوە***

***بۆ ئەو دیوی چیاکە چوو...*** [٢٨٩]

مردنی دایك، بزربوونی دایك گەڕان و ماندووبوونی دەوێ، تادەدۆزرێتەوە، شاعیر بەهەموو شێوەیەك لەناو کەون و سروشتدا بەدوای دایکی دادەگەڕێ، منداڵەکە خودی شاعیرە، کە تەنانەت لەکلاو ڕۆژنەیەکیشەوە ئەو پارچە هەورێك ببینێ وا دەزانێ دایکییەتی. بەسەر شووشەی کلاوڕۆژنەکە چەند دلۆپێك ئاو بەجێ ما. شاعیر ئەوە دەخاتە ڕوو دەڵێ نازانم فرمێسکی منداڵەکە بوو، یان هی هەورەکە. بۆچی دایك لەدەست ڕۆڵەکەی رادەکات، کە ئەو ڕۆڵەکەی خۆی خۆش دەوێ؟ ئەمە ئەو پرسیارەیە کە هەمیشە لای شاعیر دووبارە دەبێتەوە. چونکە لەناو هەموو شتەکانی سروشت دایکی دەبینێ. بەڵام ئەم بینینە تەواو سوکنایی نایێ. بەڵکو دەیەوێ لەشتەکانی تریش ئەو هەر بیبینێ.

شاعیر دەڵێ:

---

[٢٨٩]) سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣٢٦

***به شەو زرێبار***

***ئەستێرەکان بانگ دەکات***

***دیرۆکی ڕاوچی و تۆڕیان***

***بۆ دەگێڕێتەوە***

***به شەو زرێبار***

***باسی ئەو عاشقانە دەکات***

***بۆ مانگ***

***کە لەبەر بێجێگایی***

***لە بن زرێباردا***

***بە ئاسوودەیی باوشی خۆیان***

***بۆ یەکدی دەکەن بە ماڵ***

***زرێبار ڕۆندەکی ئەو دایکانەیە***

***کە کوڕەکانیان***

***قەرتاڵەکانی ونگە***

***پڕ دەکەن لە لم***

***زرێبار ڕۆندك نییە***

***دوورایی***

***نێوانی***

***من و***

***نیشتمانە...*** [٢٩٠]

لەم دەقەشیعرە، لەسەر زاری دەریاچەی زرێبارەوە، ژیاننامە و بیرەوەرییەکانی ئەو دەریاچەیە و وڵاتێك دەبیستین. شاعیر هەموو بستە زەوی و دڵۆپە ئاوێکی ئەم کوردستانەی بە

---

[٢٩٠]) دژەشیعر، لەتیف هەڵمەت، ل ٥٠

جەستە و خوێنی خۆی داناوە، سنوورەکان سڕاونەتەوە و خەمەکان بەیەکسانی بەشراونەتەوە و دایکەکان ئەگەر حەشاماتێکیش بن هەر دایکە ئەمەکدارەکەی شاعیرە، کەلێرەشدا دایك و ڕۆندك ئاوێتەی یەکتریکراون و لە قالبی شیعرێکی (نەریتیڤی Narrative)دا سەفەرێکی خۆشمان پێدەکات.

پووختەی تەوەرە:

- لە ڕەنگکردنەوەی سروشتدا، کە خەسڵەتێکی دیاری دەقنووسە، دایك ڕەنگەکانی خەمی پۆشیوە و خەمخۆرانە، وەك دایکی شەهید و مەزلوومەکان، هاتۆتە نێو دەقەکانەوە.
- لە پەیامەکانی سەرزاری سروشت، دایك لێرەشدا پەیامبەرە جوان و میهرەبان و مرۆڤدۆست و خۆشمەشرەبەکەیە، کە پێشتر ناسیوومانە. تارمایی دایکی شاعیریش هەمیشە حزووری هەیە لە نێو دەقەکاندا.
- لە بەمرۆڤکردنی سروشت، ئەوجارەی دار و بەرد و هەور و ڕووبار و ئەستێرە و مانگ...تاد. کراونەتە دایك. بەمەش پانتایی جوگرافیای دایك بە ئاسۆیی و بە ئەستوونی ئەو هەسارەیە داگیر دەکات. دایك هەیە جەستە و ڕۆحی لە ئێمەمانان ناچێ، چونکە بەشێکە لە جەستە و ڕۆحی مانگ و خۆر و ڕووبار...تاد.

## ( ١٢ )

## دایــکە مەزڵــوومەکان

قولەڕەشی ئازادیخوازی ئەمەریکی (مارتن لۆسەر کینگMarin Luther King ١٩٢٩ ـ ١٩٦٨) دەڵــێ: "تفتووتــاڵترین ســاتەوەختی تراژیــدیای زوڵــم و زۆرداری، لــە وەحشــییەت و قەساوەتی زاڵمەکاندا نییە، بەڵکو لە بێدەنگی پیاوە باشەکان دایە." [٢٩١]

ئەگەر کورد بە درێژایی مێژوو چەوسێندرابێتەوە و زوڵملێکرا بوو بێ، ئەوا ژنــانی کــورد چەوسانەوەکەیان چەندبارە بووە. هۆکارەکان باری ئابووری و کۆمەڵایەتی و ئایینی و کــەلتووری و ڕەشنبیری دەگرێتەوە، بەڵام لە نیوەی دووەمی سەدەی ڕابردووەوە ـ کە لــەتیف هەڵمــەت بــۆ خۆی شایەتحاڵی بووە ـ بۆ ژنانی کورد، لە شار و لادێ، زۆر سەختتر و کارەساتبارتر بوو، جگــە لە زوڵمی پیاوسالاری و نادەدپەروەری کۆمەڵایەتی و ئــەو هــەموو بارگرانییــەی ئــیش وکــار و خێزان بەڕێوەبردن و پەروەردەکردنی منداڵ، باری شۆڕش و خەباتی چەکداریشی کەوتە سەرشان، لە خزمەتکردن و زیندانی کردن و دەربەدەری و ئاوارەیی و بێ پیاویی و سەرپەرشتکردنی کۆزی منداڵی ساوا و نان پەیداکردن و بوون بە قوربانی شاڵاو و شەڕ و ئاڵۆزی و پێکدادانەکان. زۆریان شەهیدکران و بوونە کەمئەندام و دەربەدەری شار و وڵاتان... تاد. کەواتە ناکرێ بۆ شــاعیرێکی ناسنامەوەتەنپەروەر، چاو لەو زووڵم و چەوسانەوەی دایکەکان و خۆشکەکانی بپۆشێ. هەرچەندە

---

[٢٩١]) Martin Luther King، Jr by Kathie Billingslea Smith، Author: James Seward، Published by Little Simon، New York، ١٩٨٧، P.١٢٣

ئەم ناونیشانە ئاوێکی زۆر دەکێشێ، هەوڵدەدەین لە بازنەی دایك و دایکە چەوساوەکان، دەقەشیعرەکان بخەینە سەردەزگای ڕەخنە و ڕەخنەکاری ئەدەبی.

لە فەرهەنگی (Thesaurus) وا پێناسەی چەوسانەوە کراوە: "بارکردنی کەسێك بە کۆڵێکی زۆر قورس لە کار و بەرپرسیارەتی و کێشە و گرفت بە زۆری زۆرداری، بەبێ لەبەرچاوگرتنی بەهاکانی کەسی چەوساوە. هەروەها پوونگاندنەوەی کەش و هەوایەکی ناخۆش، بۆ نیگەرانکردنی کەسانی دیکە و ئازاردانی دەروون و ڕۆح و نائومێدکردنیان."[٢٩٢]

دەقنووس لە دەقی (سێدارە)دا دەڵێ:

***ئەگەر بڵێم: شارەکەمم خۆشدەوێ...***

***دەمدەن لە دار...***

***ئەگەر بڵێم: یارەکەمم خۆشدەوێ***

***دەمدەن لە دار...***

***هەموو ڕۆژێ فیرعەونی شار***

***هەزاران جار***

***دەمدا لە دار***

***قەدەغەیە خۆشەویستی...***

***قەدەغەیە خەندەو پرسیار...***

***بەیەك بڕیار...***

***لێك دەترازێن هەزارەها ماسی و ڕووبار***

***بەیەك بڕیار***

***لێك دەترازێن...***

---

[٢٩٢] http://www.thesaurus.com/browse/oppressed?s=t

*هەزارەها کەو و نزار*

*هەموو ڕۆژێك فیرعەونی شار*

*زگی دایکە خەمبارەکان هەڵدەدڕێ...*

*بۆ پێغەمبەرێك دەگەڕێ...*

*بیدا لە دار*

*کە خۆری تر دێنێ بۆ شار...* [293]

لەم دەقەشیعرەدا، هەست بە ئـازار و ژان و مـەعاناتی دایکـە مەزلۆمـەکان دەکـەین. دەقنووس هەموو دایکەکان بە دایکـی خـۆی دادەنـێ و وەك دایکـی خـۆی بۆیـان بەپەرۆشـە. فراوانکردنی بازنەی دایك، لە خودەوە بۆ پانتای کۆمەڵگا و بگرە کۆی مرۆڤایەتی، مەقامێکی بەرز بە شاعیر دەدات بەوەی کە چاوەکانی ئەو مەزلۆم و چەوساوانە دەبینێ. لەتیف هەڵمەت بە زاری خۆی دەڵێ: بەڕەئی من، چۆن ئەڵێن دۆزینەوەی زاتەکان لەزاتی خۆتـەوە دەسـت پێـدەکا، خۆشەویستیی خەڵکی تریش لەخۆتەوە دەست پێدەکا، خۆتت خۆش دەوێ، کەواتە خەڵکی ترت خۆش دەوێ، ڕقت لەخۆتە، تۆ کە ئامادە بووی خۆت بکوژی ئامادەی هەموو خەڵکێك بکوژی، بەڵام کە تۆ ئامادەبووی خۆت خۆش بوێ خۆت عـەزیەت نـەدەی جگەرەیـەك نـەنێی بەدەسـتی خۆتەوە، یانی هەست بەئازار دەکەی ئامادەنی جگەرەیەك لە دڵی هیچ کەسێك نزیك کەیتـەوە، ئەگەر دووژمنیشت بێت بەزەیت پێدا دێتەوە، خۆتت خۆش دەوێ خـەڵکت خـۆش دەوێ، ڕقـت لەخۆتە ڕقت لەخەڵکە." [294] جا لـەم دەقەشـیعرەدا دوو دیدگـەی جـوان کـە دژ بـە لۆژیـك و بەهایـەکانن، خراونەتـە ڕوو: یـەك: خۆشەویسـتی لـەو وڵاتـەدا تابۆیـە تـا ڕادەی کوشـتن و لەسێدارەدان، کە نەدەبوایە وابێ. دوو: دایکەکانیان وا لاواز و بێدەسەڵات کراون، ناتوانن خۆیان

---

[293]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ١٧٨

[294]) دیدەنی هاوژین سڵێوە لەگەڵ لەتیف هەڵمەت، ١٩ / ٣ / ٢٠١٢

خۆیان ڕزگاربکەن و چاوەڕوانی (*پێغەمبەرێك*)ن. ئەمەیش قورسایی زوڵم و چەوسانەوەی سەر شانی ئەوان نیشان دەدات، ئەمەشیان هەر نەدەبوایە وابێ. پەڕادوکسەکەیان لەوە دایە، کە خۆشەویستی دەبێ خەڵات بکرێ و چەوساوە دەبێ تۆقی کۆیلایەتی بشکێنێ.

بڕوانن چۆن دایکەکان بوون بە ڕووبارێك لە دۆڵێکدا کە ئاوی هەموو کانی و کانیاوەکانی هەردوو لای دەڕژێتە ناو و ئەویش بەسینگ فراوانییەوە باوەشیان بۆ دەکاتەوە. سەرنجی ئەو هێڵکارییەی خوارەوە بدەن:




هێڵکاریی خەمی دایکە مەزلومەکان

شاعیر لەشیعرێکی دیکەدا دەڵێ:

***(لاوانەوەی یەکەم خۆر)***

***١ . سەرین***

***ئەی دایە گیان!***

***لە دوای هەموو ڕووداوەکان***

***خەمی کۆن و قورسمان بەشکرد***

***لە زێی دەریا کوژراوەکان***

*زامی برسیی و ترسمان بەشکرد*

*لە کۆتری بن ڕەشماڵی چەوساوەکان...*

*پرچی خاتووزینیشمان کرد*

*بە سەرین بۆ:*

*پاڵەوانە خەساوەکان.* [295]

شاعیر سێ جار هانا بۆ دایکی دەبات، سێ جار بەگوتەی (ئەی دایە گیان) دێتەگۆ. شتەکان بۆ دایکی دەگێڕێتەوە، وەڵام دایك دیارنییە، دایك تەنها گوێگرە. شاعیر بەحەسرەتەوە پەیامەکانی خۆی دەخاتە ڕوو، لە دوای ڕووداوەکان خەمی (کۆن و قورس) یان بەش کردووە، بەشێوازی بەتەن کردن ئەم وێنەنانەیان نمایشکراون. لە گوتەی (دەریای کوژراو) بەشێوازی بە بوونەوەرکردن خراوەتە ڕوو. سیفاتی بوونەوەر بەدەریا بەخشراوە. لە گوتەی (زامی برسی و ترسمان بەشکرد)، دوو وێنەی شیعری ئاوێتەی یەك دەربڕینی شیعری کراوە، کە بەشێوازی بەکەس کردن و بەتەن کردن بەرجەستەکراوە. دواتریش بە وێنەیەکی وەسفی شیعرەکە خراوەتە ڕوو. لە کردنی پرچ بەسەرین و لەبری خوری یان لۆکە بەکار بهێنرێت. دەبینین هێشوە وێنەیەکی شیعری ئاوێتەی یەك کردووە و بیرۆکەکانی دەربڕیوە. پەیامەکانیش ئاراستەی دایکی دەکات. ئایا هەموو چاوەکان بە فیعلی بەئاگان و بینەر و بوێرن، کە جورئەت بێنن ڕاستییەکان نیگارکێش بکەن؟ خۆ لەسەردەمی شەڕی براکوژی (١٩٩٤ ـ ١٩٩٧)، لە کوردستانی باشووردا، دەیان و سەدان شاعیری دیکە شایەتحاڵی ئەو کارەساتە جەرگبڕە پشتشکێنە بوون، بەڵام چاوەکانین وەك ئەم دەقنووسە بینەرێکی جەسوور نەبوو. لێرەدا مەزلوومییەتی دایکەکەن دۆسییەیەکی گەورە و ڕەشە. ئەوانە هەموو خەمن، ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ، بەرۆکی دایکەکان دەگرن، چونکە ئەوان وەك کۆڵەگەی خێزانن هەموو قورسایی دارەڕێیەکان دەکەونە سەر شانی ئەوان: (خەمی ئەوەی هیچیان نییە لە پێشوازی ساڵی نوێدا شاباشی بکەن، خومی فرمێسك و خەونەکان، خەمی ئەو دایکە ڕەشپۆشەی دەگری، خەمی کوڕە تاقانە کوژراوەکە، خەمی ئەم

[295]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٢٢٤

لاوه كه ئێستا به دارشەق دەڕوات، خەمی سوالكەرەكانی بەر دەرگای مزگەوت، خەمی ئەوانەی بابۆڵەی نانی وشك قوت دەدەن، ئەو خەمە مەزنەی بەڕێوەیە، خەمی منداڵانی كوردستان، خەمی كوردستانی دوو ملیۆن شەهید، خەمی مافی مرۆڤ، خەمی كچۆڵەكانی شەڕی براكوژی، خەمی زەمانی بێ نوقڵ و گۆرانی و هەڵپەڕكێ، خەمی كۆچی باڵداری سەر شەقامەكان، خەمی كوردستانی مەرگستان) هەموو ئەو قوربانییانە دایكێكیان هەیە، خۆ دومبەڵان نین بە هەورە تریشقە هەڵتۆقابن. كەواتە خەمەكانیان بۆ دایكەكانە. لە قەسیدەیەكی ئەرشیفیدا، دەقنووس رۆژگارێك دەنووسێتەوە و زۆریش بەپەرۆشەوە دەردەدڵی خۆی دەردەبڕێ و دەڵێ:

***(نامەیەكی دانەخراو لە پێشوازیساڵی نوێ د)***

***ئەوا خۆرێكی نوێ لەسەر***
***ترۆپكی گڵەزەردە هێلانە بۆ خۆی سازدەكا***
***بەخێر بێی ئەی ساڵی نوێ***
***هیچمان نییە لە پێشوازیتدا شاباشی بكەین***
***جگە لە فرمێسك و خەون***
***ئەوەتا ئەو دایكە ڕەشپۆشە***
***لەبەر دەمتدا دەگری...***
***ئەو دایكە ڕەشپۆشە بۆ دەگری؟***
***بۆ كوڕە تاقانەكەی دەگری***
***كە لە شەڕی براكوژی دا***
***خڵتانی خوێن بوو...***
***لابكەرەوە***
***كورتەو درێژەی كارەساتەكانی ساڵی ڕابردوو***
***لەناو چاوی ئەم كوڕە لاوەدا بخوێنەرەوە...***

ئەم لاوە کە ئێستا بە دارشەق دەڕوات
پێرار کوڕێکی قۆزبوو
ڕیشی جوان دەتاشی و
گوڵاوی لە خۆی دەپڕژاند و
دەچوو بۆ ژووانی دەیدەمەستان...
پار شەڕی شوومی ناوخۆ
لەسەرە ڕێگەیەکدا قاچێکی لێ دزی و
دارشەقێکی خستە بن دەستی...
بەخێر بێی ئەی ساڵی نوێ
سەرنجێکی بەر مزگەوتی گەورە بدە
ئەوانە هاووڵاتی ئەم کوردستانەن
ئەوانەن کە ڕاپەڕینیان بەرپاکرد
سواڵ دەکەن و
بابۆڵەی نانی وشك قوت دەدەن و
خەمێکی مەزن بەڕوویانەوە دیارە
سەرنج بدە... ئەوانە منداڵی کوردستانن
کوردستانی دوو ملوێن شەهید...
عەلاگەو گوڵەبەڕۆژە و جگەرە و
پاقلە و کونجی و لوقمەقازی و
میراتی یەکانی باوك و باپیرانیان دەفرۆشن و
بە تێلاو کێبڵ راودەنرێن...
ئەرێ بشێ ئەمە لە پاداشتی ئەوەدابێ
کە لە ڕاپەڕینی دووەمدا ئەم منداڵانە
دەبابەکانی دکتاتۆریان یەخسیر کرد.

کۆمەڵەی فریاکەوتنی منداڵان
لە کوێ پیاسە دەکات!
مافی مرۆڤ
لە چ چاپخانەیەکدا
سەرگەرمی تاوڵە و دۆمینەیە...؟
بەخێرهاتی ئەی ساڵی نوێ
سەرنجێکی ئەو کچۆڵە خەمبارانە بدە
ئەوانە کچگەلی شەهیدانی
شەڕی براکوژین
هیچ مژدەیەکی خۆشت
بۆیان هانیوە؟
ئەمە زەماوەنی لە دایکبوونی ساڵێکی تازەیە
ئای چ زەماوەندێکی ساردو سڕە
زەماوەندێکی بێ نوقڵ و
بێ گۆرانی و بێ هەڵپەرکێ یە...
کوا کچە نەورەسیدەکان
بۆ سەرچۆپی ناگرن و
هەڵهەڵە لێنادەن...؟
سەرچۆپی چی و هەڵهەڵەی چی
براکانیان لە شەڕی ناوخۆدا سەرنگونن
ئەی سۆزانی یە جادوو بازەکە
ئەی درم و پەتای براکوژی
تۆ لە کوێوە هاتی و
ئەم هەموو رق و کینەو گۆرستانەت

***دروست كرد...؟***

***بەخێر بێی ئەی ساڵی نوێ***

***چی لە چارۆگە ڕەنگاوڕەنگەكە تدایە***

***گوڵە نێرگزی برایەتی و***

***گوڵەگەنم و... ئاشتی***

***یا تەرمو خوێنو ماڵوێرانی؟***

***ئەی ساڵی نوێ***

***تۆ وەكو ساڵی رابردوو مەبە***

***ساڵی ڕابردوو دڵڕەق بوو...***

***كۆچی بە باڵداری سەر شەقامەكان كرد و***

***كۆتری خەندە و ئاشتی***

***بەر شەستیردا... و***

***كوردستانی كرد بە مەرگستان...؟*** [٢٩٦]

شاعیر لە وەسف كردنی ساڵی نوێ، كە هەموو ساڵەكانی میللەتی كورد هەرنەهامەتی و خەمن، بەڵام تەمەنا دەكات لە ساڵی تازەدا خەم و مەینەتییەكان دووبارە نەبنەوە، شەری نەگریسی براكوژی نەبینینەوە، لەم شیعرەدا زۆر بەوردی رۆچۆتە نیو نەهامەتی و خەمی میللەتێك هەر لەباسكردن دایك و خوشك و برا و منداڵ. دواتر قێزەون كردنی شەڕی نەگریسی ناوخۆ.

شاعیر لە دەقێكی دیكەدا دەڵێ:

***ئەی سەرەتای داری هەتاو***

***لە شكۆفەی ناسۆرەوە***

---

[٢٩٦]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ١٢٠٧ ـ ١٢٠٩

تاریکایی وەك قومێك ئاو

بە مەڵاشوو بخۆرەوە

تیخەکانمان بشۆرەوە

بوروژێنە ڕووناکی

ئەو ڕێیە بدۆزەرەوە

کە قووتی دا ناپاکی

ئەو ڕەنگە بدۆزەرەوە

چەند کرمێکی ئاگرین

خستیانە هەوری شۆرەوە

دایان پۆشی بە برین

بەتارمایی لەپی گڵاو

ئەی سەرەتای داری هەتاو

ئەوە هەڵبەستێك بوو

لە تابلۆیەکی شکاوا

پاڵەوانێکی ماندوو نووسی بووی:

دایە بۆچی چاوی خانووەکان مرد؟

بۆ دووکەڵی زنجە سووەتاوەکان؟

بوو بەمەمکی دەمی کۆرپەکان؟

دایە کێ مۆمەکانی کوژانەوە؟

کێ چراکانی پڕکرد لە ئاو؟

کێ میناکانی بە ڕۆنی قالۆنچە سواغ دا؟

کێ پردەکانی ڕووخان؟

دایە کێ ئەتوانێ چەرمی بۆقەکان بکات

بەتەپڵی منالی لێوارەکان؟

*کێ ئەتوانێ تارماییە خەڵووزەکان بسوتێنێ؟*

*ئەی گورگە چاو ئاوساوەکانی دەوری ساجەکەم*

*تاکەی تێر ناخۆن؟*

*دایە بەچی نووکی ڕمەکە تیژ کەم.؟*

*ئەڵێن کلیلی دەرگای ڕۆژ*

*لەدڵی پاشاکەتانا شاراوەتەوە..*

*ئەی گورگە چاو ئاوساوەکانی دەوری ساجەکەم؟* [٢٩٧]

شاعیر ئەم شیعرە لە کۆمەڵێ وێنەی خودی خستۆتە ڕوو، وەك منداڵێك رووی دەمی لە دایکە، وەك ئەوەی شاعیر منداڵ بێت و راوێژ بەدایکی بکات، بەڵام شیعرەکە بۆ منداڵان نییە. وێنە نوێکانیش ئەمانەن: (*ئەی سەرەتای داری هەتاو، تاریکایی وەك قومێك ئاوبە مەلاشوو بخۆرەوە، بوروژێنە ڕووناکی، چەند کرمێکی ئاگرین، ئەی سەرەتای داری هەتاو، دایە بۆچی چاوی خانووەکان مرد؟، بۆ دووکەڵی زنجە سووەتاوەکان؟ بوو بەمەمکی دەمی کۆرپەکان؟، کێ میناکانی بە ڕۆنی قالۆنچە سواغ دا؟،کێ پردەکانی ڕووخان؟ دایە کێ ئەتوانێ چەرمی بۆقەکان بکات بەتەپڵی مناڵی لێوارەکان؟...*) وێنەی لقی خۆرەتاو داری خۆرەتاو، پێشتریش لای شاعیر خراوەتە روو، بەڵام وێنەکانی تر نوێن و لە هەندێ وێنەیاندا ئاراستەی سوریالیزم وەردەگرن.لە گوتەی: (دایە بۆچی چاوی خانووەکەمان مرد)، لێرەدا چاوی خانوو چاوی دایکیەتی کەمردووە. هەموو پرسیارەکان ئاراستەی دایکی دەکات، دایکە مەزلوم و قەلەندەرەکە، کە نوێنەری گشت دایکانە.

پووختەی تەوەرە:

لە دەقەشیعرەکاندا ئەوە دەخوێنینەوە، ئەگەر خاتوو (سەعدییە)، (لەتیف هەڵمەت)ی کوڕی بە بەشێك لە جەرگ و ڕۆحی خۆی بزانێت ئەوا لەتیف هەڵمەت خاتوو (سەعدییە) بە

---

[٢٩٧]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٥٩ ـ ٦٠

ڕەمزی دایکە مەزلوومەکان دەزانێ و لە درێژکردنەوی مەودای ڕۆحی ئەوەوە مەزلومیەتی هەموو دایکەکان دەکات بە بەشێك لە خەم و لە شیعری خۆی. لە زۆربەی شیعرەکاندا پرسیارەکان ئاراستەی دایك دەکرێن، کەچی دایك وەڵام ناداتەوە و پرسیارەکان بەکراوەیی دەمێننەوە، کە ئەمەیش دوو ئاماژەی شاراوەیان لە نێو دێڕەکانیاندا حەشارداوە: شاعیر هەم ویژدانی خوێنەر دەکاتە حەکەم و هەم دەیەوێ بڵێ (هەمووان) ئاگاداری ئەو زوڵمانەن و بێ دەنگیان زوڵمە.

## ( ١٣ )

## دایـك له پەراوێزی تـەنـزەشـیعردا

" تەنز كە لە وشەی (طنز)ی عەرەبی خواستراوەتەوە، لـە فەرهەنگـدا بـە مانـای تانـە و تەشەرە و بە یەكێك لە شێوازەكانی دەربڕینی مەبەست دەگوترێ، كە وێژەر بە زمانێكی شیرین و بزاوی، بەمەبەستی چاكسازی، لەپەردەدا بابەتێك دەخاتە بەر ڕەخنە|." [298] شیعر ڕەگەزێكی سەرەكی هونەرە و كۆمەڵێ بازنەی بەدەوری خۆیدا كێشاوە و دەچێتەوە نێو زۆربـەی بوارەكـانی هونەر، شیعر ڕەگ و ڕیشەی بە قوڵاییدا ڕۆچووە و خۆراك لە هونەرەكانی دیكەش وەردەگرێت و گەشەی پێدەكا، زۆربەی بوارەكانی ژیان خۆیان دەخزێننە نێو شیعر، لەوانە: مێژوو، فەلسـەفە، ئایین،... هتد، تەنزیش جگە لە هونەری نواندن و بواری نوسینی رۆژنامەوانی لەنێو شـیعریش دا وجودی هەیە[299]

ئەگەر لە ئەدەبی كۆندا، مێژووی تەنز بۆ سـەردەمی (هـۆرێس Horace ٦٥ ــ ٢٧ پ. ز.)،بگەڕێنینەوە، ئەوا لە ئەدەبی كوردیـدا، ناوئاخنـە فۆلكلۆرییـەكانی زۆر ڕشـتە و بابـەتی میللی و كۆمەڵایەتی، گەنجینەی دەوڵەمەندی تەنزی كوردین. كە بە شێوە پلار و تانە و تەشەر و تەوس و تیز پێكردن نیشانەی خۆیان پێكاوە ـ بـۆ نموونـە تـەنزەكانی (ڕشـتەی مـرواری)ی مامۆستا (عەلائەددینی سجادی).

---

[298]) ڕۆژنامەی كوردستان، ژمارە ٧٠٨، ٦/ ٩/ ٢٠١٧

[299]) هاوژین سلێوە، كاریكاتێر لەشیعری كوردیدا، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١٦، ل ٩

له ئەدەبی هاوچەرخدا، بازنەی تەنز زۆر فراوان بووە، بە زارەکی و نووسراو و وێنە و نیگار لە شێوەی گاڵتە و قەشمەری و دەمەلاسکە و پلار و لاسایکردنەوەی گاڵتەجاری و تیزپێکردن و کاریکاتێر و (سناپچات Snapchat)...تاد بەرجەستە دەکرێت. کایەکانیشی بواری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئایینی و سێکسی...تاد. دەگرێتەوە، کە بەم (٤) شێوازە گوزارشتیان لیوەدەکرێت: تەنزی زارەکی (Verbal Satire)، تەنزی نمایشی (Dramatic Sarire)، تەنزی بارودۆخی (Situational Satir) هەروەها تەنزی سۆکراتی (Socratic Satire).[300]

حەمە سەعید حەسەن دەڵێت: "ساتیر کاریکاتێرە بە وشە باس لە بەدڕەوتاری تاك دەكا و ڕوونـاکی دەخاتـە سـەر پێوەندییـە نـەگونجاوەکان." [301]، گەرچـی کەسـێتی لـەتیف هەڵمـەت تێکەڵەیەکە لە هێمنی و کەمدوویی و جددییەت و کارایی و خۆشمەشرەبی مرۆڤێك کە پتر خۆی دورەپەرێز دەگرێت لـە گاڵتـەجاری و پلارهاویشـتن و تەریقکردنـەوی کەسـانی دیکـە، لـێ لـە شیعرنووسیندا، تەنزنووسێکی باڵادەست و دەستڕاست و نیشانەشـکێنە. بـە دەیـان تەنزەشـیعر، باڵای کۆمەڵەشیعرەکەی ئەویان تەنیوەتەوە. لەتیف هەڵمەتناس، دەتوانێ بـە ئاسـانی سـنووری تەنزەکانی ئەو دەستنیشان بکات، بەوەی کە شیعرەکانی پێش (ڕاپەڕین)، بەدەگمـەن تـەنزاوین، بەڵام ئەوانەی دوای (ڕاپەڕین) سیخناخن بە تەنزی ئاگرین. بۆچی؟ واپێدەچێ، ئـەو شـاعیرە لـە دڵسۆزیی بۆ خەبات و خەباتگێرانی کورد، نەیویستووە تانەوتەشەریان لێبـدا و دڵـی دوژمنـانی کورد خۆش بکات بە نیشاندانی کەموکوڕییەکانی ئەوان چ لە شار و چ لـە شـاخدا. بـەڵام دوای ڕاپەڕین، هەم ناداپەروەری کۆمەڵایەتی و کەموکوڕییەکانی دەسەڵاتی فرمـانرەوایی کوردسـتانی باشوور زۆر زەق و بێسنوور بوون و شاعیریش وەك ڕەنجدەرێکی بەرەی جـەماوەر کەوتـە گلـەیی کردن و ڕەخنە و توانجگرتن.

---

[300] https://quizlet.com/٤٧٠٩٣٢٤/different-types-of-satire-flash-cards/ ridi

[301] حەمە سەعید حەسەن، کاریکاتێر بە وشە، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١١، ل ٩

له سۆنگەی (دایك)ەوە ـ کە جەوهەری بابەتەکەمانە، شاعیر بە دوو تەکنیکی شیعری تەنزەکانی دارشتۆوەتەوە. لە بەشێکیاندا، دایك بۆتە کەرەستە و پێکهاتە و توخمی تەنزەکە و تەنزبار سووکورسوا دەکات. لە جۆری دوەمیشیدا، دەقنووس هانا بۆ (دایك) دەبات و کارەساتە تەنزاوییەکانی بۆ دەگێڕێتەوە. لە جۆری یەکەم ئەم دەقەشیعرانەتان، وەك نموونە، بۆ شیدەکەینەوە:

*دوێنێ دایکی شەهیدێکم بینی*
*بەپێی پەتی لەبەردەرگای مزگەوتی گەورەدا*
*هاواری دەکرد:*
*کوڕەکەمم بدەنەوە*
*ئەم نیشتمانە نەزۆکە بۆخۆتان*
*پیاوە سمێڵ فەردە خەڵووزەکان*
*ویسکییان قوزەلقورت دەکرد و*
*بەمیزی خۆیان*
*لەبارە خوێناوییە*
*بێ پەنجەرەکاندا*
*وێنەی لاوێکیان دەکێشا و*
*دەیانگوت:*
*وەرە.. پووری وەرە*
*ئەمە کوڕەکەتە بیبەرەوە..!* [٣٠٢]

دەقنووس، بوێرانە حەیای ئەوانە دەبات کە ملهۆرانە بەناوی دەسەڵاتەوە زوڵم و زۆرداری لە هەژاران دەکەن و ڕابردووی جوانی کورد، بۆ بەرژەوەندی و خۆپەرستی و لەخۆگۆرانی خۆیان

---

[٣٠٢]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ١١٠٣

پیس دەکەن. دوو چین دیارییکراون، چینی شەهیدان و ئەنفالکراوە غەدر لێکراوەکان و چینی ملئەستوورەکان، کە میللەت دەدۆشن و دەچەوسێننەوە. کە دیمەنی دایك لەم شانۆگەرییە تەنزاوییەدا دەبینیٚ موچرکت بەلەش دادیٚ، تەنزنووس هێندە کاریگەرانە گوزارشتی لە دۆخەکە کردووە، کە هەست دەکات ئەوانە بەشێکن لە کۆمەڵگای کوردی ئەم سەردەمە. ئەمە تەنزێکی تاڵە، مەسئولێك گاڵتە بە دایکی شەهیدێك دەکات، کە وتمان تەنز، زۆر کەس ڕاستەوخۆ زەردەخەنە و پێکەنینی دیٚ، وەڵیٚ زۆر تەنزمان هەیە هێند تاڵن، نەك زەردەخەنە و شیلەبزە، بەڵکو گریان و فرمێسکی بەگوڕیان دەویٚ. " خەڵکی ساکار پێیان وایە، کۆمیدیا، پەیوەندی بە ئازارەوە نییە، وەلی ساتیر لەو دیو هەر قاقای پێکەنینێکەوە، قوڵپی گریانێك خۆی مات داوە." [٣٠٣]

لە دەقەکەدا، (*پیاوە سمێڵ فەردە خەڵووزەکان*)، دێڕە شیعرێکی (مەلا مارف کۆکەیی) مان دێنێتەوە بیر کە مەلا و شێخە مشەخۆرەکانی پیٚ سووکو ڕسواکردە و دەڵیٚ:

***تا سمێڵ و لێوی مامۆستا بریقەی بیٚ بە ڕۆن***
***شافیعی کۆانیٚ قەبووڵە شاهیدی خۆی و وەکیع*** [٣٠٤]

(ئێمەش دەپرسین: دەبیٚ چ بژاردەیەك لەبەردەم شاعیرێك بیٚ کە دەبینی کۆمەڵگاکەی پەنجە لەسەر پەلاپیتکە لە دوو بەرەدا سەنگەر لێکدەگرن؟ ئەو چاك دەزانیٚ ئەوەی ئەوان ئەنجامی دەدەن خۆکوژییە، نەك شەڕی ئازادی و سەرفیرازی، ناچارە بەم شێوەیە ئەو دەسەڵاتانە دادەشۆرێنیٚ و تیزییان پیٚ دەکات و دەڵیٚ:

***(ئەوە بۆ ژنە سك پڕەکان***

---

[٣٠٣]) هۆراس، و. حمید عزیز، هونەری شیعر، چ٢، چاپخانەی چوارچرا، هەولێر، ٢٠٠٠، ل ٨

[٣٠٤]) هەرمان وەتمانی: دیراسات لە تەنز لە شیعرەکانی مەلا مارف کۆکەیی، ڕۆژنامەی کوردستان، ژمارە ٧٠٨، ٦ / ٩ / ٢٠١٧

*لەکاتی مناڵبووندا*

*ناچن بۆ بەرەکانی شەڕی براکوژی؟)*

*- ئەمە دروشمێك بوو لەسەر دیواری*

*نەخۆشخانەیەکی مناڵبوون نووسرابوو-* [305]

(فلادیمێر نابۆکۆف) دەڵێ: " تەنز دەرسە، گاڵتەجارییە، یارییە." [306] وانیشان دەدرێ، کە شەڕ هەموو لایەکی گرتۆتەوە، هەم و چین و توێژەکان تێـوەگلاون، تەنانـەت ئـەو ژنانـەی کـەوا لـە نەخۆشخانەی مناڵ بوونیشن، پێویستە بچنە شەڕ، لەوکاتەی ژان و ئازاری منداڵ بوونی هەیـە، لەوکاتەی کەوا ئەو ژنە جگە لەترس لەسەلامەتی خۆی و کۆرپەکەی بـیر لەهیچـی ترناکاتـەوە، کەچی ئەو پرسیارەش قوتکراوەتەوە، بۆناچن. ئەی بۆبچن؟ شەڕێکی پیرۆزە؟ لە پێناو چییە؟ خۆ ژنی کورد زۆر بەشداری شەڕی کردووە، ئەوتا بینیمان لە عفرین دەیان ئـافرەتی کـورد سـینگی خۆیان کردە قەڵغانی بەرگری.

لەشیعرێکی دیکەدا ئەو دەڵێ:

*دوو وێنە*

*دوو وێنەی بەرامبەر*

*لە گۆشەی ژوورێکدا*

*دوو وێنە*

*بۆ یەکدی*

*هەر دەدوێن بە کپی*

---

[305] ) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ١١١٦

[306]) http://sekhurma.com/details.aspx?jimare=٣٥٦٢ گۆڤاری سیخورمە

***منالّی دەمو روو بە خەندە***

***پیاوێکی موو سپی***

***دوو وێنە***

***هەردووکیان***

***هەر سەیری یەکتریان دەکرد***

***هەر دوو دەستیان***

***بۆ دەستی یەکتر دەبرد***

***هەر دوو یەکدییان ماچ دەکرد***

***نە دایك و کوڕ بوون***

***نە خوشك و برا***

***نە ژن و مێرد***

***نە چۆلەکە و با***

***نە کێلان و کێرد***

***دوو وێنە دوو وێنە***

***یەکێکیان دەم پڕ لە خەندەیە و***

***دووەمیان بە کپی***

***هەر دەگری...***

***هەر دەگری...*** [٣٠٧]

خەیاڵفراوانی شاعیر وای کردووە، تەنانەت لە وێنە هەڵواسراوەکانی دیواریش سوود وەربگرێ و هەست و سۆز و مەشاعیر بەو وێنانەش ببەخشێ، کە بە دیواردا هەڵواسراون. شاعیر ئەو دوو وێنەیە (نە دایك و کوڕ بوون)، دواتر وتەی تر دەخاتە ڕوو، دوو وێنەکە ژیانی هەموو مرۆڤەکان دەگرێتەوە، کە یەکێکیان دەگری و یەکێکیان پێدەکەنێ، خودی هەرتاکە کەسێك لە

[٣٠٧]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ١٢٧٥ ـ ١٢٧٦

سەردەمێك دڵی خۆشە و پێدەكەنێ لە كاتێكی تر دەگری. ژیان بەسەر گریان و پێكەنین، تاریك و رۆشن، هەوراز و نشێو، شەو و ڕۆژ، خوا و شەیتان... بنیاد نراوە، شاعیر گوتەی دایك و كوڕی خستۆتە پێش گومان و وتەكانی دیكەی.

لەدەقێكی دیكە شاعیری تەنزنووس دەڵێ:

***ئەستەمە!***

***قوتابییەك كۆلیژی بەسەركەوتوویی***

***تەواوكرد***

***باوكی و دایكیو خوشكەكەی و دەزگیرانەكەی***

***دڵیان خۆشە.. ئەو مەسئولەی هاوڕێی خوشكەكەیەتی***

***بەڵێنی داوە بیكات بەپۆلیسی گومرگ...*** [٣٠٨]

ئەمەش تەنز و پلارە، كە لە كوردستاندا، گەنجان دوای تەواوكردنی قۆناغی زانكۆ بێ ئیش دەخولێنەوە زۆر جار هەر واستەدارەكان دادەمەزرێن، جا لەم شیعرەدا پلار و تەنزەكە ئەوەیە كە بەهۆی بەكار هێنانی ئافرەتەوە بۆكاری خراپ هەندێ جار كارەكە ئەنجام دەدرێ. دایك نەكراوەتە كەرەستە و بنەمای بیرۆكەی شیعرەكان، بەڵكو هاوار و هانایەكە بۆ ئەو دەبردرێ، ئەمەیش (٢) ڕاڤە هەڵدەگرێ: لە لایەك شاعیر هێندە یەخسیری خۆشەویستی دایكە و وا كەوتۆتە ژێرباری، لە هەموو چركەساتەكانی ژیانی ئەودا حزووری هەیە، چونكە دایك خەمخۆر و جەرگسۆزە، ئەو كەسەیە لەدڵڕا گوێ بۆ ڕۆڵەكانی شلدەكات و گفتوگۆیان لەگەڵدا دەكات و ڕاو و تەگبیرییان بۆ دەكات.

شاعیر دەڵێ:

***وتم دایە:***

***ڕێی هاتنی ئۆردوی ئائەم شەوە زۆڵە***

---

[٣٠٨] ) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ١٠٤٣

***لە کوێ دایە...؟***

***وتی: ڕۆڵە...***

***ڕێی هاتنی ئۆردوی ئا ئەمشەوە زۆڵە***

***سەنگەرێکی چۆڵ و هۆڵە.*** [309]

*********

***ڕوانیم کوردستان هەر دڕك و داڵە***

***دایە هەنگوینی ناو ئەم شانانە***

***وەك زەقنەبووت و خوێی سووتاو تاڵە*** [310]

*********

***ئەی.. دایە گیان!***

***بمانناسە..***

***ئەمە کورتەی دەنگ و باسە..!***

***بمانناسە..***

***ئەو شمشێرەی..***

***کە دات پێمان.. مەڵێ کوانێ..!***

***لە دەستە مردۆکانماندا***

***ژەنگی گرت و***

***شەوی قاتیی و گرانیی***

***گۆڕیمانەوە بە نانێ***

***ئای ئەگەر ـ بەردەشانیی ـ***

---

(309) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ١٧٢

(310) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٩

*ئا ئەم هەواڵەی دەزانی*

*نەفرینی لە شارێك دەكرد*

*بە شیر ناسێنیێ نانی.* [311]

*****

*- ئەی دایە گیان منیش لاڵ بم هیچ سەیر نییە*

*ئەگەر چڵی داری سووتاو*

*زمان بگرێ و لەگەڵ خۆر و خوادا بدوێ*

*هیچ سەیر نییە لەباتی گوڵ*

*لەم خاكەدا برین بڕوێ...!*

*"ڕۆڵە بنوو لەم شارەدا چی زۆرە. گوێ...!"* [312]

هەریەك لەم كۆپلە شیعرانە دیوێكی ژیان پیشان دەدەن، بەڵام لەناو هەموشیاندا دایك وجـودی هەیە، یان پرسیارەكان ڕوو لەدایكە، بەڵام دەنگی دایك دیار نییە، وەڵامـی نییـە، هەنـدێ لـە وێنەكان كاریكاتێرین یاخود وەك وێنـەی سـوریالیزمی خراونەتـە روو، چـونكە لـە نیوەدیڕێـك شتێك دەڵێ، وای بۆدەچی لە نیوە دێڕەكەی تر شتێكی نزیك لەو بڵێ، كەچـی شـتی چـاوەڕوان نەكراو دەبینی.

پووختەی تەوەرە:

لەتیف هەڵمەت وەك تەنزنووسیش، شارەزایی و وەستایی خۆی نیشانداوە. لـەو دەقانـەی كە دایك بەشێكە لە ناوەرۆكەكەیان، یان ئەوەتا دایك بنـەما و دەربـڕی گوزارشـتێكە ئەمـەش بۆئەوەیە واقیع و كاریگەری دایك بەهێزتر بێ لەسەر پەیامگر. بـەڵام لـە زۆر تەنزەشیعریشـدا،

---

[311]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٢٢٤

[312]) سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٥٧ ـ ٤٥٨

هانا و هاوار وسکاڵایەکان بۆ دایك خوێندراونەتەوە و شاعیر لە لای ئەوان ڕازەکانی دەدرکـێنێ، ئەمەیش نیشانەی زێدە خۆشەویستی و قەدرزانی ئەوە بۆ دایك.

( ١٤ )

## دایـك وەك ڕەمـز و جـەڤـەنـگ

توێژەری ئەدەبی ئەمەریکی (د. مایکـڵ مایـەرس Michael Meyer) لـە زانکـۆی (Connecticut) دەنووسێ:" ڕەمز بریتییە لە کەسێك، شـتێك، وێنەیـەك، وشـەیەك، یـان ڕووداوێك، ڕیزبەندێك مانای دیکە لە ناوخۆیدا دەورووژێنێ، مانایەکانیش پتر دەچـنە خانـەی ئەبستراکت نەك خانەی بەها ئەدەبییەکان. ڕەمز کەرەستەیەکی ئەدەبییە بۆ وروژانـدنی بـیر و بیرۆکەی ئاڵۆز بەبێ ئەوەی هەوڵی ڕاڤەکردنی بکرێتە ئامانج، بەڵکو بۆ ئەوەیـە چـیرۆکێك لـە ئەزموونەوە بکات بە گوتار. ڕەمزە تەقلیدییەکان ئاسانتر لـە ڕێـی کۆمـەڵ یـان کـەلتوورەوە دەناسرێنەوە، وەك خاچەکەی مەسیح و ئەستێرەکەی داود و ئـاڵای وڵاتێـك. هەرچـی ڕەمـزی ئەدەبییە ماناکەی لە ناوەرۆکی دەق و بابەتەکەیدا دەخوازێتەوە و ئەمەش ئاڵۆزتر و زەحمەتترە لەچاو ڕەمزە تەقلیدییەکان."[٣١٣] ڕەمز لە هەموو کون و قـوژبنێکی ژیانمانـدا حـزوری هەیـە، بەڵام لە ڕشتە ئەدەبییەکاندا پتر تیشکی خراوەتە سەر چونکە،" ڕەمز، خـەیاڵ گـورج وگـۆڵتر دەکـات، ئـەویش بـەهۆی ئـەوەوە کـە تایبەتمەندییـە حسـییەکان دەکـات بـە تایبەتمەنـدی ڕاستەقینە."[٣١٤] ڕەمز جێگای بیردەگرێتەوە و جوانی بەدەق دەبەخشێ[٣١٥] د. سـەردار گـەردی

---

[٣١٣] )Michael Meyer، Bedford Introduction to Literatu، Published by، Amazon Warehouse Deals، 2015، 10th edition، P.77

[٣١٤]) ئەحمەد ڕەزا، هونەری شیعر نووسین، چاپخانەی دەزگای ناوەندی ڕاگەیاندن، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل ١١٦

[٣١٥]) د.امینة حمدان، الرمزیة و الرومانتیکیة فی الشعر ألبناني، دار الرشید، بغداد، ١٩٨١، ص٢٤

سەبارەت بە ڕەمز دەڵێ: "ڕەمز بەواتا گشتییەکەی بریتییە لەوەی کە جێگەی شتێکی تر بگرێتەوە لە رووی واتاوە."[٣١٦] شیعر هەمیشە نقمی ڕەمز دەبێ، چونکە رەمز لە ئەنجامی خەیاڵفراوانی شاعیرەوە دێتە وجوود. "هەریەك لە ڕەمزەکانی ئەفسانەیی و ئایینی و مێژوویی و ئەدەبی لە ئەدەبیاتی تازەدا و لە شیعرەکانی لەتیف هەڵمەت دا لەئاستێکی بەرزدایە، ئەمەش بۆ بەهرەمەندی و هەستی راستگۆیانە و شارەزایی و ئەزموونی ئەدەبی شاعیر دەگەڕێتەوە."[٣١٧]

لەتیف هەڵمەت لە مامەڵەکردنیدا لەگەڵ تەکنیکی ڕەمز، بەهرەمەندی خۆی نواندووە.لەشیعری *(چاوی دایکم)*دەڵێ:

***چاوی دایکم هانم دەدات***
***لەسەر هەموو دارە سەوزەکانی وڵات***
***هەڵبەستێکی نوێ هەڵکۆڵم***
***لەسەر لووتکەی چیا بەرزەکانی وڵات***
***وێنەی کچێك جێبهێڵم***
***قامکی خۆر بە باخی ئەگریجەی ناگات!***
***بۆنی قژە سووتاوەکەی دایکمە کە فێرم دەکات***
***تێر تێر ماچ کەم جێ برینی خاك و خۆڵم***
***ئای ئێوە دایکم دەناسن...!***
***هەر وڵاتێ پۆڕی داری کەسکی سووتاو***
***کەوتە ژێر پێلەقەی دوژمن***

---

[٣١٦]) سەردار ئەحمەد گەردی، بنیاتی وێنەی هونەری لە شیعری کوردیدا، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل٤٨٣

[٣١٧]) ڕزگار عومەر فەتاح، بەهای رەمز لە شیعرەکانی لەتیف هەڵمەت دا، گۆڤاری زانکۆی کۆیە، ژ ٣٦ ، ساڵی ٢٠١٥، ل ٨٢

***قوتابخانەی منالآنی وێرانکرا و***

***بوو بە بەندیخانەی ئاسن***

***ئەو ولآتە دایکی منە.. دایکی من..***

***کەستان دایکی من ناناسن!!!***

***دەنگی لە گوێی کەستاندا نازرنگێتەوە؟***

***ئەی شێوەکەی بە خەیاڵی هیچ کامتاندا***

***تێناپەڕێ...!!***

***ئەشێ هەموو خۆڵەمێشی ئەم زەوییە***

***زامی سووتاوی دایکم بێ!!*** [٣١٨]

تێکەڵەیەکی چڕ و خەست و خۆڵ لە بنەما سەرەکییەکانی بونیاتی دەقی ڕەمزئامێز دەخوێنینەوە. ڕەمزەکان تۆڕێکی بەیەکەوە گرێدراون و بۆ گەیاندنی گوتارێکی پیرۆز و مەزن چنراونەتەوە: (*ئەم ولآتە دایکی منە*). لە دەقەکەدا، دەکرێ لە ڕوانگەی پێناسەکەی (د. مایکڵ مایەرس)ەوە ڕاڤە بۆ ئەو وشانە بکەین کەدەقنووس وەك ڕەمز مامەڵەی لەگەڵدا کردوون:

*چاوی دایك*: کانگای خۆشەویستی و چرای ژیان.

*دارە سەوزەکانی ولآت*: سینەی هەموو نەوەیەکی ئەم ولآتە.

*هەڵبەستێکی نوێ*: پەیام و گوتارێکی نوێ.

*لووتکەی چیا بەرزەکان*: بەرزترین خاڵی شکۆمەندی لەسەر ڕووی زەوی.

*وێنەی کچێك*: دروشمی شۆڕشێك.

*بۆنی قژە سووتاوەکەی دایکم*: بۆنی هەرچی قوربانی ئەو ولآتە هەیە.

*ماچ کەم*: فیداکاری بم.

*جێ برینی خاكو خۆڵم*: ژان و ئازاری بەجێماوی قوربانییەکان.

*ئێوە*: کۆی مرۆڤی سەر زەوی.

---

[٣١٨]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٥٢٢ ـ ٥٢٣

*پەڕۆی داری کەسك*: پیرۆزی و شکۆداری.

*کەوتە ژێر پێلەقەی دوژمن*: کەوتە ژێر دەستی زاڵم و دەستدرێژکەر.

*ئەو وڵاتە دایکی منە*: ئەو وڵاتە نیشتیمانی منە.

*دەنگی*: هاواری ژان و ئازاری قوربانییەکان.

*شێوەکەی*: شێوە و ڕەنگ و ڕوخساری قوربانییەکان.

*خۆڵەمێشی ئەم زەوییە*: شەڕگە و گۆڕەپانی کوشتارەکانی سەر زەوی.

*زامی سووتاوی دایکم*: ڕەنج و قوربانی خەباتگێڕان و پێشمەرگەکان.

کاتێك لە یەك کورتە دەقدا، دەقنووس (٧) جاران ئاماژە بە (دایك) دەکات ـ ئەوە جگە لە ڕاناوەکان، دەبێ پەیامگریش خوێندنەوەی بۆ دەق و دەقنووس و (دایك)ەکە هەبێ. شیعرەکان ئاماژەن کە شاعیر لە هەموو شتێکدا لە دەنکە خۆڵێکەوە بگرە تا هەسارەکان، هەست بە بوونی دایکی دەکات. لەو دایکەشەوە زاتی خودی خۆی دەخوێنێتەوە. ئێمەش لەو خود و دایکەوە ڕاڤە و تەفسیر بۆ هەموو ئەلەمێنتەکانی (Elements) بوون و ژیان دەکەین.

دەقنووس دەڵێ:

***ئەی شاعیرەکان ئەزانن خلیل حاوی لە کوێیە؟***

***- کەوتە دوای بۆنی دەنگی شمشاڵێ***

***لەوەتەی کە هەن متوی یەکن وەك دایك و مناڵێ***

***هاوڕێکەم حاوی ڕێگات زۆر دووره***

***تۆش گفتت داوه***

***بە کچی ماڵە تاریکەکانی بەیرووتەکەی خۆت***

***ماڵیان پڕ بکەی لە بزەی خۆرو گوڵاڵە سووره...***

***برۆ خوات لەگەڵ کچانی بەیروت سوێندیان خواردووه***

***بە مەرگی تۆیان***

***کەپرێکی گەورەت بۆ دروست بکەن***

***لە پرچی خۆیان...***

- بەیروت نوستووە و چەقۆی ڕەشەبا پرچی دەبڕن..
بەیرووت نووستوە و سەگی ئاسنین وا پێی دەوەڕن
بەیرووت نوستووە هەتا هەڵدەستێ
کێ دەمی سەگەل لە بەیرووتەکەی دڵم دەبەستێ.!

***

هاوڕێی شاعیرم گەرچی نەمدیوی
کە بەچاو تك تك دەنۆشم بۆنی گوڵی هۆنراوەی
ناو دیوانەکەت
لەگەڵتا بەستەی ئومێد دەچڕم
بۆ دارو بەردو چەم و باڵندەی نیشتمانەکەت
لەگەڵتا دەبم بە چنگێ بارووت
بەرگری دەکەم دژی زایۆنی و ئیمپریالیزم
لە لبنانەکەت...
تۆ نەمردویی و شیعرەکانیشت مەرگیان نییە... نی
هەر وشەیەکی هۆنراوەیەکت
نارنجۆکێکە و دەبێ بە گۆڕی هەزاران هەزار
چەتەی زایۆنی...!
ئەی زایۆنییەکان... دەی بەدەرەوە
تاکو منالی زگی دایکانیش
بۆتان نەهاتوون بە خەنجەرەوە...
دەی بەدەرەوە...
دەی بەدەرەوە...

***دە ئەی بەیرووتی قژ زەردی شاعیر***

***تێش لە زگی شەو وەرە دەرەوە..!*** [٣١٩]

لە دەقە شیعرێك، سیخناخ بە تەکنیکی ڕەمزگەرایی، دەقنووس شاعیری لوبنانی ـ خەلیل حاوی ـ کردۆتە ڕەمزێك بۆ هەموو قەڵەمە شەهیدەکانی دنیا. دەکرێ ئەم چەپکە وەشەیە وەك رەمز گوڵبژێر بکەین و پەیوەندی نێوان دال و مەدلوولەکانیش دەستنیشان بکەین:

*شاعیرەکان*: ڕۆشنبیر و قەڵەم بەدەستەکان.

*خلیل حاوی* [٣٢٠]: قەڵەمە شەهیدکراوەکان.

دە*نگی شمشاڵێ*: ئاماژەیە بۆ کۆمەڵەشیعری (شمشاڵ و با)ی خەلیل حاوی.

*ڕێگات زۆر دوورە*: ڕێگای خەبات و خزمەتکردنی مرۆڤایەتی شاعیر.

*ماڵە تاریکەکانی بەیرووت*: خەم و پەژارە و کارەساتەکانی وڵاتی لوبنان.

*بزەی خۆر و گوڵاڵە سوورە*: ئازادی و سەربەستی و خۆشی.

***چەقۆی ڕەشەبا:*** *هێرشی ئیسرائیل بۆ سەر شاری بەیرووت.*

*سەگی ئاسنین: تانگەکانی جوو.*

*دەمی سەگەل:* سوپای جوو.

*ناو دیوانەکەت*: ئاماژەیە بۆ (دیوانی خەلیل حاوی).

*لەگەڵتا دەبم بە چنگێ باروت: پشتیوان و هاو خەم و خەبات.*

---

[٣١٩]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٥٥٢ ـ ٥٥٣

[٣٢٠]) خەلیل حاوی لە ساڵی (١٩١٩) لە بەیرووت لە خێزانێکی زەحمەتکێش لە دایك بوو، لەتاف لاوییەوە عاشقی شیعر و ئەدەب دەبێ و زوو وەك شاعیرێکی بەهرەدار ناو دەردەکات، دوای بەدەستهێنانی بڕوانامەی دکتۆرا لە بەریتانیا، دەبێتەوە مامۆستا لەو زانکۆیەی کە خۆی لەبەیرووت لێی دەخوێند. کاتێك سوپای ئیسرائیل لە ساڵی (١٩٨٢) هێرشی کردە سەر شاری بەیرووت و داگیری کرد، خەلیل حاوی لە ماڵەکەی خوێدا بە گوللەیەك خۆی کوشت. ئەم (٦) کۆمەڵە شیعرەی بەمیرات بۆ بەجێهێشتین: ڕووباری خۆڵەمێش، شمشاڵ و با، خەرمانی برسییەتی، بروسکەی زامدار، لە دۆزەخی کۆمیدیاوە، دیوانی خەلیل حاوی. (نووسەران)

*شیعرەکانیشت مەرگیان نییە*: نەمری حەلیل حاوی.

*زگی شەو*: ناخۆشیی و ژێردەستی و کویلەتی.

لێرەدا دەقنووس کە زۆر تورەیە، شۆرشگێرانە دەنگ هەڵدەبرێ و پشتیوانی لە ولاتێـك و شاعیرێك دەکات کە نەیدیون، ئەو گوتەکەی (جیڤارای) شاعیرانە تەوزیفکردوە کە دەڵێ: "زوڵم لە هەر کوێ بێ من لەوێم و ئەوێ نیشتیمانی منـە."[٣٢١] لێرەشـدا دایـك کـە بەرهەمهێنـەری شۆرشگێریی و فیداییەکانە، وەك رەمز بەکار هاتووە، کە نەوەی نوێ، خوێنی نوێ پێشکەش بە وەتەن دەکا.

*شاعیر دەڵێ:*

***دایە من ناوم چییە:***

***من خەڵکی کوێم***

***ئەم کەپرە دوکەڵە کوێیە؟***

***مناڵێك ئەوەی وت..***

***وردە ورد بەناو ونبوونی تەما شۆرەوە بوو***

***دیوارە مۆنەکان***

***لە قۆزاغەی کپیا***

***دەنگی زەنگوڵەکانیان کوشت.***[٣٢٢]

رەمزەکان:

من: (کورد... خەڵکی کۆێ: کام ولات؟ کەپرەکە: کوردستان... دیـوارە مۆنـەکان: جـاش و جاسوس و دەسـەلات....دەنگی زەنگوڵـە: دەنگـی ئـازادی). منـداڵێك رووەدەکاتـە دایکـی و کۆمەڵێ پرسیار دەکات. ئەم پرسیارانە سیخناخن بە نامۆیی. کە لە دایکی دەپرسێ: من نـاوم

---

[٣٢١](https:Che_Guevara#Tactics_and_Strategy_of_the_Latin_American_Revolution_(١٩٦٢)

[٣٢٢]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٥٧

چییە؟ من خەڵکی کوێم؟ ئەم دوو پرسیارە مانـا ڕووکەشـەکەی گـەرەك نییـە، بـەڵکو شـاعیر بەدوای ناسنامە دا دەگەڕێ. وەك (هێمن)ی شاعیر، لـە (ناڵـەی جـودایی) دا، کـە لـەو پـەڕی ڕەشبینی و نامۆییدا لە دوا دێڕی شیعری (سازی ناساز)دا دەڵێ:

***چۆن دەتوانم بەتۆ بڵێم من چیم؟!***

***خۆم گومانم هەیە کە هەم یا نیم!*** [٣٢٣]

شاعیریش لەزاری منداڵێکەوە ئەمە دەردەبڕێ، کە پڕە لە دوکەڵ، ئەمە دوکـەڵێکی ئاسـایی نییە، دووکەڵی چێشت لێنان و خۆشی نییە، کەپر، ڕەمـزی حەسـانەوە و پشـوودانە، دووکـەڵ، ڕەمزی سووتان و کاولکارییە. دیواری مۆن، زەنگی بێ دەنگ، هەموو ئەوانە دیووە نـاخۆش و خەماوییەکەی ژیان پیشان دەدەن.

شاعیر لەشیعرێکی دیکەدا دەڵێ:

***ئەوەتا زامی لەبیرچووی شەهیدەکان***

***هەر خوێنی لێ دەتکێ***

***بە پەڕەمووچی بانەڕۆژ***

***لەو خوێنە تابلۆیەکی پیرۆز***

***دەکێشم و***

***ناوی دەنێم: نیشتمان***

***(لەوانەیە ناوی بنێم دایکم***

***هەر ناوێکیان بێ وەکویەك وایە..***

***چونکە هەردووکیان هەرمردوون)***

***لەبەر پەنجەرەی ماڵی سۆفییەکدا***

***هەڵیدەواسم***

***لەوانەیە بیفرۆشێ و***

---

[٣٢٣]) هێمن، دیوانی هێمن، ٢٠١٢، ل ٢٩٩

***هەندێ خەونی پێ بکرێ***
***خەون لەدایك و لەنیشتمانیش***
***پێویستترە***
***ئەوەی خەونی نەبێ***
***نەدایکی هەیە نەنیشتمان..!*** [٣٢٤]

ڕەمزەکان:

(بانەڕۆژ، تابلۆ، دایکم، سۆفی، خەون، دایك (جارێك خۆشەویست و جارێك و نیشتمان). شاعیر گرنگییەکی زۆر بەخەون دەدات، خەون بەواتای خەیاڵ و بەواتای خولیا دێت. دایك و نیشتمان ئاوێتەی یەك کراون. مردن: ڕەمزی لەدەست دانە، ئەو نیشتیمانەی کە خۆمان حوکمڕانی نەکەین، وەك مردووە. بۆ ئێمە نییە.

لە شیعرێکی دیکەدا ئەو دەڵێ:

***داڵە دایکانەکە بە بەچکەکانی گوت:***
***ئەمڕۆ بەڕۆژوو دەبین***
***ڕادیۆ گوتی: هاتوچۆکردن***
***بۆماوەی بیست و چوار کاتژمێر***
***قەدەغەیە..!***

*********

***داڵە دایکانەکە***
***بەبەچکەکانی گوت:***
***ئەمڕۆ ڕۆژوو دەشکێنین***
***تەلەفزیۆن وتی: شەڕە...*** [٣٢٥]

---

[٣٢٤]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٩٩١ ـ ٩٩٢

ڕادیۆ و تەلەڤزیۆن، ڕەمزی دەسەلاّتن.. گیاندارەکانیشیان زەلیل کردووە؟ دالّـەکانیش رەمـزی مرۆڤە خوێنمژەکانن. لێرەدا شاعیر پەنای بۆ دایکی گیانداران بردووە، شەڕ واتا کوشتن و لـەناو چوون، کاتێ کە شەڕ بوو مەیت زۆر دەکەون و قەل و دالاّش پێیان خەنی دەبن.

پووختەی تەوەرە:

لەبەرئەوەی دەقنووس بۆ ماوەیەکی زۆر لە ژێر دەسەلاّتی ڕژێمە داگیرکـەرەکانی کوردسـتان ژیاوە، لەمێژە ئاشنایەتی لەگەڵ هونەری رەمـز هەیـە، ڕژێمـەکانی پـێش ڕاپـەڕین دوژمـنی بابەگەورەی شیعری بەڕەنگاری بوون. ئەمەیش وایکردووە، تـاکو ئێسـتا ئـەو ڕەمـز و هێمـا شیعریانە بەرۆکی دەقەکانی ئەو بەرنەدەن. شاعیر هەولّیداوە (دایك) یش وەك زۆر شتی دیکـە لە شیعرەکانیدا ئاوێزانی ڕەمز و جەفەنگ بکاتن.[326]

---

[325] ) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٧٨٢

[326] ) ئەندامێکی کۆڕی زانیاری کورد وای گێڕایەوە:" لە سالّی (١٩٧٦؟) لە وەزارەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن، ڕژێمی بەعس لە بەغدا، لێپێچینەوەیان لەگەڵدا کردم، لەسەر ئەوەی کۆڕی زانیاری کورد ویستوویەتی کۆمەڵەشیعرێکی لەتیف هەڵمەت چاپ بکات، کە ڕاپۆرتی لێدرابوو بەوەی شیعرەکان هەمووی ڕەمزن بۆ کورد و کوردستان و شۆڕش، لە دژی ڕژێم. منیش بۆ دیفاع لە لەتیف هەڵمەت گوتم: وانییە، ئەو هەرزەکارێکی عاشقەو شیعرەکانی هەموو ئەڤینداری و غەزەلن، ناحەزانی لەتیف هەڵمەت، ڕمزەکانیان بۆ ئێوە بە بەرەواژی لێکداوەتەوە." (نووسەران)

( ١٥ )

## چـیرۆکە دایـك

لێکۆڵینەوەکان ئەو گوتەیە پشتڕاستدەکەنەوە کە چیرۆك لە سەرەتایی لـە دایـك بوونیـدا زارەکی بووە، جا بۆئەوەی پتر گوێگرانی بۆخۆی ڕاکێشێت و باشتر کاریگەری خۆی بنوێنێ، زوو بە خەسڵەتە بنەڕەتییە سەرتاییەکانی شیعری تۆکمەکراوە و گووتراوە. داستانە کۆنەکانی گریـك و ڕۆمانییەکان و پێشتریش میراتە ئەدەبییەکانی سۆمەرییەکان و ئاشوورییەکان و سـریانییەکان و بابیلییەکان ئەوەیان سەلماندووە. جا پـێش ئـەوەی پەخشـانە شـیعر (Poetic Prose)بێتـە ئـــاراوە، پەخشــــانی کێشـــــدار (Rhythmical Prose) و پەخشـــــانی ســــەراوادار (Rhmed Prose) گـوتراوە و نووسـراون. چیرۆکەشـیعریش (Narrative Poetry) ــ وەك ژانرێکی ئەدەبی ـ لەسەردەمی ئێستادا بە شێواز و فۆڕمی سەردەمییانە جێی خۆی لە ئەدەبـدا کردۆتەوە. ئەم ڕشتە ئەدەبییە تێکەڵەیەکە لە خەسڵەت و بنەما و توخمەکانی چـیرۆك و شـیعر. پترلەوەش هێندێ جار بابەتەکە ڕوخساری بەشانۆکردنی (Dramatization) دەدرێتێ.

لە ئەدەبی کوردی دا، قانع دڵدار و کامەران موکری و شێرکۆ بێکەس و عەبدوڵلا پەشێو و هێمن موکریانی لـەتیف هەڵمـەت...شـەقڵی تایبـەتی خۆیـان لـە چیرۆکەشـیعری کوردیـدا جێهێشــتووە. تــەکنیکاری زۆریـــان تێـــدا کـــردووە، تەنانـــەت هونـــەری لاوك و هـــۆڕە و حەیرانو‌وسینیشیان لە ژانرەکەدا تەوزیفکردووە.شاعیر دەڵێ:

***(مەنوو ڕۆڵە)***

***- دایە شەوە و کچی لادێی زامەکانم***

*کونەو گۆزەی خۆیان پڕ کرد*

*لە ڕووباری قووڵی ژانم*

*دایە شەوە و شەویش ئێجگار درێژە*

*دایە شەوە و ڕێگای شەویش*

*هەڵەمووت و لووس و لێژە...*

*- ڕۆڵە مەنوو..زامەکانی خۆت توێ توێ کە...*

*ناخی گشتیان پڕ لە خوێ کە...*

*سێبەرێك دێ هەموو گیانی پۆڵایە*

*چاوەکانی تفەنگە*

*پەنجەکانی بۆمبایە...*

*لێی نەترسی ڕۆڵە دڵی مقەبایە...*

*دەبێ بەقەڵای زیوو زێڕ*

*تۆ نەتەوێ...*

*دەبێ بەناسکە کچێك و*

*لەبەر پێتدا دەکەوێ...*

*تۆ نەتەوێ...*

*گەر بتەوێ*

*نە دار بەڕووی کەزی سووتاو چرۆ دەکا...*

*نەلە ئاسۆی ئەم شارەدا خۆر دەکەوێ...*

*مەنوو ڕۆڵە...*

*مەنوو ڕۆڵە...*

*- ئەی دایە گیان... ئەوەی ئەمشەو بنوێ زۆڵە...*[٣٢٧]

---

[٣٢٧]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ١٧٩ ـ ١٨٠

دیالۆگی نێوان شاعیر و دایکی، سەبارەت بە نووستن و نەنووستن، نەنووستن نیشانەی خۆڕاگری و کۆڵنەدانە، ئەمری دایکییەتی، زۆر بەرێزەوە لێی دەڕوانێ، تەنانەت ئامادەیە خوێ بکاتە برینەکانی بۆئەوەی لەبەر ژان و ئازار مەیلی نووستن و بێئاگای لەبیربکات. دایکی ئاماژە بەوە دەکات، کە نابێ کوڕەکەی بەهیچ شتێك هەڵخەڵەتێ، بە ئافرەتی جوان وماڵی دونیا، ئەو ڕێباز و ڕێرەوەی هەیەتی دەبێ پەیڕەوی بکاو بەردەوام بێ.

شاعیر لە چیرۆکەشیعرێکدا دەڵێ:

***(ئەم یادگارانە لە بەرد تاشراون)***

***لە وڵاتێکدا خەڵکەکەی... هێڵی ئاسنن...***

***بێدەنگ بوو...***

***ئەو ژنە گوتی: با نان خەیاڵ بێو تۆ بە دوایدا راکەی***

***بەفر بە بێ وچان دەگری...***

***شار هێلکەی دەریا کۆدەکاتەوە...***

***لەبەر ئەوە... لە قوڕنەیەکی دی دا***

***پایز گوێمان لە هەندێ چیرۆك بوو...***

***سەرما هاوار دەکا: کێڵگە***

***لە لای خوشکەکەم دزە***

***لە پشت دەرگاکەوە کوڕەکە هاواری لێ کرد:***

***ئەو وێنەیە مانگاکەیە...***

***ترس قەوانێکە وەك بەرخێك لە گورگ دەترسێ***

***کێڵگەکان ئێسکی مارن***

***ئافرەت/ باران... باران... باران***

***هەر باران و هیچی دی...***

***چل شەو و چل ڕۆژ باران باری...***

***وەك گۆرانی...***

وەك دەنگی زەنگە دوورەكان
ئێمە سەرنجمان دەدا... كۆترەكە فڕی
ئێوارانێك پێڵاوە قوڕاوی یەكەی
بە دەستی یەوە بوو...
سەگەل بە دەوری دا دەوەڕێن
ئەو هێشتا ناتوانێ قسە بكات...
بێ هوودەیە لێ ی بپرسی چۆن: جوێن دەدات
ڕۆژگار هاتوچوو... چاوانمان
بۆ بینینی ئەو دیمەنە بریسكەی دەهات.
ڕۆژێ گوێمان لە دەنگی بوو
گۆرانی یەكەی لە كپی كێلگەكەوە دەڕژا
دوای ئەوە هەڵسام
كە دەرگام كردەوەو نەمدی گریام...
دوای ئەوسا دەیزانی گورگ ژنێكە
پێ ی دەڵێن كرمی ئاورێشم...
بیرت لەچی دەكردەوە؟
شووشەیەك ئارام...
بەڵام با كیسەیەكی بچكۆلەی پڕ كرد لە غەریبان
لەبەرئەوە
بازرگانەكان نەهاتن‌و بیریان لە كڕینی
ڕووبارەكە كردەوە...
باوكەكە ڕۆژێ دواكەوت
دایكەكە ئەمە دەزانێ
بەڵام لە پڕ هەموو شتێك لاسەنگ بوو

ئاوی ڕووبارەکە گۆڕا

دایکەکە دەپاڕایەوە...

دایکەکە دەیگوت: شێر

دەفتەری ئاورێشمە

دوای ئەوەی پێکەنی... دیسان وتی:

تۆ بڕۆ...

دایە پڕمەی گریان

فرمێسک جگەرەیە

ئەی خوایە گیان ئێمە لە سبەینێ دەترسین

بە نەرم و نیانی بە پاسەوانەکەی گوت:

خەو جێگایەکی دی یە

ئێوارانێك دایکەکە گەڕایەوە

گوتم: قسە کردن گەمەیەکی نوێ یە

ڕۆژێکیان هاوارم کرد: سوپاس

دایکەکە گوتی: ماڵتان لە کوێ یە

ئەو ژنەی لەگەڵماندا بوو هیچ ئامانجێکی نەبوو

قسە کردن نەبێ

بۆنی ماری لێ دەهات

یا زستان...

بیرەوەری ئەو رووبارە

گوندەکەی لە شەوە ساردەکاندا هاڕی...

ڕۆژێکیان دایکەکە گوتی: ساڵی کوڵلە

خەو بە پێکەنینەوە دەبینم...

لە ماوەی ئەو ڕۆژانەدا...

*کوڵلە دواکەوت*

*باوکەکەمان بینی... بە دایکەکەی گوت:*

*بزانم چووە بۆ کوێ دوای دەکەوم*

*ئیتر نازانم دوای ئەوسا چی رووی دا...*

*باوکەکە گوتی: لە گوندەکە بار دەکات*

*خەڵکی گوندەکە ترسان*

*دایکەکە پێشنیاری ئەوەی کرد کە بگوێزینەوە*

*ڕۆژێك دایکەکە لە جەرگەی ئەو ئاگرەدا*

*وتی: وردیلەکانم بنوون ئێمە بۆ شار دەچین...* [328]

لە خوێندنەوەی ئەم چیرۆکەشیعرە ئەم خاڵانە هەڵدەهێنجین:

دەقەکە هەموو یەکەکانی چیرۆکی (Story Units) تێدایە.

**ناونیشان:** (ئەم یادگارانە لە بەرد تاشراون).

**شوێن:** وڵاتێك، شار، گێڵگە، گوند.

**کات:** پاییز، ئێوارە، ڕۆژگار، ڕۆژێك، سبەینێ، ساڵی کوللە.

**کارەکتەرەکان:** خەڵك، ژنێك، بەفر، خۆشکێك، کوڕێك، مانگا، ئافرەت، کۆتر، سەگەل، ڕووبار، باوك، دایك، پاسەوان، سەرما، وردیلەکان.

**گفتوگۆ:** دایەلۆگ، مۆنۆلۆگ، گێڕانەوە.

**گرێچن:** گواستنەوەی گوندەکان (ئێمە بۆ شار دەچین).

بۆ بەئەرشیفکردنی، ڕۆژگاری تفتوتاڵی گواستنەوەی بەزۆرەملێی گوندەکانی کوردستان ـ کە لە سەدەی ڕابردوودا سەدەڵاتدارانی بەغدا چەندجار ئەنجامیانداوە، دەقنووس بە زمان و کەرەستە شیعرییەکانی خۆی، ئەو مێژووە تۆمار دەکات.

---

[328] دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ١٢٥٧ ـ ١٢٦٠

ئەوەی کە جێگەی سەرنجە، قارەمان (Hero) لە دەقەکەدا بزرە، واپێیدەچێ ئەمە بەئەنقەست بێ، تا هەر هەموو کارەکتەرەکان، بە بەفر و سەرما و گێڵگەشەوە، بکاتە قارەمان. دارشتنەکە ئالۆزە و فرە تەکنیکی شیعری تێدا تەوزیفکراوە ـ ئاماژەی شاراوەی زۆری تێدایە، وەك ئاماژە بۆ: (قەسیدەی ـ مطرـ ی بەدر شاکرسەیاب و شانۆگەری ـ لەچاوەروانی گۆدۆی سومێل بێکت و فۆلکلۆری کوردی).

لە چیرۆکە شیعرەکەدا (٦) جار ئاماژە بەدایك کراوە و لە هێندێك برگەشدا خۆی حیکایەتبێژە. دیسان نرخ و پایەی دایك ڕووبەری دەقەکە دادەپۆشێ و پێشنیارە چارەنووس سازەکە دەدرێتە دایك، کاتێك دەڵێ: *(خەڵکی گوندەکە ترسان/ دایکەکە پێشنیاری ئەوەی کرد کە بگوێزینەوە/ ڕۆژێك دایکەکە لە جەرگەی ئەو ئاگرەدا/ وتی: وردیلەکانم بنوون ئێمە بۆ شار دەچین...)*

دەقنووس لە چیرۆکەشیعرێکدا دەڵێ:

***لە چیرۆکی (زۆربا) دا (میمیکۆ)ی شێت***
***دەڵێ: من ژن نایەنم چونکە ژن پێلاوی لێ دەوێم..***
***ئای، لەساویلکەییو دڵپاکی میمیکۆ...***
***چونکە نازانێ***
***کەژن لەم سەردەمەدا چەندێ برو بیانوی زۆرە***
***نازانێ تاڵی هەموو پرچێ***
***بەلاجانگی کچێکەوە***
***بۆنی خوێنی شاعیرێکی لێدێ***
***- میمیکۆـ دڵپاکو ساویلکەیە...***
***بە پێلاوی پیاوێکی مردوو***
***کە ڕۆژێ لە ڕۆژان نەنکی بۆی دزیوە...***
***قایل دەبێ...***

*میمیکۆ خەو بە ژنی جوانەوە نابینێ...*

*هەنارێکی لە مەمکی ئافرەتێ خۆشتر دەوێ...*

*لەتێ نانی لە لێوی کچێ خۆشتر دەوێ...*

*تاڤگەیەك... لە ژنێکی رووت زیاتر*

*سەرنجی رادەکێشێ...*

*میمیکۆ شاعیر نیە و*

*دڵی لە شەقام و کۆڵانەکاندا*

*بە دوای کچە جوانەکان و شوێن پێی*

*ژنە نازدارەکاندا سەرەرۆ نابێ...*

*- میمیکۆ- هیچ هەست بەوە ناکات*

*کە پێویستی بە ئافرەتێك هەیە*

*خۆشی بوێ...*

*ئای خۆزگەم بە میمیکۆ...!* [٣٢٩]

دەقنووس ـ وەك خوێنەرێکی بە ئاگا لە دونیای ئەدەب ـ لەناو چیرۆکدا چیرۆك دەنووسێتەوە و سەرچاوەکەشی دیاری دەکات. ڕاستە دەقەکە خاڵییە لە وشەی دایك، بەڵام (٣) سێبەری (دایك)ی تێدایە (نەنك، ژن، ئافرەت) ئەو کاتێك کە دەڵێ: (میمیکۆ ـ هیچ هەست *بەوە ناکات/ کە پێویستی بە ئافرەتێك هەیە/ خۆشی بوێ.../ ئای خۆزگەم بە میمیکۆ...!)* وشەی (ئافرەت) هەموو مێینەیەك دەگرێتەوە، بە خوشك و دایك و نەنگ و کچ و ژن و پوور و دڵدار و دەستەخوشك. لێرەش مەرج نییە خۆشەویست گەر ئافرەتیش بێ هەر دەبێ دڵدار و مەعشووق بێ. [٣٣٠] شاعیر لەشیعرێکی دیکە دا دەڵێ:

---

[٣٢٩]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٢٢٩ ـ ٣٠٠

[٣٣٠]) زۆربای یۆنانی، ڕۆمانێکە نووسەری بەناوبانگ ( نیکۆس کازانتزاکیس) نووسیویەتی، کرۆکی ڕۆمانەکە باس لە کەسێتی پیاوێکی ڕۆشنبیر دەکات، بەناوی ( باسێل) کە نغرۆی دەریای کتێب خوێندنەوە بووە، لە

*(بەلەمی وێڵ)*
*منداڵەکە کۆمەڵێ کاغەزی هێنا*
*دایکی چەمۆڵەیەکی... لێنا*
*- ئەم نالەبارە دیسان*
*ماڵ دەکات بە: زبڵکدان*
*خوشکە گەورەکەشی هەڵچوو*
*- دایکە ئەم منداڵەت بۆ بوو...*
*منداڵەکە نقەی نەکرد*
*بێدەنگ... ورد... ورد*
*ورد... ورد... بێدەنگ*
*سەیری بارانەکەی دەکرد*
*بە کاغەزێکی ڕەنگاوڕەنگ*
*بەلەمێکی گەورە گەورەی دروستکرد*
*- فەرموون سەر کەون هەردووکتان*
*دەتاننێرم بۆ هەندەران*
*دایکی و خوشکەکەی پێکەوە*
*نەختێ لە قسەکەی رامان.* [٣٣١]

---

گەشتێکدا تووشی نەخوێندەوارێك دەبێ کە ژیانی لێوان لێوە لە ئەزموون و ڕووداو زوو دەبنە هاوڕێی یەکدی و زانیاری باشی لێوەردەگرێ، کە لە کتێبەکاندا هەرگیز نەیخوێندبۆوە. ئەو پیاوە نەخوێندەوارە (زۆربا)یە. ئەم ڕۆمانە لەلایەن دەزگای هۆلیودەوە کراوەتە فلیمی سینەما و ئەکتەری بەناوبانگ ( ئەنتۆنی کۆین) تێیدا دەوری قارەمانی فلیمەکە دەبینێ. (نووسەران)

[٣٣١]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ١٢٩٨ ـ ١٢٩٩

شاعیر لەڕێی ناوهێنانی دایك و خوشك و منالێکەوە، ئەوە دەگێڕێتەوە، کە کەلتووری پڕدان و لێدان و کوشتنی خەیاڵ و بەهرەکانە، دواتر منالە هەرچۆنێ بێ بەلەمێك لەکاغەزێکی ڕەنگاوڕەنگ دروست دەکات، دوادەکات سواری بەلەم بن، بۆئەوەی لەم نەهامەتییە ڕزگاریان بێ، بۆئەوەی بچنە هاندەران، بۆئەوەی پارەیان دەست کەوێ، ژیانیان هەبێ، بەڵام هەر خەیاڵ بوو، منالێ خەیالفراوانییەکی بێ سنووری هەیە. خەیالە لێکدانەوەکانی تێکەلەیەکن لەئەفسانە و داهێنان و پێشبینی، بەڵام ئەگەر کەش و هەوایەکی ئازادی بۆ برەخسێندرێ و ڕێگری لەبەهرەکانی نەکرێ.

<u>پووختەی تەوەرە:</u>

شاعیر لە چیرۆکەشیعرەکانیشدا ـ کە ژمارەکەیان بەرچاوە ـ (دایك)ی فەرامۆش نەکردووە، ئەو لە خوێندنەوەی کارەکتەری دایکی خۆیەوە دوو کاری ئەنجامداوە: (ا) سیفەتە جوان و مەزنەکانی دایکی خۆی بە (دایکەکانی) چیرۆکەکان بەخشیووە .(ب) (دایك)ی نێو چیرۆکەکان ـ گەر وەك قارەمانیش ناوزەند نەکرابن، ناڕاستەوخۆ هەموو خەسڵەتەکانی کارەکتەری قارەمانیان وەرگرتووە. ئەمانەش هەمیسان، بەرزی مەقامی دایك لەلای ئەم شاعیرە دووپاتدەکاتەوە. بەهیچ شێوەیەك لێرەدا دایکی لاواز و ترسنۆك و ڕژد و ناپاك و خۆپەرست نابینین. لەکاتێکدا کارەکتەری دیکەی هەیە لە مرۆڤە سووکەکان بن.

( ١٦ )

## دایــکی لەتیف هەڵمەت

هەقتانە بپرسن: بۆ دایکی دەقنووس تەوەرەیەکی سەربەخۆی بـۆ تـەرخان بکـرێ ئـەدی هەموو شاعیرێك دایکی نییە؟

لەپێشدا با داوای لێبووردن لە ڕۆحی پاکی خـاتوو (سـەعدیە) بکـەین، کەنـەمانتوانی تەوەرەکەی زووتر بەسەربکەینەوە، هۆکارەکەشی ئەوە بوو بەبەرنامە، ویستمان خوێنەرانمان بـە زۆرترین دەقە شیعر و تەوەرە و ناونیشان ئاشنا بکەین، کە ڕێخۆشکەرن بۆ باشتر تێگەیشتن لە کەسێتی ئەو دایکە و و لە توانا و توانستی داهێنەرانـەی لـەتیف هەڵمـەتی کـوڕی. وەڵامـی پرسیارەکە لەم خاڵانەی خوارەوە چڕدەکەینەوە:

- کەش و هەوای ئەو ماڵ و خێزانەی لـەتیف هەڵمـەتی تێـدا گـەورە بـووە، لەبـەر زۆر هۆکـاری کۆمەڵایەتی و ئایینی و خێلەکی و کەلتووری، پێگە و مەقامێکی دیـار و بەرچـاوی پـڕ ڕێـز و خۆشەویستی بۆ ژن هێناوەتە ئاراوە. ئەمەش ڕاستەوخۆ لە کەسـێتی دایکـی لـەتیف هەڵمـەت ڕەنگیداوەتەوە و ژنە کوردێکی دروستکردووە، کە بەپەنجـەی ئافـەرین و شـکومەندی بـۆ درێـژ بکرێت ـ لە بڕگەکانی پێشتردا دەقی دیدارەکانی (لەتیف هەڵمەت)مان، لەم بارەیـەوە خسـتۆتە بەردیدی ئێوە.

- لەتیف هەڵمەت تەنها کوڕی دایکی بووە و کوڕی هیچ کەسێکی دیکـەی بنەماڵەکـەی نـەبووە. ڕاستە دەستەونەزەر بەرامبەر باوکی ڕاوەستاوە، بەڵام داگیرکەرە گەورەکەی ڕۆح و دڵ و دەروونی

ئەو شاعیرە هەر ئەو دایکەیە. جوانترین بەڵگەش ئەو (١٤٢) شیعرەیە کە بۆ دایکی نووسیوە، لە کاتێکدا دەقە شیعرێکی هەتیوی بۆ باوکی تۆمارکردووە. هۆکارەکەشی بونیاتی خودی کەسێتی (لەتیف هەڵمەت)ە، وەك منداڵ و مێرمنداڵ و هەرزەکار و دواتریش پیاو. ئەو کەسێکی شەرمن و کەمدوو و خاکی و سادەیە. تارادەیەك حەز بە دورەپەرێزی و گۆشەگیری دەکات و حەزناکات زۆر تێکەڵی خەڵك بێ. بەو واتایەی کە بێشکە و باوەشی گەرمی ئەو دایك و سێبەری چەتری ئەو دایکە خۆشترین و هێمنترین و زامنترین ئارامگەی ڕۆحی و جەستەیی ئەو شاعیرە بووە. بە لەدەستدانی ماددی ئەو ئارامگەیە، هەوارە ڕۆحییەکەی نەپووکاوەتەوە، بەڵکو خەون و خەوی خۆشتر و جوانتری پێبەخشیوە. ـ دەقەشیعرەکانی وادەڵێن!

- بە پشتبەست بە تیۆری و ئاکام و لێکۆڵینەوەکانی پسپۆڕانی دەروونناسی هاوچەرخ، گەیشتووینەتە ئەو ئەنجامە کە ئەگەر دایکی لەتیف هەڵمەت نە سووتابووایە و بە شێواز و هۆکارێکی ئاسایی کۆچی دوایی بکردبووایا، ئەوا پاشماوە خەماوییەکەی ئەو کۆچە ئاست و ئارستەیەکی دیکەی وەردەگرت و دوور نەبوو وا بە قوول و قوورسی لە جیهانی بێئاگایی شاعیردا وا جێگیر نەبووبا. بۆ وەبیر هێنانەوەی خوێنەرانی بەرێز، لە بەندی یەکەمی ئەو کتێبە بە درێژیی شەنوکەوی ئەو دیاردەییە دەروونییەمان کرد کە چۆن هێندێك جار ڕووداوێك، وەك بەرکەوتنی مێشك بە ئامێرێکی قورس و زامدارکەر، کاریگەریی لە سەر مێشك و دەروون و ڕۆحی خاوەنەکەی بەجێدەهێڵێ و نموونەی زیندوومان هێنایەوە. بە واتایەکی دیکە کۆچی ئەو دایکە بۆتەهۆکاری نەخۆشییەکی دەروونی لە مێشکی ئەو زاتەدا، کە بەهیچ دکتۆر و داودەرمانێك ـ تاکو ئێستا ـ چارەسەری نییە.

ئیمڕۆ زانست سەلماندوویەتی کە خۆشەویستی نەخۆشییە و دەروونناسی ئەمەریکیش (ڕۆبێرت ستێرنبێرگ Robert Sternberg ١٩٤٩- ) تیۆریی سێگۆشەی ئەڤینی داهێنا کە گۆشەکانی بریتین لە (هۆگری، لەئەستۆگرتن، سۆزداری).[٣٣٢]

کەواتە ڕەنگ بێ نەختێك لە دیاردە دەروونییەکەی شاعیر نزیك بینەوە گەر بڵێین: لەتیف هەڵمەت ئاڵودەیە بە خۆشەویستی دایك.کاتێك د. هاوژین سڵیوە لە شاعیری پرسی: کارەساتی مردنەکەی دایکت چۆن بوو؟ لەتیف هەڵمەت گوتی:

"خانوێکمان هەبوو لایەکیمان ڕوخاندبوو، بەشێکی بچووکمان ڕووخاند بەشێکی گەورەی مابووەوە، کە خۆمان تیایابووینەوە، لەبیرمە حەمامەکەمان ڕووخاندبوو، دایکم چوو نەوت بکاتە حەمامەکە لەبەر ئەوەی دوای ئەو هەموو تەپ و تۆزە خۆمان بشۆین، ئافرەتی جاران کەوای شۆڕیان لەبەردەکرد، جمکی کراسەکەی کەوتبووە ناو نەوت، کە ئاگری حەمامەکەی دابوو ئەو جمکە کڕی گرتبوو، ئەو بەبەر چاوی منەوە گڕی گرت، نەمتوانی بیشی گوژێنمەوە، ئەوەندە نەبووم بتوانم بیکوژێنمەوە، بە بەرچاومەوە با بڵێین عومری خوای کردو مرد." [٣٣٣]

بڕوانن لەتیف هەڵمەت چ دەبێژێ:

***(ئەوینی دایکم)***

***بۆ ئەوەی دڵم لە یادی نەچێ هەتا هەتایە***

***دایکم سووتاوە و هەتاکو ئێستاش***

***دووکەڵی پرچی لە بای شەودایە***

---

[٣٣٢] http://www.naturalnews.com/٠١٠٨٢٥_counterthink_drug_racket.html

[٣٣٣] دیدەنی: هاوژین سڵیوە لەگەڵ لەتیف هەڵمەت، ١٩ / ٣ / ٢٠١٢

***چی تەپ و تۆزی ئەم گەردوونەیە***
***کۆی دەکەمەوە لەناو گلارەی***
***ئەم دوو دیدەیە***
***بۆ ئەوەی بەرەو هەر کوێ هەڵفڕم***
***بۆنی نیشتمان بڕژێ لە باڵی ئاگری شیعرم***
***چنگێ لە خۆڵی پیرۆزی سەیوان***
***لە دڵما دەبەم جیهان بە جیهان***
***بۆ ئەوەی باڵای پەیڤم هەر بەرز بێ***
***هەڵگوردو قەندیل لە گیانی گیانما***
***دەبەم جێبەجێ***
***بۆ ئەوەی پرچی شیعرم هەر سەوز بێ***
***دارستانێکی نیشتمانەکەم***
***لە بیرما دەبەم بڕۆم بۆ هەر کوێ..!*** [٣٣٤]

کاریگەریی ئەم دەقە زۆر بەهێزترە لەسەر خوێنەر، چونکە دەزانێت وشەکانی: سـووتان و ئـاگر و خـەم و فرمێسـك و مـەرگ... نـە وشـەی فەرهـەنگین و نەوشـەی هەڵبەسـتراوی زیندەخەونبینان. ئەمەیش ڕاستگۆیی و سدقی شیعری دەقنووس نیشـاندەدات. ئیمـڕۆ چـەند تیۆرییەکی ئەدەبی دەربارەی دەق و دەقنووس هاتۆتە ئاراوە، کـە دوو بۆچـوونی دژبەیـەکییان هەیە، یەکیان پێیوایە، ڕەخنەکار تەنها دەبێ خۆی بە دەق ببەستێتەوە، هەرچی تاقمی دووەمە پێیوایە دەق و دەقنووس تەواوکەری یەکترین. لێرەدا، بۆچوونەکەی بەرەی دووەم بەهانامانـەوە

[٣٣٤] ) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٥١٢

هات و باشتر دەقەشیعرەکانی بۆ ڕاڤەکردین. دەنا هیچ شاعیرێك نییە وشەی (سووتان و مەرگ و خەم و ئەسرین و... تاد) چەندان بار لە دەقەشیعرەکانیدا نەنووسیبێتەوە.

شاعیر لەدەقەشیعرێکی دیکەدا دەڵێ:

***جا خۆ من دەزانم... نە تۆ هەتاوی و***
***نە منیش دەوەنم***
***بەڵام تۆ بۆ من***
***لە هەتاو بۆ دەوەن پێویستتری...***
***هەموو شاعیرەکان باسی تۆ دەکەن و***
***کەس وەکو من تۆی خۆشناوێ***
***هەموو دڵدارەکان تۆیان خۆشدەوێ و***
***کەس وەکو من لە خۆشەویستی تۆدا***
***نابێ بە هەوری گوڵاوو***
***هێلی هێلی خۆی لە پرچی چاو کەژاڵان و***
***لاجانگی کەژە بەفرینەکان ناپژێنێ...***
***دایەگیان...*** [٣٣٥]

شاعیر لە دیاردەیەکی سروشتەوە رۆدەچێتە نێو بیرەوەرییەکانی، وەك چۆن دەوەن بەبێ رۆشنایی و هەتاو وجوودی نامێنێ و بەسەوزی نامێنێتەوە، ئاوا شاعیر بێ وجوودی دایکی ژینی بێ مانا دەبێ. کاتێ کە خوێنەر شیعرەکە دەخوێنێتەوە نازانێ مەبەستی شاعیر چییەو ئەوکەسەی کێیە کە هێندە لەلای خۆشەویستە. لەدوا وشە ئەوە ئاشکرا دەکات کە دایکییەتی، خۆشەویستی ئەو بۆدایکی خۆشەویستییەکی قوڵەو شاعیر ئاماژە بەوە دەکا شاعیرانی تریش باسی دایك دەکەن، بەڵام خودی لەتیف هەڵمەت زۆرتر لەم بابەتەدا قوڵ بۆتەوە.

---

[٣٣٥] ) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٢٨٨ ـ ٢٩٠

له دەقەشیعری (***لاوکێکی نهێنی***) دا دەڵێ:

***ئەی دایە گیان!***

***ئەگەر ئەمشەو بەرەبەیان***

***لەسەر ئەسپی ئەوینێکی شپرزەدا***

***هاتی بۆ لام***

***هەرگیز نەکەی***

***دەستت بکەی***

***بە پشتوێنی زێڕینی قەدو باڵام...***

***من بوومەتە***

***ڕووباری زام..***

***هەرگیز نەکەی***

***دەمت بکەی بە شەکر بۆم..***

***پرچە سووتاوەکەت بکەی***

***بە کەپر بۆم..***

***دایە من ئەمشەو (بۆمبا) م***

***لە دەممدا***

***شاردۆتەوە لەجێی وەڵام..***

***بۆ ئەوانەی وا دەزانن..***

***پەملەپس و (مقەبا) م.*** [٣٣٦]

ناڕاستەوخۆ تامەزرۆیی دەقنووس بۆ باوەشە گەرمەکە و دەمە پڕ خەندەکە و پرچە سووتاوەکەی دایك خۆی دەنوێنێ، لێ ئیمڕۆ پشتینی قەدوباڵای شاعیر بۆتە زام و دەمی بۆیتە جبەخانەی بۆمبا. ئەویش لەداخی ئەو قەڵەمانەی کە ئەو بە *پەملەپس* (بووکەڵەی لەپەڕۆ و

---

[٣٣٦]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٢١٢ ـ ٢١٣

پەموو دروستکراو) و- *مقـەبا*، دەشـوبهێنن. لـە دەقەکـەدا دوو پـنتی شـاراوە هەیـە: یـەك: دەقنووس کەس شك نابات دەردەدڵی خۆی بۆ بکات، جگە لە دایکی. دوو: ئەم دەقەشیعرە بـە ئەرشیفکردنی ئەو بەربەرەکانی و سەنگەر لێگرتنەیە کـە لـە ڕۆژێکـدا، تاقمێـك دەرحـەق بـە شیعرەکانی ئەو نیشانیاندا. بەتایبەتی لەسەروەختی لەدایك بوونی (ڕوانگە)دا. وشەی (مقـەبا) ئاماژەیە بۆ ڕەخنەیەك کە لەسەر یەکەمین بەرهەمی چاپکراوی ئەو لـە ڕۆژنامـەی (هاوکـاری) بڵاوکرابـۆوە و تێیـدا هـاتبوو کـە ئـەو دەقنووسـە هێنـدێك وشـەی ناشـیعری، وەك (مقـەبا) بەکاردێنێ.

لەشیعرێکی دیکە دادەڵێ:

***ناوی دایکم***

***هەر شتێ خۆش بێ... پیرۆز بێ.. جوان بێ***

***تامی ماچێکی دایکمی لێ دێ***

***گشت ئەستێرەیە لەش و لار زیوین***

***لە ڕەنگی چاوی دایکی من دەچێ...***

شاعیر هەموو هەست و ئیحساسەکانی خۆی دەخاتەکار بۆباس کردنی دایکی خۆشەویسـتی، لەگوتەی (هەر شتێ خۆش بێ... پیرۆز بێ.. جوان بێ)، کەمەربەندی هەموو شتەکانی جیهـان دەکات، چونکە بەهای هەموو شتێکی باش، خـۆی لەیـەکێك لـەو وتانەدەبینێتـەوە: (خـۆش، پیرۆز، جوان)، لەهەمان کاتیشدا، چاوی دایکی ڕووناکی دەری شاعیرە و ئەستێرەی ژیانیـەتی. لەم شیعرەدا (ماچی دایك و چاوی دایك)، کە هەردووکیان میهرەبانین، ماچی دایك پڕە لەسـۆز و خۆشەویستی، چاوی دایك، ڕوانینی دایك بەهاو جوانی خۆی هەیە.

لەشیعرێکی دیکە دا دەڵێ:

***بۆنی گوڵاوو... چپەی باران و... مانگی ناو دەربەن***

***شریخەی هەورو... تاوە بروسکەی پاچی گۆڕ هەڵکەن***

***هەموویان باسی پرچی سووتاوی دایکی من دەکەن..!***

*هەر گوڵێ شێوەی لە دایکم نەچێ با بۆ خەزان بێ*
*هەر شوێنێ بۆنی خەندەی بەتامی دایکمی لێ نەیە*
*با هەر وێران بێ*
*هەرچی شاعیرێ هەوری لای لایەی دێرینی دایکم*
*لە جووکەی پۆلە هۆنراوەی نەڕژێ*
*با بێ زمان بێ...!*
*****
*لە هەرکوێ ناوی دایکم بنووسرێ*
*گەردوون وەك پوشی دەم با دەهەژێ*
*گوڵاو دەتکێ ونێرگز دەبارێ*
*باخ خەندەی دەپژێ...!*
*لە هەر کوێ ناوی دایکم هەڵکۆڵرێ*
*بیابانیش بێ تیا هەڵدەقوڵێ*
*چەمێ... ڕووبارێ...!* [٣٣٧]

شاعیر زۆر جار لە دیاردەکانی سروشتەوە وێنەکان هەڵدەهێنجێ، ئەم جارەیان ئەو حاڵەتە و دیمەنەی کە شاعیر بینیویەتی، کاتێ دایکی ئاگری تێبەربووە و سووتاوە و مردووە، ئەوا لەنێو دیاردەکانی سروشت، ئەوا هەڵکروزان و سووتانی قژی دایکی، لەنێو بۆنی گوڵاویش دەبینێتەوە. لەنێو چپەی باران. شریخەی هەورو تاوە بروسکە، کە سوتێنەرە. لەنێو شوێنەکانیش هەردایکی دەبینێ. تەنانەت ناوی دایکی بیابانیش دەکات بەگوڵزارو جوانی.

[٣٣٧] دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٥٦٩

لەدەقێکی دیکە دا شاعیر دەڵێ:

***دارستان***

***لە هەر شوێنێ ئاگر پرچی دارستانێ***

***بکات بە چەمی خۆڵەمێش***

***با ڕادەکاو دێ پێم دەڵێ:***

***ئەی شاعیری قەڵەندەرو شەیدا و دەروێش***

***ئەها دایکت دەسووتێ وەك:***

***کۆتەرەی ناو ئاگردانێ..!*** [338]

سووتان و مردنی دایکی کارەساتێکی جەرگبڕە، بەتایبەتی بەچاوی خۆی بینیویەتی کە دایکی کڕی گرتووە و سووتاوە و مردووە، کاریگەرییەکی دەروونی قوڵی لەزەینی شاعیر دروست کردووە، کە تاوەکو لەژیان ماوە لەبیری ناچێتەوە. شاعیر ئەو ئاگرەی هەر لەبەرچاوە، تەنانەت لە هەرشوێنێك دارستانێکیش بسووتێ، ئەو وادەزانێ قژی دایکییەتی، وادەسووتێ، هەڵبەتە لەم شیعرەدا با بووە تەتەر و هەواڵ گەینەر. هەڵبەتە با لە فۆلکلۆری کوردی و لە شیعری شاعیرانیش ئەم ئەرکەی پێ سپێردراوە. لە فۆلکلۆری کوردیدا واهاتووە:

***نامە دەنووسم بەخوێنی دڵم***

***دەیدەم بە شەماڵ بیبا بۆگوڵم***

***نایدەم بەشەماڵ پێچ و پەنایە***

***بۆخۆم بۆیدەبەم داخم لەدڵایە.***

بۆنموونە لە دووچامەکەی (نالی و سالم)ش، (با) کراوەتە قاسید بۆگەیاندنی پەیامەکانیان.

---

[338]) سەرچاوەی پێشوو، ل ٥١٦

پووختەی تەوەرە:

جگەلەوەی کە دڵپاکی و مرۆڤدۆستی و جەرگسۆزی وەك خەسڵەتی بنەڕەتی کەسێتی دەقنووس لە شیعرەکاندا ڕەنگیانداوەتەوە، ڕووداوی سووتانی خاتوو (سەعدیە) بەبەر چاوی لەتیف هەڵمەتەوە، هۆکارێکی بنەڕەتییە لە جۆشدان و خرۆشاندنی هەستی دایکایەتی و قوولبوونەوەی خۆشەویستی نێوانیان. دەکرێ بڵێین: ئەو ئاڵوودەبووە بە خۆشەویستی دایك. ئەو (١٤٢) شیعری بۆ دایك نووسیوە و بە دیان جار ئەوی کردۆتە ناونیشانی دەقەکان. بەئاشکراش هەست پێدەکرێ کە کەسێتی و پێکهاتەی (جینیی) لەتیف هەڵمەت هەڵگری چەندان خەسڵەتی جیاواز بن کە بە میرات لە دایکییەوە بۆی بەجێماوە.

( ١٧ )

## دایكی كەسانی دیكە

بێگومان ئەو هەموو (دایكە)ەی لە كۆبەرهەمە شیعرەكانی لەتیف هەڵمەتدا بەرچاو دەكەون و دەقەشیعرەكانیان بە بیرۆكە و وێنەی شیعری و جوانكاری و خۆشئاوازی ئارایشت كردووە، خۆ هەموویان ئاماژە نین بۆ خاتوو (سەعدیە)ی دایكی شاعیر. وشەی (دایك) لە فەرهەنگی شیعردا، بەدرێژایی مێژووی ئەدەبی زارەكی و نووسراو، وزەیەكی سیحراوی و جوانییەكی شیعریی و پیرۆزییەكی خوداوەندی و ڕوخسارێكی فریشتەیانە و ڕەوانبێژییەكی ڕەنگاڵەی و سەدایەكی دەروونی و مانایەكی گەردوونی لە نێو حەرفەكانیدا حەشارداوە. ئەو هێزە ئەلیكتریكە و موگناتیسییەی لە نێو وشەی دایك دا هەیە، هەمیشە شاعیرەكان ڕادەكێشێت بۆ تەزیفكردنی داهێنەرانە، چونكە وەك ڕەنگە سەرەكییەكانی هونەری نیگاركێشی وایە ـ ڕەنگی سوور و زەرد و شین ـ كە بە هەزاران ڕەنگی دیكەیان لێدروست دەكرێ، بەو واتایەی وشەی (دایك)یش سەرچاوە و كانگایەكی لەبن نەهاتووە بۆ وێنەی شیعری نوێ و بیرۆكەی تازە.

چەندان دەقەشیعرمان لەبەر دەستە، كە دەقنووس بە شێواز و تەكنیكی جیاواز سوودی لە وشەی دایك وەرگرتووە، لەم دەقەی خوارەوە، دەقنووس قاسەیەكی فەرهەنگی وشەكانیمان نیشاندەدات، كە (زاری دایكە). لەو زارەوە هەموو وشە جوان و خۆش و واتادارەكانی خواستۆتەوە. خاڵی پڕشەنگداری ئەم دەقە ئەوەیە، كە دیسان شاعیر سەرچاوەی جوانی و خوشییەكان دەگەڕێنێتەوە بۆ دڵ و دەروون و ناخی ئەو كائینە ڕۆحسووكە. ئەوەتا دەڵێ:

***نەكەن بڵێن ئەم شاعیرە***

***وشەی خۆش خۆشی لەکوێ بوو***

***چی منداڵە هاورێی منن***

***هەرچی وشەی بەتام هەیە***

***شەو لە دایکیان دەیدزنو***

***لە قۆزاخەی گوڵی هەوری***

***ماچە ئاگرەکانیاندا***

***بەرە بەیان بەر لەوەی خۆر***

***لەسەر لوتکە سەما بکا***

***بۆمی دێنن...!*** [339]

هەرچەندە دەقنووس لێرەدا دایکی منداڵەکانی بەکارهێناوە، بەڵام مانای ئەوەنییە لەنێو ئەو دایکانە دایکی خۆی نەبێت، دایکی خۆشی یەکێکە لەودایکانە، کەناوی نەهێناوەو باسی نەکردووە، وەلێ هەستی پێدەکین و وجوودی هەیە.

لەدەقە شیعری (ئەنگوستیلە)دا دەڵێ:

***(ئەنگوستیلە)***

***من ڕەنگە هەتا هەتایە... پارەی ئەنگوستیلەیەکم نەبێ***

***کە بیکەمە پەنجەت***

***بەڵام گەر حەز بکەی هەتا هەتایە***

***قۆڵ و باسکم لە گەردنت دەئاڵێنم...***

***من دەزانم....***

***تۆ پێت ناخۆشە***

***دەستە بۆر و مەرەکەباویەکانم***

***واز لە:***

---

[339]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٣٧٩

*پرچ و*

*گۆنا و*

*لامل و*

*ژێر مل و مەچەکت....*

*ناهێنن..*

*ئای گیانە...*

*تۆ دەستی منالّە هەژارەکانت نەدیوە...*

*چۆن لە نان گیر دەبێ و*

*پێوە دەنووسێ...؟*

*کچێ هەزار ماچت دەدەمێ و ماچێکم بدەرێ...*

*من ناوێرم ناو دەمت هەلّمژم...*

*ئەترسم کە چویتەوە بۆ مالّ و*

*دایکت ماچی کردی*

*بلێ: بۆنی شیعر لە دەمت دێ*

*ئەی کچە بچکۆلەکەم*

*چ شاعیرێ ماچی کردووی...!*

*تۆش بلّێ ی: لەتیف هەلّمەت*

*جا ئەو ساتە شەپۆلە سەرەرۆکانی وەند*

*ئەو هەوالّە*

*بەگشت دەریاکان دەگەیەنن...* [٣٤٠]

پەیوەندی نێوان دایك و کچ، پەیوەندییەکی توندوتۆلّە، لە گوتەی (من ڕەنگە هەتا هەتایە... پارەی ئەنگوستیلەیەکم نەبێ)، شاعیر بەهای پارە و ئەنگوستیلە لەبەرامبەر عیشق و

---

[٣٤٠]) دیوانی لەتیف هەلّمەت، ل ١٥٢

خۆشەویستی کەم دەکاتەوە، تەنانەت ماچەکانیشی بۆنی شیعریان لێدێ، شاعیر دەوڵەمەندە بە جوانی، بە شیعر، بە دەربڕینی ئەدەبی، دەوڵەمەند نییە بەماڵی دونیا.

دیقەت لەو وێنە هونەرییە سۆزدارە بدە:

***(وشە کچۆڵەکان)***

***ئەوە کێیە***

***وەك منداڵێ شەوی زستان***

***دەسلەملانێی دایکی بێ***

***بە دڵمەوە نووساوە***

***تۆی یا پشکۆی هۆنراوە؟*** [٣٤١]

لە قالبی مەتەڵێکی سادەی سەرنجڕاکێشدا، دەقنووس باوەشی گەرمی دایکمان وەبیردێنێتەوە، کام باوەش؟ ئەو باوەشەی منداڵ لە شەوی ساردی زستاندا لە ناو نوێندا خۆی تێدا گەرم دەکاتەوە. گەرمییەکەی ئەو باوەشە گەرمایی ڕۆحی و دەروونی و جەستەییە، چونکە گەر تەنها گەرماییە فیزیکییەکە بێ، ئەوا زۆپە و و ئامێری (هیتەر) و (سپلیت) یش وزەی گەرمایی دەبەخشن. پەیامگری ئەم دەقە، خوێنەر بێ یان بیسەر- بیرەوەری منداڵی خۆی دێتەوە یاد. جوانکاری وێنەکەش لەوە دایە، کە دولبەر کراوەتە پشکۆی هونراوە و جز لە دڵی شاعیر هەڵدەسێنێ. ئەمەش نیشاندەری ئەوەیە هەر وشەیەك لە دیدی ئەودا پشکۆیەکی گەشاوەیە.

لەدەقێکی دیکەدا ئەو دەڵێ:

***هەورێ هات و توایەوە***

***بۆ ناو دەم و پرچ و گۆنات***

***بە کەس نەڵێی... منم ئەوە...***

---

[٣٤١]) سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٣٢

*لە تەنیایی شەو ترساوم...*

*دەرم نەکەی تۆ بەو شەوە*

*تووڕە نەبی لە هاتنم*

*توخوا دایکت هەڵنەسێنی....*

*دوایی دەمرم زۆر شەرمنم.* [342]

شاعیر ئەم شیعرەی لەناخی نەستەوە نووسیووە و لایەنی شەرم کردن لە ئافرەتان لە نەستی شاعیردا هەیە، لە نائاگاییەوە جارێکی دیکە هاتۆتەوە دونیای نووسین. شاعیر چەند دەستەواژەیەك دەردەبڕێت لەوانە (*شەو ترساوم، تووڕەنەبی* ) ئەمانە هەمووی بۆ ئەوەن تاوەکو کچەکە ڕازی بکات کەوا هانا بۆ دایکی نەبات، چونکە شاعیر زۆر شەرمنە، لە کۆمەڵگایەکی باوك سالاری هەمیشە (باوك )، بووەوەتە بکوژی ئەم حاڵەتانە، کەچی شاعیر تەنها ترسی لە دایکی کچەکەیە، ترسکەش ئاوێتەی شەرم بووە، دەتوانین بڵێین ئەم ترسەش شەرمێکی زۆرە و تا ئاستی مردن و لەناچوون شەرم دەکات[343] لەتیف هەڵمەت باسی منالّی خۆی دەکات و دەڵێت: "کێشەم ئەوەبووە، میوانی ژن بێت لەپیاو قەد شەرمم نەکردووە، بەڵام کێشەم ئەوەبوو ژنمان بێت... زۆرجار بووە بەخێرهاتنی میوانی ژنم نەکردووە، دوای دوو ڕۆژ ناچار بووم دایکم گوتوویەتی عەیبە بەخێرهاتنیان بکە، خۆمم پیشان نەداون، کارێکم کردووە، ڕووبەڕوویان نەبمەوە، ئێستاش ئەوە پاشماوەی هەر لەلام ماوە، ئەتوانم بڵێم نەمتوانیوە لەسەدا سەد بازنەکە بشکێنم یاخۆم واهەست دەکەم کە نەمتوانیوە لەوانەشە توانیبێتم و خۆم لەڕووی دەروونی خۆم

---

[342] ) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ١٥٩

[343] ) هاوژین سلێوە، ڕەهەندی دەروونی لەشیعرەکانی لەتیف هەڵمەت دا، ل ١٦٦

وا ئەگەیێنێ وام پێدەڵێ کە هێشتا ماوتە بیشکێنی." [٣٤٤] ئەم شەرمەش لەم شیعرەدا بەدەرکەوت کە لەنەستی شاعیر گیرساوەتەوە و لەڕێی شیعردا جارێکی دیکە نمایش کراوەتەوە.

شاعیر دەڵێ:

***ئێستا نەك تۆ، گشت منالێکی ئەو شارە***

***ئاوات خوازەی مەلەیەکە لەسەر رۆخی ئەو ڕووبارە...***

***تۆ ئەی کچە خەمبارەکە خەمبار مەبە***

***ڕۆژێ دادێ هەر دارێکی قەراغی وەند***

***بۆ هەزاران زۆردار دەکرێن بە سێدارە...***

***جا ئەو ساتە تۆش منالّ بەو***

***قورِو لمی وەندم تێگرە لەبەیانی تا ئێوارە***

***من وەك دایکت داخت ناکەم***

***من وەك دایکت لێت نادەم***

***دەستەکانت دەلێسمەوە و***

***تێر تێر ناو دەمت ماچ دەکەم...***

***لە ژێر باڵما دەتشارمەوە تا لەشت وشك دەبێتەوە...***

***شوێن جێکانی داخەکانت هێندە بە کوڵ هەڵدەمژم***

***تا لەبیرت دەچێتەوە...***

***دەبۆم بدوێ ئاسمانی شەوی سەروەندەت***

***جارانی زوو***

***چەندێ شین بوو...***

---

٣٤٤) دیدەنی: هاوژین سلێوە لەگەڵ لەتیف هەڵمەت، رێکەوتی ١٩/ ٣ / ٢٠١٢

دەبۆم بلوێ جیهانی منالّیی سەر وەندەت

چەندێ گەورەو بەرین بوو...

دە فێرمکە چۆن پاساری مەمکەکانت

دەستەمۆکەم...

دە فێرمکە چۆن پەپوولەی زامەکانت

بەرەلاّی باغی ئاسۆکەم...

گەر ڕووباری باسکەکانت ئاگریش بن

من حەز دەکەم پەنجەکانمی تێژەنم

خۆ فەرهاد نیم بەلاّم ئەگەر خۆشت بوێم

لەسەر هەموو تاوێرێکی ئەم ولاّتە

شیعرێکت بۆ هەلّدەکەنم

کچێ منی بێ دایك و بێ خۆشەویست

بووم بە هەورو هەر دلّۆپە بارانێکم...

گۆرانی بۆ ئافرەتێ وت

هیچ ئافرەتێ خۆشمی نویست

هیچ ئافرەتێ دەنگی ناخی هۆنراوەکانمی نەبیست

کە ڕۆخانە کەم کەم وەك شێت

شەوانی زستان هەلّدەچێت

گشت چۆڕێکی دەبێ بە مەم

گشت چۆڕێکی دەبێ بە دەم

گۆرانی بۆ چرای ژووری زینی گوندی نووستوو دەلّێت...

ڕۆخانە دێ و لەهاتنی شەوانەی دا

خێرو بێر و بەرات دێنێ

نە کچێ پێشوازی دەکاو نە مالّێکیش چرایەکی بۆ هەلّدەکاو مۆمی بۆ دادەگیرسێنێ

***منیش وەکو ڕۆخانە وام...***

***بۆ تۆ بوم بە چەمی زام***

***چۆلەکەی ئەو کەژانەش دێو تینوێتی خۆی لێ دەشکێنێ***

***کەچی کچێك نییە جارێ***

***ئەنگوستی سۆز بەسەر قژی گیای کەناری***

***چەمی شیعری مندا بێنێ..!***

***کچێ دوێ شەو تەنیا تر بووم***

***لە گشت شەوێ***

***خۆم هەڵدایە ناخی دیجلەی قوڵی خەوێ...***

***لە خەویشدا تۆ نەهاتیو هەر نەشهاتی...***

***کچێ ئاخر خەمی شاراوەی بێ تۆییم***

***کەمتر نییە لەبێ دایکیو بێ وڵاتی...*** [٣٤٥]

لە زیندە خەوێکدا، کە پانتای زەمەنەکانی بریتین لە ڕابردوو (*سەردەمی منداڵێ*) و زەمەنی ئێستا (*سووتان لە عیشقی کچێکدا*) و زەمەنی ئایندە (*سزادانی زۆرداران*) بەیەکەوە لە کەنار ڕووباری وەند و ڕۆخانە و دیجلە دا، دەقنووس (٢) دایك بەسەر دەکاتەوە، دایکێکیان کە لە هی شاعیر ناچێ و نەختێ بێبەزەییە، ئەو کچەیە کە خۆشی دەوێ. دایکەکەی دووەمیشی خاتوو سەعدییەی حەقیقییە. دەقەکە نەختێ هەناسە درێژە، باسی چەوسانەوەی کچی کورد دەکات لە بێئازیدا و نەفرەتی کەلتووری پاشکەوتەی وڵاتی خۆمان دەکات. پەیامەکانی زیندەخەونەکە زۆرن وەك (*ڕۆژێ دادێ هەر دارێکی قەراغی وەند/ بۆ هەزاران زۆردار دەکرێن بە سێدارە...*) هەروەها (*گەر ڕووباری باسکەکانت ئاگریش بن/ من حەز دەکەم پەنجەکانی تێژەنم*) دوایین پەیامیش: (*کچێ ئاخر خەمی شاراوەی بێ تۆییم/ کەمتر نییە لەبێ دایکیو بێ وڵاتی*). چونکە

---

[٣٤٥]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ١٤٥

شاعیر بە وخەیاڵە دەقەکەی دارِشتووە کە بۆ کچە خۆشەویستەکەی بخوێنێتەوە یان کچە خۆی بیخوێنێتەوە.

ئەو دەبێژێ:

***من شاعیرێکی منالم***

***جیاوازیش لە نێوانی من و***

***هەموو منالەکانی جیهاندا***

***ئەوەیە... کە:***

***ئەوان حەزیان لە: دایکیانەوە...***

***من حەزم لە تۆیە...*** [٣٤٦]

بۆ یەکەم جار خۆی لە منداڵان دیکە جیادەکاتەوە و هۆکارەکەشی بۆ بارودۆخێکی زۆر تایبەتمەندی دەگێڕێتەوە، وەك بڵێ لەم ساتەوەختدا یەکجار زۆر پەرێشان و سووتاو تامەزرۆی یارەکەیەتی، لەم دەقە دا جۆرە لێڵییەك (Ambiguity) هەیە: ئایا ئەو شاعیرە منداڵە، ئەو کچەی لە جێ دایکی داناوە یان لەجێی دولبەرەکەی! گەر بە منداڵی دابنێین، دەبێ دایك بێ. گەر بە شاعیریشی دابنێین، دەبێ دولبەر بێ.

شاعیر دەڵێ:

***بەرد نە هەست بەغەم و نە بەشادی ناکات***

***بەرد کەسی خۆشناوێ و***

***رقیشی لە کەس نییە..***

***بەرد دڵی نییە دڵداری بکاو***

***دەستی نییە رازی دڵ و نامەو هۆنراوە***

***بۆ دەزگیرانەکەی بنوسێ و***

---

[٣٤٦]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٣٤٠

***کۆلأن بە کۆلأن بە خەیاڵ دوای بۆنی پرچی***

***بکەوێ..***

***بەرد قاچی نییە ئەگەر یاساوڵ بۆی بچێ ڕاکات و***

***خۆی بزر کات..***

***دایکی نییە کە بمرێ بۆی بگری و***

***باوکی نییە ئەگەر لاساری کرد***

***هەڕەشەی لێ بکات***

***ولأتێکی تایبەتیشی نییە***

***کە لە پێناویدا خۆی بە کوشت بدات..***

***بەرد لە هەر شوێن و جێگایەکدا***

***خۆی دۆزییەوە***

***جێی خۆی دەکاتەوە و***

***توند توند پێوەی دەلکێ..!***

***بەرد هەرگیز یادی جێی ڕابوردوی خۆی***

***ناکاتەوە و***

***خەمی بۆ ناخوا..***

***ئەگینا ڕۆژێ لە ڕۆژان***

***بەردێك، نامەیەك، یا***

***شیعرێکی هەر دەنووسی..***

***لەگەڵ ئەوەشدا***

***وەکو پێشینان وتوویانە: ((بەرد لەجێی خۆی سەنگینە))***

***هەروەها مرۆڤیش.*** [٣٤٧]

---

[٣٤٧]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٢٩٦

شاعیر لەبەر ئازار و مەینەتییەکانی خۆی، پەنا بۆ بێ گیانەکانیش دەبا، لەم ئان و ساتەدا ئیرەیی بە بەرد دەبات، چونکە ڕۆحلەبەر نییە، خاڵییە لە هەست و هۆش. لە گوتەی: (*دایکی نییە کە بمرێ بۆی بگری*). ئەوا ئەو خەمە گەورەیەی شاعیر، کە خەمی مردنی دایکی و چەندان خەمی تری لەکۆڵ دەبووەوە گەر بەرد بوایە. شیعرەکە تەنها مەنەلۆگێکە لەگەڵ خودی خۆی، تاوتوێ نەهامەتییەکانی ژیانی پێدەکا. دێڕی یەکەم وانووسراوە: (بەرد نە هەست بەغەم و نە بە شادی ناکات)، داڕشتنەکە بەم شێوەیە بایە جواتربوو: (*بەرد هەست نە بەغەم و نە بەشادی دەکات*). دەقنووس دەڵێ:

***(فێڵ)***

***با بە لێوم لێوەکانت بسڕم***
***جێ ماچەکانی پێوەیە***
***نەوەك دایکت ببینێ.*** [348]

گوتراوە، لە هەموو ئان و زەمانێکدا، دایك یەکەم کەسە هەست بە بوونی خۆشەویستی لە دڵی کچەکەیدا دەکات، ڕەنگ بێ ئەمە دیاردەیەکی سروشتی و غەریزە بێ، یان دەرهاویشتەی ئەزموونی تافی هەرزەکاری خۆی بێ و دەرسی لێوەرگرتبێ. ئەو دایکەی لێرەشدا باس کراوە، دایکی کەسانی دیکەیە، ئەو دەیەوێ ئاساوەراری ماچەکانی لەسەر لێوی کچەکە بسڕێتەوە، بەڵام بە دەسماڵی ئاوریشمین و لۆکە و کاغەز نا، بەڵکو بەلێوەکانی خۆی. ئەوە مانای وایە بە بەردەوامی، دەبێ لێو لەسەر لێوی هەڵنەگرێ، چونکە ئەو لێوەی دەیەوەی شوێنی ماچەکان بسڕێتەوە، ئاساوەرای خۆی لەسەر لێوە ماچکراوەکە بەجێدەهێلێ. وشەی (فێڵ)، کە ناونیشانی دەقەکەیە، نازانین شاعیری دەیەوێ فێڵ لەو کچۆڵە سادە و ساکارە بکات، یان خۆیان فێڵ لەیەکتری دەکەن، تا زۆرترین ماچ ماچانێ بکەن.

---

[348]) سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣٢٨

پووختەی تەوەرە:

جگەلە خاتوو سەعدیە، ژمارەیەکی زۆر لە دایکان لە دەقەکانی شاعیردا دەبینرێن، لە هەر دەقێکدا بۆ مەبەست و پەیامێکی جیاواز تەوزیفکراون. چونکە دایك، هەر دایکێك بێ، چەندان سیفەت و خەسڵەتی گەردوونی تێدایە، کە لە کەسان و گیاندارانی دیکەی نییە و لەوانی جیاواز دەکاتەوە. دەقنووس هەوڵی داوە سوود لەو سیفەت و خەسڵەتانە وەرگرێ، ئەو وشەی (ژن و ئافرەت) لە جێی دایکەکان دانەناوە، چونکە ئەوەی لە وشەی (دایك)دا حەشاردراوە زۆر جیاوازە لەگەڵ وشەکانی دیکەی جیهانی مێینە.

## ( ١٨ )

## دایـك، وشـە و كەرەسـتە

لە نووسینی ئەدەبی ڕەسەندا، بە زارەكی و نووسراوی، هەمیشە تۆقەڵە یان لوتكە یـان پۆپەیەكی دیاری كراو دەستنیشان دەكرێ وەك خاڵی وەرچەرخان و گەیشتن بە ترۆپكی گوزارشتی مەبەست، لەوێدا جوانی و هونـەر و مانـا و داهێنـان كۆدەبنـەوە و وەك موگناتیس پـەیامگر بۆخۆی ڕادەكێشـێت و سـەرگەرم و سەرمەسـتی دەكـات. ئـەم ترۆپكـەی پێـدەگوترێ (پۆپـەی ئەدەبی Literary Climax)، كەواتە ئاساییە كە لە یەك نووسیندا یان لـە یـەك دەقەشـیعردا، چەندان ئاستی دارشتن و ڕێزمان و زمانەوانی جیاواز لە ناوی بازنەی یـەكێتی بابەتـدا وجودیـان هەبێ، بەواتایەكی دیكە ناكرێ لە خوێندنەوە و شیتەڵكاری بۆ دەقێكی ئەدەبی هەر هەموو وشە و بڕگە و دەستەواژە و ڕستەكانی بە شاكار و داهێنان دابندرێ. زۆر ئاساییە كە ئەوانـە، هێنـدە ساكارانە خۆیان بنوێنن لە پەخشان و شیعرێكی هاكەزایی بچن. بەڵام بەو واتایە نا كە بێ نرخ و بەهان.

جاران بەنناكان، لە كوردستان لە جیاتی بلۆك و كـەرپووچ، بـەرد و گەچـییان بـۆ خـانوو دروستكردن بەكار دەهێنا، جا هەمیشە، كرێكارێكی شارەزا بە ناوی خەلفە، لـە نزیـك وەسـتا، بەردەستی دەكرد، ئەو خەلفەیە پێشوەخت دەیزانی و دەیخەملاند ئەو شوێنە چ جۆر بـەردێك و چ شێوەیەك و چ قەبارەیەكی دەوێ، زووتر بەردەكەی ئامادەدەكرد، كە وەستا دەیگوت: بەرد، ئـەو یەكسەر بەردەكەی بۆ هەڵدەدا و وەستاش لەدوای ئەمدیو ئەودیوكردنێكی خێرا، بـەجوانی قـنچ بەردەكەی لە شوێنی پێویست دادەناو لەسەر كارەكەی بەردەوام دەبوو. هەڵبژاردنی هێندێك وشە

لە نووسین و شیعردا وەك ئەو بەردە وایە، بۆ ئارایشت و جوانكردنی دیوارەكەیە، یان بۆ ڕاستكردنەوە و پارسەنگی دیوارەكەیە، یان بۆ پڕكردنەوەی كەلێن و تەواوكردنی دیوارەكەیە، بەردەكە نرخی خۆی هەیە، بەلآم وەك ئەو بەردە نەقار و سەنگین و دیارانە نییە، كە زۆر لەبەرچاون و برِبڕەی پشتی دیوارەكەن.

بە كوردی و كرمانجی، لە كۆبەرهەمی شیعری لەتیف هەڵمەتدا، وەكو كۆبەرهەمی هەر شاعیرێكی دیكە ـ هەر هەموو (دایك)ەكان یەك قورسایی و سەنگ و بایەخەیان لە دارِشتنەكاندا نییە. ئەوە بیرۆكە و ناوئاخنی دەقەكەیە، مەقامی ئەو وشە و جێگەكەی دەستنیشان دەكات. لەم دەقانەی خوارەوە ـ كە سەرپێیانە ئاماژەیان پێدەدەین ـ وشەی (دایك) حزووری هەیە، بەلآم دەكرێ شاعیر وشەی دیكەیش لە جیاتی ئەو وشەیە بەكار بێنێ و سیاقی دەقەكەش نەگۆڕی. بەلآم ئەوە شاعیر بڕیاری هەڵبژاردنی وشەكە دەدەات، نەك ڕەخنەكار و خوێنەر. با بە نموونەیەك ئەم خاڵە ڕوونتر بكەینەوە:

دەقنووس لە دەقەشیعرێكدا دەنووسی:

***ئەستێرەیەكی نوێ***

***ئیتر شیرین واز لە دڵدارەكەی دێنێ***

***هەموو نامەو دیارییەكانی فەرهادەكەی***

***دەسووتێنێ***

***ئیتر شیرین چاوەكانی كلڕێژ ناكاو***

***پەنجەكانی نانەخشێنێ***

***بسكی گوڵاوپژێن ناكاو***

***قژو پەرچەم داناهێنێ***

***<u>ئیتر شیرین بۆ لای دایكی ناڕواتەوە</u>***

***دڵۆپەیەك ئاوی ئەڵوەن ناخواتەوە***

***ئیتر شیرین دەستی سواڵی***

***سواڵکەرانی ئەم زەوییە ناژمێرێت و***

***باران لەشی تەڕ ناکات و***

***رۆژنامەو گۆڤار ناسێنێ.***[٣٤٩]

با ئێمە بە ئیجازەی شاعیر دەستکارییەکی ئەم دەقە بکەین ـ بۆ شیکردنەوەی خاڵی مەبەست ـ و لە جیاتی:

***ئیتر شیرین بۆ لای دایکی ناڕواتەوە***

***دڵۆپەیەك ئاوی ئەڵوەن ناخواتەوە***

*بنووسین:*

***ئیتر شیرین بۆ زێدی خۆی ناڕواتەوە***

***دڵۆپەیەك ئاوی ئەڵوەن ناخواتەوە***

یان بڵێین:

***ئیتر شیرین بۆ هەواری جاری جاران ناڕواتەوە***

***دڵۆپەیەك ئاوی ئەڵوەن ناخواتەوە***

یان بڵێین:

***ئیتر شیرین بۆ ماڵەکەی داپیرە ناڕواتەوە***

***دڵۆپەیەك ئاوی ئەڵوەن ناخواتەوە***

[٣٤٩]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٤٤٦ (ئەم شیعرە کاتی خۆی بۆ کچە شەهیدی نەمر (لەیلا قاسم) گوتراوە، بەڵام من لەترسی سانسۆر (لەیلا)م کردووە بە(شیرین) ـ لەتیف هەڵمەت).

لە هەموو ئەم دەقانەی کە تۆمارکراون، دایك وەك وشەیەکی سادە و سـاکار و ئاسـایی بەبێ ئارایشتکردن و خۆ ڕازاندنەوە نازکردن خۆی دەنوێنێ و دەبێتە بەشێك لە پێکهاتەی دەقـە شیعرەکان:

***مناڵی ساغ بە باوەشی دایکییەوە***

***لە تینوانلدا گەرووی هەڵدەوەرێ..***

***شتی تریش و***

***شتی تریش وەکو... خۆتان دەزانن.***

***- کوڕە بێ دەنگ بە..***

***نەبا خوانەخواستە نەخۆشی بتلۆزێتەوە و***

***بچیتە بەر دەستی دکتۆرێك***

***من سوێندم خوادووە***

***بە خاکی نیشتمان***

***بە گلکۆی شەهیدان***

***بە وشەی جوان***

***بە نێرگزی دەوروبەری بەردەقارەمان***

***هەمیشە قسەی ڕاستی...*** [٣٥٠]

*****

***(پیرەژنێك لەکفری وای دەگوت)***

***خۆر چەند گوناحە مانگی***

***چواردەی نەدیوە/ مناڵێك لەسەر بەلەمێکی کاغەز وێنەی***

***خۆیو دایك وباوك و خوشکەکەی کێشا و خستییە***

---

(٣٥٠) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٥٦٧

*دەریاچەی ئیجەوە.. لەوانەیە ئێستا بەلەمەکە گەیشتبێتە لووتکەی گۆیژە/ بەهەورم گوت لێرە چاوەڕوانی چی دەکەی؟/ گوتی تەکسی یەکەم دەوێ بمگەیەنێتە...* [351]

*** 

*(لەو ژوورەدا)*

*سنگەکە و پاڵتۆکە لێکتر بێزاربوون بەدزی یەکترەوە لێم دەپرسن کەی زستان دێ/ هەتاو و دەریا پێکەوە نوستوون/ پیرەژنە جادوبازەکە دەڵێ مناڵێکیان دەبێ ناوی دەنێن باران/ کاتژمێری سەر مێزەکە منگەمنگ دەکات/ ڕەنگە بلێ برسیمە/ یا لەوانەیە تەلەفۆن بۆ دایکی بکات لە هەندەران/ ئەو شەوە پەیژەکەم بەرە و باڵەخانەی ڕۆحم بەرزکردەوە.* [352]

***

*(ئەرخەوانەکەی هاوڕێم)*

*ئەرخەوانێك... لەسەر ترۆپکی چیایەك*

*دەم و دەستی دوو دڵداری لە سای خۆیدا*

*گەیاندە یەك...*

*هەر وەك دایکێ مناڵێکی لەبار بچێت و*

*بۆی بگری*

*ئاوا فرمێسك لە چاوی‌دا لانەی کرد و*

---

[351] دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٨٠٨

[352] سەرچاوەی پێشوو، هەمان لاپەڕە

*قژ و بسکی قەف قەف ڕنی..*
*- ئەی ئەرخەوانی لووتکەی بەرز*
*بۆ دەڕژێنی فرمێسکی سەوز*
*ئەم گریانە کێوی و بەترەفەت بۆ کێیە*
*کویێ خۆشترە ئەڵەم جێیە..؟*
*- پار ئەم وەختە*
*ئەرخەوانێك هەر بەقەی خۆم*
*لە تەنیشتما پێدەکەنی و نەختە نەختە*
*لێم دەئاڵاو*
*دەمی وەکو شووشەی گوڵاو*
*لەدەم دەنام*
*شاد شاد دەبوو هەموو تۆزقاڵێکی باڵام*
*نیوە شەوێکی کپ و مات*
*ڕەشەبایەك هەڵی کرد وەك: سەد هەزار پاچ*
*لەتوێی گەرووی ئەرخەوانەکەی هاوڕێمدا کوشتی لەرەی سەدان هەزار گۆرانی و ماچ...!* [٣٥٣]

پووختەی تەوەرە:

لە چەند دەقێکدا وشەی دایك وەك پارسەنگ و ئارایشت و تەواوکەری دێڕەشیعر و بڕگە و دەستەواژەکان مامەڵەیان لەگەڵدا کراوە، ئەمەیش ڕەهەندێکی ئاسایی نووسینە و هیچ لە بەها و نرخی (دایك) و بەرهەمەکەی دەقنووس کەم ناکاتەوە. لە کۆنەوە لە هەموو ڕشتە ئەدەبییەکاندا ئەم جۆرە تەکنیکە پەیڕەوکراوە و دەکرێ.

---

[٣٥٣]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٥١٨

## ( ١٩ )

## دایـکە ناجـوانـەکان، ناشـیرینکراوەکان

هەرچەندە ناونیشانی تەوەرەکە ڕەزاقورسە، بەڵام چونکە (ناجوانی یان ناشیرینی) تەواوکـەری ڕووە درەوشاوەکەی جوانییە، دەزانین بـەبێ بـوونی ناشـیرینی قـەدر و پایـەی جـوانی نـازانین، ناچاربووین تەوەرەکە وەك خۆی پێشـکێش بکـەین. خـۆ خـودی ژیـان لەسـەر ئـەم بنەمایانـە دژبەیەکە دامەزراوە لەوانە: خوا و شەیتان، بوون و مـردن، ڕەش و سـپی، شـەو و ڕۆژ، تـاڵ و شیرین....بۆیە ئەشێ لەجیهانبینی شاعیران و فەیلەسوفان هەموو دایکەکان جوان نەبن، جـوان نەبوونیش تەنها شکل و شێوەمان مەبەست نییە، بەڵکو جوانی ناوەوەشمان گەرەکە.

چـەمکەکانی (جـوان و ناشـیرین) و (چـاك و خـراپ)، زۆر دەمێکـە کـۆی مرۆڤایـەتییان بەخۆیانەوە سەرقاڵ کردووە، بەڵگەش ئەو سەدان هەزار کتێب و تۆمارگەنە کە لەسـەر ڕەفتـەی کتێبخانەکانی پاڵیانداوەتەوە و ڕۆژ لەدوای ڕۆژیش لە زاوزێکردندان. هۆکارەکەشی ئەوەیە، ئەو چەمکانە هیچیان ڕەها نین. بە گوێرەی دیدی ئایین و کەلتوور و فەلسەفە و مەعریفەی کـەس و کۆمەڵگاکان دەگۆڕێن و هەر یەکەی بە گەزی خۆی دەیانپێوێ و بە تەرازووی خۆی دەیانکێشێ، ئاکامەکەشی ئەو خەرمانە کەڵەکەچنە هەمەڕەنگەیە لە پێناسە و ڕاڤە و بۆچوون و لێکدانـەوە کە بۆ چەمکەکان کراون.

رۆمانووسی عەرەب دکتۆر تورکی ئەلحەمەد دەنووسێ: "جوانی و ناشیرینی لە خودی شتەکاندا نین، بەڵکو لە خودی مامەڵەکردنی ئێمەیە لەگەڵ ئەو شتانە، سەرەڕای ئەو بارودۆخەی شتەکانیان لەخۆ گرتووە." [٣٥٤]

ئەم گوتەیەش تا ڕادەیەك تەمومژیی و لێڵی ئەو هۆکارانەمان بۆ دەڕەوێنێتەوە، کە بۆچی لەتیف هەڵمەت لەدوای ئەو هەموو مەدح و ستایشەی دایك، لە چەند دەقێکدا چەند دایکێك بەو ڕوخسارە جوانانە نیشان نادات کە ئێمەمانانی پێ ئاشناکردووە. هەرچەندە ئێمە دەزانین، کە دایك مرۆڤە پێش ئەوەی دایك بێ، خاڵێ نییە لە زۆر لە سیفەتە گەردوونییەکانی مرۆڤ لە جوانی و ناشیرینی، لە چاکە و خراپە.

لەم دەقەی خوارەوە، ئەوە دایکێکی ناشیرین نییە دەقنووسی هاندابێ، بەم شێوازە گوزارشت لە بارێکی تایبەتمەند بکات. ڕەنگ بێ دەروونناسان، شیکاری ئەو دەقە بەوە لێکدەنەوە، کە ڕەنگ بێ دەقنووس بۆخۆی قوتابییەکی کڵۆڵ و لاواز بووبێ لە ڕشتەی (ماتماتیك و حیساب و ئەندازە و جەبر). کەواتە ئەوە بارودۆخەکەیە دایکەکەی ناشیرین کردووە. سەرنج بدەن دەقنووس چی نووسیوە:

***من ماتماتیك دەناسم چ قەحپە دایکێکە/ زۆرجار بەدار لاستیکێکەوە منالان راودەنێ و نایەڵێ روو لەقوتابخانە بکەن من خۆم جارێکیان ئەوم بینی: کچە قوتابییەکی زانکۆی بردە سووچێکی تاریکەوە/ وام زانی بەتۆزێ ڕووتی دەکاتەوە/ بەڵام بەچاوی خۆم دیم پەپوولەیەکی گەورەی گرتوو خستییە توێی دەفتەرەکەی کچە قوتابییەکەوە/ لەوە زیاتر چی دیم نەدی، بەڵام بەچاوی خۆم بیستم/ کچەکە گوتی: بەم زستانە ئەم پەپوولە جوانەی لەکوێ بوو..!*** [٣٥٥]

---

[٣٥٤]) https://www.goodreads.com/quotes/tag/ugliness

[٣٥٥]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٨٦٣

لەسەردەمی هەرزەکاری لـەتیف هەڵمـەت، وابـاو بـوو کـە کـوڕ و کچـی قوتـابی کتێـب و دەفتەرییان لە یەکتری دەخواستەوە، سەردەمەکە وەك ئێسـتا نـەبوو، هـەر ئەوەنـدە تەرفـەتیان هەبوو گوڵێك یان پەپوولەیەك بخەنە نێو دووتوێی کتێب و دەفتەرکان وەك نیشانەی خۆشەویستی و سۆزداری. ڕەنگ بێ ئەمەش یادەوەرییەکی شاعیر بـێ. ـ ئـەم ڕوونکردنـەوە ڕەنـگ بـێ بـۆ خوێنەری ئیمڕۆ پێویست بێ.

دەقنووس دەبێژێ:

***ئەی شوانە گێلەکە***

***با ئاگردانەکە نەکوژێتەوە***

***دوایی گالێسکەی باهۆڕ***

***خۆڵەمێشەکەی دەدزێ و بەجۆبارەکەی دەبەخشێ...***

***تۆ ئەوەندە دڵڕەقی***

***ڕەنگە دایکت لەورچێکی نێرینە***

***تۆی بووبێ***

***ئەی دڵ بۆ کوێت ببەم/ منت کردووە بەئاژانی خۆت***

***ئەی دڵ بۆ کوێم ئەبەی/ ئەمە کۆچێکی (ستەور)ە***

***ئەی دڵ بۆ کوێ بچین***

***ئەی کات بۆکوێت هەڵگرم...؟*** [٣٥٦]

ئەم دەقەی پتر لە شیکردنەوەیەك هەڵدەگرێ، شوان، لێرەدا (ڕەمز)ە و هەر بۆ ئـەو کەسـە نییە کە سەرپەرشتی میگەلە مەڕو بزن دەکات، ئاگرەشوانی شەوانی زستان لـە لـە فۆلکلـۆری کوردیدا، ڕەنگیداوەتەوە، جـا دەقنـووس ئـەو ترسـەی هەیـە شـوانەکە نـەفام و گێـل بێـت و کوژانەوەی ئاگرەکەی بەلاوە گرنگ نەبێ، لە کاتێکدا، شاعیر ئەو ترسەی هەیـە (خۆڵەمێشـی)

---

[٣٥٦]) سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٢٣

ئاگرەکە بەدەم باوە، پەرش وبڵاببێتەوە و (وەچەی ئاگرەکە) ببڕێتەوە. ورچی نێرینە، دیمەنی ئـەو دایکە ناشیرینەیە، کە لەگەڵی جووت بووبێ، هەرچەندە شاعیر تیر بۆ (شوان)ەکە دەهاوێ، بەڵام بە ئەنقەست و بێئەنقەست سینەی (دایك) دەپێکێ. ئەو خاڵـەی ڕەخنـەکار دەبـێ هەڵوەسـتەی لەسەر بکات، ئەوەیە لێرەدا دایکەکە ناشیرین نییە، بەڵام بۆ مـەرامێکی مەبەسـتدار ناشـیرین دەکرێ. ئاخر کە دەڵێ: (*ڕەنگە دایکت لەورچێکی نێرینە/ تۆی بووبێ*)، سـووکایەتیکردنە هـەم بە شوانە گێلەکە و هەم بە دایکی شوانەکە. بۆچی ئەو دایکە ئامادەبووە لەگـەڵ نێرەورچـێکدا بخەوێ و سەرنوێنی بکات ؟!

لە دەقێکی دیکەدا ئەوەتا شاعیر دەڵێ:

***جارێکیان دایکێك منداڵەکەی خۆی لە بەهەشت دزی بوو***
***لەگەڵ خۆیدا بۆ دۆزەخی بەرێ..***
***پاسەوانەکانی دۆزەخ حەوت مانگ***
***پشووی دۆزەخیان لێ قەدەغەکرد***
***جارێکیان شاعیرێك***
***شیعرێکی بە دیوارێکی بەهەشتدا هەڵواسی بوو..***
***ناوی نابوو هەفتەوەری دۆزەخ***
***پەرییەکان پێی پێکەنی بوون و***
***بەپاڵ تووڕیان دابۆوە ناو دۆزەخەوە...*** [٣٥٧]

لەم دەقەشیعرەی سەرەوەدا، دوو جار ڕووی دایکەکە ناشیرین کراوە: جارێ بەوەی کە دزی دەکات، خۆشتان دەزانن لە کەلتووری کوردەواری دزی، کردەیەکی ناشیرین و نەفرەت لێکراوە و دز هەمیشە بە چاوی سووك سەیر دەکرێ. لەلایەکی دیکەوە، دایکەکە فڕێدراوەتـە دۆزەخ، جـا بەگوێرەی، پەیام و گوتارەکانی ئایینەکان، دۆزەخ تەنها مـەنزڵگای گوناحکـار و بێـدین و ئـەو

---

[٣٥٧]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٩١٢

کەسانەیە کـە لەبـەر خراپـە و خراپـەکاری خۆیـان خـودا نـەفرەتی لێکـردوون و بـەو سـزایەی گەیاندوون. لێرەدا دوو کەوانە دەکەینەوە: دەقنووس دژایەتی ئەو گوتەییەی کردووە کە دەڵێ:" بەهەشت لەژێر پێی دایکان دایە."،بەڵام دانـانی منداڵەکـە لـە بەهەشـت، ئاماژەیـە بـۆ ئـەو بۆچوونەی کە لە زۆربەی ئایین و کەلتوورەکان باسدەکرێت، کە منداڵ کاتێك کۆچ دەکات ڕۆحـی بۆ ئاسمان بەرزدەکرێتەوە و دەبێتە پەپوولە و تەیروتواری بەهەشت.

ئەم دەقە تارای سوریالیزمی پۆشیووە و پـتر لـە ڕاڤەیـەك هەڵـدەگرێ، دەکـرێ بخرێتـە تـای تەرازووی ڕەخنە و سکاڵا لە کۆمەڵگا و ئایین!

شاعیر تۆڕەیە و چەندان پرسیار دەورووژێنێ و دەڵێ:

***(جادوو)***

***خوایە چ جادووبازێك***

***جادووی لەدایکانی ئەم سەدەیە کردووە***

***منداڵی خەساویان دەبێ***

***منداڵی سەروریش سپی***

***دەس بەگۆچان***

***ئیفلیج***

***دەبێ ئەم منداڵە پیاوە سەقەتانە***

***هەستی زایەندیان هەبێ؟***

***دەبێ حەز لەمێینە بکەن؟***

***ئاخۆ بەچی لەگەڵ مێینەدا***

***جووت دەبن***

***بەزمان***

***یا بەلووت***

***یا بەچەنجە***

***یا بەگۆچانەکەی دەستیان؟***

***ئافرەتی ئەم سەدەیە***

***چەند بەدبەختن***

***ئاتاجی پەنجەی پیاوێکی ئیفلیج و***

***ئامێرێکی نێرینەی لاستیکن..!***

***کەس باسی پیاوە حەشەرییەکانی***

***سەدە رابردووەکانیان بۆ نەکات***

***نەوەك تف لەسەرجەمی***

***پیاوانی ئەم سەدەیە بکەن و***

***بەکۆمەڵ خۆیان بکوژن...***

***جا ئەوسا منداڵانی تەمەن سەد ساڵ***

***عاشقی چی بن...؟*** [358]

---

[358]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ١٠٥ ـ ١٠٦

لەم دەقەشیعرەشدا، دەقنووس بە ئەنقەست و لەبەر بارودۆخێکی نادیار و نەزانراو، دایکەکان ناشیرین دەکات، هەرچەندە ناشیرینییەکە پتر لە ڕووی نێرینەکاندا شەوق دەداتەوە. دەقنووس، بەزمانێکی پیس، ڕیزبەندێك لە وشەی چاوەڕوان نەکراو لە دەقەکەیدا تەوزیف دەکات، تا خراپتر نێرینەکانمان لەبەر چاوبکەوێ. تووڕەیی شاعیر گەیشتۆتە، ئاستێك بۆخۆشی ناتوانێ ڕێ لە لێشاوی وشە ناشیرینییەکانی بگرێ و بەربەستێکیان بۆ دانێ. ئەمانە چەند وشەیەکی نێو دەقەکەنە: (*جادوو/ جادووبازێك/ منداڵی خەساو/ دەس بەگۆچان/ ئیفلیج/ پیاوی سەقەت/ ئاخۆ بەچی لەگەڵ مێینەدا/ جووت دەبن/ بەزمان/ بەلووت/ بەچەنجە/ بەگۆچان/ پیاوێکی ئیفلیج/ ئامێری نێرینەی لاستیك/ تف*).

پووختەی تەوەرە:

واهەست دەکەین کە بارودۆخی تایبەتی ژینگەیی و کۆمەڵایەتی و دەروونی، شاعیری بۆ نووسینی چەند دەقەشیعرێك هاندابێ، کە تێیاندا دایکەکان ناجوان و ناشیرینکراو دێنە بەرچاو. لە شیکردنەوەی واتاکان و وێنە هونەرییەکان، تێدەگەین کە ئەوە نێرینەکانن بوونەتە هۆکاری ناشیرینکردنی ئەو دایکانە، هەرچەندە خۆشیان بە ئەنجامدانی ئەو کارە ناشیرینتر بوون. لەم دەقانەوە ئەوەمان بۆدەردەکەوێ، کە دایکی شاعیر هەمیشە جوانە، ئەوە هەندێ مێینەی ترن، هەندێ دایکی دیکەن ناشیرینن.

## بـەشی پێنجەم

# دایك لە "دیوانی منداڵان"ی (لەتیف هەڵمەت)دا

*(واهەست دەکەم من هەرمناڵم، هەست دەکەم مناڵم و بۆئەوان دەنووسم.)*

*(لەتیف هەڵمەت)*

## تــەوەرەی یەکەم

### ١- بانیژەی جیهانی ئەدەبی منداڵان




**شــیعری منداڵان لە کۆبەرهەمی (لەتیف هەڵمەت)دا:**

لێکۆڵینــەوەکان، گەشــانەوەی شــیعری منــداڵان لــە ئــەدەبی کوردیــدا، بــۆ ســەردەمی سەرهەڵدانی ڕەوتی شــیعری نــوێی کــوردی لەســەر دەســتی گــۆران و شــێخ نــوری شــێخ ســاڵح دەگەڕێنەوە، لەگەڵ ئەو قۆناغە و دواتر، (٣) گۆڕانکــاریی بەرچــاو بەســەر شــێواز و نــاوەڕۆکی شیعری منداڵانی کوردی داهات:

١) زمان و قالب و پەیامی شیعرەکان نوێکارییان تێداکراوە، هەوڵی جددی درا لە نزیك کردنەوی شیعرەکان لە ناخ و دەروونی منداڵەکان و ئاشناکردنی منداڵانیش بەو جۆرە شیعرە.

٢) شیعری منداڵان لە چوارچێوەی لایەلایە و پێدا هەڵگوتن و بە ڕەمزکردنی پەیامەکان دەرباز بوو. ناوئاخنی شیعرەکان بە بابەت و پەیام و ڕۆشنبیری و زانیاری فرەچەشن دەوڵەمەندکران. جیهانی شیعری منداڵان بوو بە جیهانێکی شموولی هەموو هەسارەی تێدا کۆکرایەوە لە سروشت و ژینگە و بوونەوەرەکان و جوانی و ئامۆژگاری و وریاکردنە و جۆشدان و هاندان بۆ خۆشەویستی شتە جوانەکانی ژیان و خاك و نیشتمان و نەتەوە و مرۆڤایەتی....

٣) هونینەوەی شیعر بۆ منداڵەکان بوو بە خەم و ئەرکی شاعیران، هێندێکیان نەك هەر کۆبەرەهەمەکانیان بە شیعری منداڵان ڕازاندەوە، بەڵکو بەرهەمی سەربەخۆیان بۆ منداڵان ئامادە کرد. ئەم دیاردەیە تا ئێستاش بەردەوامی هەیە. هەڵبەتە ئەمەیش کتێبخانەی شیعری منداڵانی دەوڵەمەند کرد. چاپکردنی گۆڤاری تایبەت بە منداڵانیش پەنجەرەیەکی دیکە بوو بە ڕووی ئەم شیعرانە کرانەوە.

لە شیعری نوێی و هاوچەرخی کوردیدا، لە ئاماژەکردن بە شیعری منداڵان ناوی چەند شاعیرێك پتر درەوشاوەن، هەم لە زۆری بەرهەمەکانیان و هەم لە داهێنان و ئەفراندن لەو بەرهەمانەدا، بۆ نموونە: ع. ع. شەونم، دایکی گەلاوێژ، کاکەی فەلاح، شێرکۆ بێکەس، عەبدوڵا پەشێوە، ڕۆستەم باجەلان، کازم کۆیی، ڕەزا شوان، ڕۆستەم خامۆش، کازم کۆیی، محەمەد دارياس... بەڵام کاتێك کۆبەرهەمی شیعری منداڵانی لەتیف هەڵمەت دەخوێنینەوە، دەگەینە ئەو ئاکامە کە ئەو:

- لەوەتی یەکەم شیعری بۆ ئەوان نووسیوە، نەك ماندوو نەبووە و بێزار نەبووە، بەڵکو بەردەوام لە هەوڵی داهێنانی هونەری و شیعری و زمانەوانی لە دەقەکانیدا بۆ ئەوان.
- دەقە شیعرەکانی فرەبابەت و دەنگ و ڕەنگن و باڵاپۆشن بە هونەر و ڕاستگۆیی ئەدەبی.
- دیاردەیەکی ناوازە لە دەقەکانیدا بەدیدەکرێت کە هەمیشە هەست دەکەی شاعیر منداڵە و شیعرەکان بۆخۆی دەنووسێ، یان منداڵەکان، هەرزەکارن و ئەوان شیعرەکان بۆ ئەو دەنووسن.

لەتیف هەڵمەت، لە کتێبی (چۆن وچی بۆ منداڵ بنووسین) کە لە ساڵی (٢٠١١) چاپ کراوە، ئەزموون و بیروبۆچوونی خۆی دەربارەی ئەدەبی منداڵان و شیعری منداڵان بە خەست و خۆڵی شیکردۆتەوە، دەکرێ ئەم کتێبە وەك مانفێستی ئەو شاعیرە بۆ شیعری منداڵان وەربگرین.

ئەوەی کە پەیوەستە بە لێکۆڵینەوەکەمان لەو چوارچێوەی (شیعری منداڵان) ئەم ئاکامانـە لـەو کتێبە و چاوپێکەوتنەکان هەڵدەهێنچین:

- ئەو هۆکاری نووسـینی شـیعری منـاڵان بۆئـەوە دەگەڕێنتـەوە، واهەسـت دەکـات ئـەو هەرمناڵە، هەست ناکات گەورە بووە، هەست دەکات مناڵە و بۆئەوان دەنووسێ، دەزانـێ ئـەوان چیان بەدڵە.

- قۆناغی سەردەمی منداڵی کاریگەری ڕاستەوخۆی لە سەر دید و تێڕوانیـی ئـەو هەیـە و هەمیشە لەبیری ئەوەدایە کە قۆناغی سەردەمی منداڵان جوانتر و خۆشتر و پـاکتر و ئاسـوودەتر نمایش بکات بۆ نەوەکان.

- لە دیدی ئەو، جوانی و پیرۆزی و خۆشی ئاینده، لە دەست منـداڵ دایـە، بۆیـە بـۆ ئـەو ئایندەیە دەبێ نەوەیەك پەروەردە و ئامادەبکرێت، پڕ چەك و تیفاق بـێ و بتـوانی ڕابەرایـەتی و پێشەنگی نەتەوە و مرۆڤایەتی بکات.

- هەمیشە وا هەست دەکات، ئەو جیاوازە، بیر و پەیام و خەون و دیدگـەی نـوێ و تـازە و داهێنەرانەی لە شیعرەکانیدا حەشارداوە، بە واتایەکی دیکە، وا هەسـت دەکـات ئـەوە توانـا و بەهەرەیەکی تایبەت و ناوازەی هەیە نابێ بەفیڕۆی بدات.

- بە زمانی منداڵانیشەوە. زۆر گوزارشتی ئەدەبی لە بارەی سیاسەت و کوردایەتی و زانـین و مەعریفە و پەیامە دەروونی و ڕۆحییەکانی گەورەکانی کردووە. لە جیهانی منداڵانـەوە بـەرەو جیهانی مرۆڤایەتی هـەنگاوی دیـاری ناوە.لـەتیف هەڵمـەت هەمیشـە هەوڵیـداوە شـتی نـوێ بۆمناڵان بنووسێ، ئەوەتا خۆی دەڵێ: "جێی داخـە زۆربـەی نووسـەرانی منـداڵان هـەر بابەتـە کۆنەکان دووبارە دەکەنەوە"[٣٥٩]

---

٣٥٩ )لەتیف هەڵمەت، جۆرەکانی نووسین بۆ منداڵان، چ١، چاپخانەی رەهەند، ٢٠١٦، ل١٤

لــە ڕاســتیدا. کۆبەرهــەمی شــیعری منــداڵانی لــەتیف هەڵمــەت لێکۆڵینــەوەی ســەربەخۆ هەڵدەگرێ، لێ ئێمە لێرەدا ڕەهەندەکانی نووسینەکەمان تەنیا دەربارەی زاراوە و چەمکی (دایك و دایکایەتی) لە شیعری منداڵانی ئەودا تەرخانکردووە.

## ٢- بۆ لــەتیف هەڵمــەت (دایــك)ی لــە شــیعری منــداڵانیش کردۆتــە چــراوگ و مەشــخەڵی شیعرەکانی؟

خوێنەری ئازیز، لە بەندی یەکەمدا بە وردی قسەمان لەسەر ئەوە کرد کە چۆن دایك وێنــە (Mother - Image) دەبێتە خودوێنە (Self-Image)، هەروەها بۆچی لــەتیف هەڵمــەت ناتوانی (دایك)ی لەبیرخۆی بەرێتەوە و کردویەتی بە شاڕەمزی شیعرەکانی. لە بەندی دووەمیشدا پووختەیەکمان دەربارەی ئەو بڕگانە خستە ڕوو: بۆ هەر دایك؟/ دایکی لەتیف هەڵمەت/ لــەتیف هەڵمەت و دایك ((قوناغی منداڵی/ قوناغی هەرزەکاری/ قوناغی کامڵبوون/ قوناغی شــاعیری/ دایك لە جیهانبینی شیعریی لەتیف هەڵمەتدا.)) جا بۆئەوەی زانیارییەکان دووبارە نەبنەوە تەنیا ئەم چەند پەرەگرافە ئیزافە دەکەین:

لەســەرەتای تەمەنییــەوە تــاکو ئــەم چــرکە ســاتە (٢٠١٨)، دایــك خۆشەویســترین و نزیکترین بونەوەر و هاوڕێ و دۆســتی لــە تیــف هەڵمەتــە، تەنانــەت زۆر لــە شــیعرە دڵــداری و ڕۆمانسییەکانیشی سێبەر و سیمای دایکییان پێوە دیارە، چونکە شاعیر درك بەوە دەکات کە بۆ منداڵی کورد تا تەمەنی هەرزەکاری، لە شار و دێ، لە چینی خواپێدا و چــینی ڕەش و رووتــدا، کەس نییە بە قەد دایك ئازیز و دڵسۆز و خەمخۆر بێ و ئاشنایەتی و خۆشەویستی نێوان (دایك و منداڵ و منداڵ و دایك) واڵا و کراوە و سنوور شکێنە. لێرەدا شاعیر ئەم خاڵــەی قۆزتوەتــەوە و کاری لەسەر کردووە.

خاڵێکی دیکە کە شاعیر داهێنەرانە کاری لەسەر کردووە، سەرچاوە و کانگای هەموو ئــەو شتانەیە کە لە هەسارەدا هەنە، بەو واتایە هەرچی تۆ دەیبینی دایکێکی هەیــە، یــان زۆر شــت کراون بە دایك، لە دەنکە خۆڵ و نیشتمان، ئەستێرە و مانگ و خۆر، کانی و ڕوبار و دەریا، باغ و چیمەن و دارستان، دڵۆپە و هەور و باران، چرۆ و غونچە و گوڵــەباغ، بــرژانگ و پێڵــو و چــاو

وبینین، هێلکه و هێلانه و باڵنده، حەرف و پیت و وشه... به واتایەکی دیکه له شیعر و دیدگای ئەو شاعیر، تێدەگەین که دایك فەرهەنگێکی سەربەخۆیه و پێناسەکانی له ئەژمار نایەن، بۆیه زۆر ئاساییه له دەقه شیعرێکی داهاتوویدا، شاعیر چەمکێکی نوێتری بۆ ئەو بونەوەره خۆشەویسته داهێنابێ.

دوایین خاڵیش ئەوەیه که جیهانی دایك یەکجار فراوانه و پیرۆزیی خۆی هەیه، بۆنموونه جیهانی هەنگ و کۆتر و نێرگز و شەماڵ و پۆل و قەڵەم و هاوڕێ و بووکەشووشه و چەتر و فرفرۆکه و کۆلاره و دیلانێ... سنووردار و دیاری کراون، تۆ وەره هەموو ئەو شیعرانه بخوێنەوه که دەربارەی (کەو) بۆ منداڵان نووسراون هەست دەکەی که بۆنوبەرامەیان زۆر لەیەك دەچێ: قاسپه قاسپ و خوێندن و خەت وخاڵی بەر سینگ و دەنووکی سوور و چینەکردن و فجۆڕ و سەرکانی و قەدپاڵ... بەڵام کاتێك سەر به جیهانی دایك دادەگریت، دەبینی سەرەڕای پێکچوونەکان مەودا و فەزایەکی کراوەی زۆر جیاوازیش هەیه.

# تــەوەرەی دووەم

## شــیکردنەوەی (دایك )

## لە دەقە شــیعرەکانی (دیوانی منداڵان)ی (لەتیف هەڵمەت)دا

*منالینە...*
*گەر موخەیەر بم لە نێوان هەڵبژاردنی*
*خۆشەویستیی ئێوە و دوایین هەناسەم*
*لە ساتەوەختی دوایین هەناسەم، پێتان دەڵێم:*
*خۆشمدەوێن*
(وتەیەك ؟)

له چنینەوە و هەڵبژاردنی ئەو دەقە شیعرانەی کە لە (دیوانی منداڵان)ی لەتیف هەڵمەتدا، کە پەیوەستن بە (دایك و دایکایەتی) و کەرەستەی خاوی ئەم لێکۆڵینەوەن، ئەم ناونیشانانەی خوارەوە دەکەینە تەوەرەی شتیەڵکارییەکەمان (پێشتریش لە بەندی سێیەم بینیتان چۆن شاعیر کاری لەسەر (دایك) کردبوو لەو تەوەرانەی کە شیتەڵکاریمان بۆ کردن:

یەك: دایك ڕابەر و پێشەنگ و مامۆستا.

دوو: دایکی نیشتمان و نیشتمانی دایك.

سێیەم: دایك و خەون و شیعری منداڵان.

چوارەم: دایك: سروشت و ژینگە.

پێنج: خۆشەویستی دایك و باوك.

شەش: دایکی گیاندار و تەیروتواران.

حەوت: دایك و گەمە و یاری و فۆلکلۆر.

هەشت: باوك لەجێی دایك.

نۆ: دایکە زەبوون و لانەوەزەکان.

( ١ )

## دایك ڕابـەر و پێشـەنگ و مامۆسـتا

یـەكێك لـە خەسـڵەتە ڕەهایـەكانی دایـك كـە خەسـڵەتێكی گەردوونییـە، تەنانـەت گیاندارەكانیش لێی بێبەش نین، ڕابەرایەتی و پێشـەنگی و مامۆسـتایەتییە، ورد دیقـەت لـە پڵینگ و شێر و سەگ بدەن چۆن بێچوەكانی خۆیان فێرە ڕاوكردن و خۆپاراستن و خـۆ گونجانـدن دەكەن. هەمیشە دایك منداڵ بە بەشێك لە جەرگی خۆی دەزانـێ، جـا ئاینـدەی گەشـی ئـەو منداڵـە خـەمی بـەردەوامی ئـەوە و هـەوڵیش دەدات بیگەیێنێتـە ترۆپكـی ئاسـوودەیی و سەرفیرازی. لێرەدا دایك ئەزموونە كەڵەكە بووەكانی خۆی، بە شكست و بـراوەی، تێكـەڵ بـە خەونەكانی خۆی دەكات و حەزدەكات ئەو مـەرام ومرازانـەی خـۆی پـێ ینتەهاتۆتـە دی لـە ئایندەی منداڵەكانیدا، وەك درێژەپێدەری تەمەنی خۆی، بیانبینێ و پێیان ئاسـوودە بـێ. لـەم دەقە شیعرانە گوێمان لە دەنگی دایكەكانە كە ئامۆژگاری و ڕێنمایی منداڵەكانییان دەكـەین، بەڵام لە ڕاستیدا دەنگەكانیان دەنگی لەتیف هەڵمەتن، بەواتایەكی دیكە ئەوە بۆتە جێگرەوەی دایكـەكان. دەكـرێ ئـەم كردەیـە بـەو ڕاڤەكردنـەی (مـارك پ. هیـدرمان Mark P. Hederman) لێكبدەینەوە كە دەڵێ:" پیاو غەدرێكی گەورە لە خۆی دەكـات كـە ڕەگـەزی خۆی بە (٥٠٪ )كۆمەڵگا دادەنێ و نیوەكەی دیكەش دەكاتە ڕەگەزی ژن. ئەو بێ ئاگایـە كـە فیسیۆلۆژییانە و سایكۆلۆژییانە و بایەلۆژییانە بەشێكی ژن لە پیاو دایە، هـیچ پیاوێـك نییـە چەند پێكهاتەیەكی ژنی تێدا نـەبێ، ئەمـەش هـەڵس و كـەوت و ڕەفتـاری ئـەو دەگـۆڕێ."

[360]کەواتە ئاساییە سۆز و سۆزداری و خۆشەویستی لەتیف هەڵمەت لە ئەوانەی دایکییەوە سەرچاوەی گرتبێ و شاعیرانە گوزارشتیان لێبکات.

شاعیر دەڵێ:

***(دایــــکم)***

***دایکم شووشەی پەنجەرەکانی شووشت***

***بەڕە و ڕاخەری ژێر پێمانی شووشت***

***دایکم هەموو ژوورەکانی شووشت***

***هەموو چینی و بلوورەکانی شووشت***

***هەموو شتە چڵکنەکانی شووشت دایکم***

***هەموو سوچ و قوژبنەکانی شووشت دایکم***

***بەخەندەوە دایکم پێی گوتین هاوینە***

***دەبێ هەموو شتێ بشۆم منداڵینە***

***دوای هات و بەدەستە نەرمەکانی***

***جل و پۆشاکی گشتمانی شووشت دایکم***

***دوای جل شتن هات بەسۆز و میهرەبانی***

***خەمی دڵی هەموومانی شووشت دایکم.*** [361]

دەقنووس منداڵەکان فێرە نەریتێکی کوردەواری دەکات، کە ئەویش لە دایکییەوە بینیویەتی، لە کوردەواریدا باوە، ساڵێ چەند جارێك دایکەکان ناوماڵیان خاوێن دەکەنەوە بە

---

[360]) Kissing the Dark Mark Patrick Hederman ١٩٩٩، Criterion Press Ltd، Dublin، Ireland P. ٦

[361]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٣٤٦ (بیرۆکەی ئەم شیعرە لەشیعرێکی فارسی وەرگیراوە.)

تایبەتی سەرەتایی هاوێنان و پاییزان، جگە لەوەی کە دەقەکە وانەیەکی پاکوخاوێنییە، ئەوە ئامۆژگارییەکی پیرۆزیشی تێدایە بۆ ژیان و ئایندە کە دەڵێ *(بەسۆز و میهرەبانی/ خەمی دڵی هەموومانی شووشت دایکم)*. خەم کراوەتە قرێژ و پیسی و پۆخڵی، ئەو تایت و سابوون و شامپۆییەی کە دەتوانێ ئەو جۆرە چڵکە بشواتەوە تەنیا (سۆز و میهرەبانییە) ئەمەیش ترۆپکی پەیامەکەی دەقنووسە. ئەو (٨) جار وشەی (دایك) و (١٠) جاریش وشەش (شووشت، بشۆم) پاتکردۆتەوە، ئەمەش هەم تا ماندووبوون و هیلاکی ئەو دایکە نیشان بدات، کە لە پێناو ئارایشتکردن و جوانکردنی ماڵەکەیان چەند ئەزیەت دەکێشێ و هەم تا هانی منداڵەکان بدات کە هەمووشتەکانی ماڵ پاك ڕاگرن.

دەقنووس دەڵێ:

***دایکم***

***دایکم گلارەی چاومە***

***هێزی دڵ و هەناومە***

***دەست چاوم دەشۆرێ***

***جل و بەرگم دەگۆڕێ***

***فێرم دەکا دڵ پاك بم***

***سەلار و هاوڕێی چاك بم***

***وانەکانم بخوێنم***

***بەنەرمی خەڵك بدوێنم***

***لە قوتابخانەو لەماڵ***

***شەڕ نەکەم لەگەڵ منداڵ***

***ڕاستگۆبم ڕەوشت جوان بم***

***دڵسۆزی کوردستان بم***

***دایە گلارەی چاومی***

***هێزی دڵ و هەناومی*** [362]

دەقنووس دەبێتە مامۆستاو هەموو ئامۆژگـاریی و ڕێنماییـەکانی دایـك بـە زاری منـداڵێك دەگێڕێتەوە. ئەو لێرەدا خۆی دایك و مامۆستا و منداڵەکەیە. دەقەکە باڵاپۆشە بە خەسـڵەت و بنەماکانی شیعری منداڵان، زمانێکی سادە و ساکار و خۆشڕەوان، دێڕەکان کورتبڕو بڕگە سـوار و پڕ ئاوازن، موسـیقای دەقەکـە لـە رتم (Rythym) و ئـاواز (Tone) و ئـاوازە ([]) و هێـز (Stress) و ترپە (Flutter)، بە هەردوو شێوە: دەنگی ناوە و دەنگـی دەرەوە، لـە حـەرف و وشە و بڕگەکانـدا بەرجەسـتەن، ئـەوە جگـە لـەو سـەروا جـوان و نەرمونیانانـەی کـە ئاسـان ئەزبەردەکرێن. قوفڵـدانی دەقەکـە بـەم (٣) سـیفەتی بـەرزی: (ڕاسـتگۆیی، ڕەوشـت جـوانی، دڵسۆزی)، خەونە مەزن و پیرۆزەکەی شاعیرە بۆ خاك و نەتەوە: *(ڕاسـتگۆبم ڕەوشـت جـوان بم/ دڵسۆزی کوردستان بم)*. سەرەتای دەقەکە منداڵەکە بۆ ئێمە دەخوێنێ، بەڵام دوای ئەو هـەموو ستایشەی دایك بە ئاماژەکردن بە (١١) لە ئامۆژگارییـەکان، ڕووی لـە دایکـی دەکـات و بـە زمانی منداڵانە شوکرانەبژێری دەکـات و پێـی دەبێـژێ: (*دایـە گـلارەی چـاومی/ هێـزی دڵ و هەناومی* ). ئەو دەڵێ:

***(کێ ئـازایە؟)***
***ناز کچێکی ڕۆشنبیرە***
***زۆر رووخۆشەو گەلێ ژیرە***
***وتی: بابە تکایە***
***تکام لە تۆشە دایە***
***بەسە باسی جادووگەر***
***کچی پەری و دێوی شەڕ***
***بەسە باسی ئازایی***

---

[362]) لەتیف هەڵمەت، دیوانی منداڵان، چ٣، چاپخانەی کارۆ، ٢٠١٣، ل ٨

*مرۆڤی لەخۆبایی*

*ئەمرۆ مامۆستاکەمان*

*بۆی گوتین چیرۆکێ جوان*

*چیرۆکی جەنگاوەرێ*

*لە دوژمن ڕادەپەڕێ*

*ئەی بابەو دایەی شیرین*

*مامۆستامان پێی وتین*

*یەکێك ئازا و سوار چاکە*

*گیان دەبەخشێ بەم خاکە*

*بەسە باسی جادووگەر*

*کچی پەری و دێوی شەڕ* [٣٦٣]

دەقنووس هاوکێشەکە پێچەوانە دەکاتەوە و منداڵەکە دەکات بە مامۆستای دایکی. لێرەدا دەبێ بگەڕێینەوە سەردەمی منداڵی لەتیف هەڵمەت، تا بزانین چۆن سەربووردەی ژیانی لە ئەزموونی شیعری خویدا بۆ پەیامێکی جوانتر تەوزیفکردوە، ئەو دەڵێ:"ماڵی ئێمە هەمووی باسی فریشتە و مەلەك و موعجیزەی پێغەمبەران و پیاو چاکان بوو... مەلاو خەڵك زۆر ڕوویان لەماڵی باوکم ئەکرد، لەگەڵ باوکما مناقەشەی دینییان دەکرد، هەمیشە من گوێگرێکی باش بووم لەناو ماڵی خۆمان، خەڵکیش دەروێشی ژن دەروێشی پیاو چیرۆك و سەرگوزشتە و داستانیان دەگێڕایەوە، من گوێم لەوانە دەگرت زۆرباشم لەبیرە پورە (ڕەعنا)یەك هەبوو دەهات بۆ ماڵمان و هەمیشە چیرۆکی گوێ ئاگردانی بۆ دەگێڕاینەوە، من زۆر لای دادەنیشتم بۆ ئەوەی گوێ لەو حیکایەتانە بگرم، یا (ئامینێك) هەبوو گوێم لێدەگرت، باجی

---

[٣٦٣]) دیوانی منداڵان، لەتیف هەڵمەت، ل ١١٩

(کافیە) یەك هەبوو، خەڵکی شاری کفری بوو دراوسێ بـوو چـیرۆکی بۆدەگێڕاینـەوە، مـن زۆر بەوردی گوێم لێدەگرتن." [٣٦٤]

شاعیر دەزانی کە ئێستاش باوان هەنە، گەرچی خوێندەوارن، منداڵـەکانیان بـە باسـی دیـۆ و درنج دەترسێنن. دیوێکی پەروەردەکاریی دەقەکە، کە دەرسە بۆ مامۆستایان، ئەوەیە، هەرکاتێ ئەوان توانیان شاگردەکانی خۆیان وا دەرسبدەن، لەماڵەوە پراکتیزەی ئەو شتانە بکەن کە لە پۆل فێرکراون، ئەوا ئەوان لە پیشەکەیاندا کەسانی سەرکەوتوون. دەقنووس دەیەوێ ئـەو پەیامـەش بگەێنێ کە ئەو منداڵێکی ڕۆبۆتی نەبووە هەرچی لەبن گوێـدا بخوێنـدرێت وەریـانگرێ. دوایـین دێڕی شیعرەکە پەیامە بلێسەدارەکەی: *(یەکێك ئازا و سوار چاکە/ گیان دەبەخشێ بەم خاکە).*

لەتیف هەڵمەت شـاعیرێکی بـە ئاگـا و خوێنـەرێکی وردبینـە، دەزانـێ یـەکێك لـە کێشـە خەفەکراوەکانی مرۆڤایەتی ئیمڕۆ، بڕینەوەی شیری مەمکی دایکـە لـە کۆرپـە و بـەکارهێنانی شیری قوتووە. بەداخەوە بە گوێرەی ڕاپۆرتەکانی ڕێکخراوی تەندروستی جیهـانی (WHO) تـا ئێستا لە هەر (٣) کورپەی ساوا دووانیان لەشیر دایکیان مەحروم دەکرێن ـ ئەمە بە گشـتییە، دەنا لە وڵاتێکی وەکو ئەمریکا لە هـەر (٢٠٠) منـداڵ یـەك منـداڵ شـیری مـەمکی دایکـی دەدرێتێ. ئەوەی جیگەی نیگەرانییە کە دایکـەکان بێئاگـان لـەوەی کـە جگـە لـەوەی شـیری مەمکی خۆیان، ساواکانیان لە دەیان نەخۆشی دەپارێزێت و مێشـك وهەسـتەوەرەکانیان باشـتر دەگەشـێنێتەوە، خـودی دایکەکـەش لەچـەندان نەخۆشـی دەپـارێزێ، بەتایبـەتی نەخۆشـی: (شـێرپەنجەی هێلکـەدان Ovarian Cancer) وە نەخۆشـییەك، کـە پزیشـکانە پێـی دەڵـێن (ئێســکپووکیOsteoporosis). جـا خــەرجی و مەســرەفی شــیرکڕین و کەرەســتەکانی و زەرەرەکانیشیان لەلایەکی دیکە. [٣٦٥]

---

[٣٦٤]) دیدەنی: هاوژین سلێوە لەگەڵ لەتیف هەڵمەت دا، ١٩/ ٣/ ٢٠١٢

[٣٦٥]) http://onlinelibrary.wiley.com/doi/10.1111/mcn.12161/full

شاعیر (٣) دەقی بە زمانی منداڵان بۆ شیری مەمکی دایك دارشتووە، کە دەکرێ یەکێکیان بە دەقێکی گەردوونی دابنرێت، مەبەست لە دەقی گەردوونی ( Cosmo or Cosmopolitan Poem) ئەو دەقە شیعرە یە کە پەیوەست نییە بە ڕەگەزێك، ناوچەیەك، خێڵ و هۆزێك، یان نەتەوەیەك، بەڵکو بۆ هەموو کەسەکان دەنووسرێت جا لەهەر کوێ بن.

شاعیر لە دەقی دووەمدا دەڵێ:

***شـــیری دایـك (٢)***

***تکایە ئەی دایە گیان***

***دایە...دایکی میهرەبان***

***شیری قوتووم مەدەرێ***

***شیری خۆتم بدەرێ***

***تۆ بتەوێ و نەتەوێ***

***شیری تۆم پێ دەکەوێ***

***گەر دەتەوێ لەش ساغ بم***

***زوو پێبگەم و هەڵچم***

***شیری قوتووم مەدەرێ***

***شیری خۆتم بدەرێ*** [٣٦٦]

بەڵام دەقی سێیەمی، گەردوونییە و دەکرێ تەرجومەی هەموو زمانەکان بکرێت وەك بڵێ شاعیر دایەگەورەیەی هەموو دایکانی جیهانە و و ئامۆژگاری کچە نۆبووکەکەی دەکات لە کاتی یەکەم زانیدا، ئەو دەڵێ:

---

[٣٦٦]) دیوانی منداڵان، لەتیف هەڵمەت، ل ١٦٨

**شـــیری دایـك (٣)**

**ئەی دایکانی گشت جیهان**

**شیری خاوێنی دایکان**

**بۆ کۆرپە تا دوو ساڵا ن**

**هەم خۆراکە و هەم دەرمان**

**بەهێز و پتەوی دەکات**

**ئاسوودەیی پێدەدات**

**لەشی گورج و گۆڵ دەکات**

**ئێسکی توند و تۆڵ دەکات**

**شیری خۆتی بدەرێ**

**شیری قوتووی مەدەرێ** [٣٦٧]

---

[٣٦٧]) دیوانی منداڵان، لەتیف هەڵمەت، ل ٢٦٩

## ( ٢ )

## دایکی نیشتمان و نیشتمانی دایك

شیعری منداڵانی نیشتمانی و نەتەوەیی لە نیوەی دووەمی سەدەی رابردووەوە عەمبازێکی گەورەی هاویشت و کەوتە گەشانەوەو درەوشانەوە، بەتایبەتی دوای دامەزراندنی کۆماری دیموکرات لە مهاباد دا لە (١٩٤٦)، هۆکاری ئەو گەشە سناندنەش دوو مژار بوو:

**یەك:** شاعیر و ڕۆشنبیران جیهانی منداڵانیان بە باشترین کایەی پەروەردەکردنی پێشکەوتووخوازانە و ئازادیخوازانە زانی، بۆیە بابەخێکی بێ ئەندازە بە سروودی نیشتیمانی دا بەتایبەتی سروودی قوتابخانەکان، ئەمە دەرگای شیعری منداڵانی والآکرد و شاعیرەکان زۆرترین دەقی شیاویان بۆ سروودەکان نووسی. لە هەموو کوردستاندا، هەرگیز سروودی قوتابییان بۆ دەسەڵاتە داگیرکەرەکانی عەرەب و فارس و تورك، لە تاریکترین و ناخۆشترین ڕۆژگاردا، نەگوتراون، هەمیشە بەسەر کورد و کوردستاندا گوتراون.

**دوو:** لەبەر خەفەکردنی دەنگی ئازادیخواز و پێشکەوتووخوازان، لە هەر چوار هەرێمی کوردستانی داگیرکراودا، هەمیشە ڕێ نەدراوە شاعیرەکان ڕاستەوخۆ دەردەدڵی خۆیان دەربڕن، جا ناڕاستەخۆیانە، لە ڕێی شیعر و (سروود)ی منداڵانەوە پەیام و خەونەکانی خۆیان دەگەیاند، ئەوەندەی ئەوان ڕووی دەمیان لە گەورەکان بوو هێندە بۆ منداڵەکان پەرێشان نەبوون، هەر بۆ نموونە، سرنجێك لە دەقی (لایەلایە)ەکەی (هەژار) بدە، هەست ناکەی ئەو شیعرە بۆ منداڵان نووسرابێ، پتر لە شیعری نێو زیندان و بەرەنگاری دەچێ، هەرواش بوو، بۆیە کاتێك

هونەرمەندی نەمر (**محەمەدی ماملی**) ئەم دەقە شیعرەی بە دەنگە بە سۆزەکەی چڕی، ڕژێمی شاهەنشاهی ئێران ئەوی زیندانی کردو سروودەکەشی یاساغکرد.

بێگومان، لەتیف هەڵمەت، وەك ئەدیبێکی بە سەلیقە، ئاگاداری قۆناغەکانی شیعری منداڵانی کوردییە، بۆیە لە شیتەڵکاریی دەقەکانیدا جیاوازیی لە ناوەرۆك و شێوازیدا بەزەقی بەدیدەکرێ. ئەو هەمیشە لە پەیامی وتاریی و ڕاستەوخۆ و ئامۆژگاری دووردەکەوێتەوە و هەوڵدەدا، لە ڕێی وێنە هونەرییەکانی تایبەت بە جیهانی منداڵان قسەی دڵی خۆی بگەیێنێ.

دەقنووس لەم ڕشتەیەدا بەرهەمێکی زۆری خستۆتە بەر دیدی منداڵان، ڕەنگ بێ ئەمە تۆخترین ڕەنگی دەقەکانی بێ، بۆچی؟ چونکە لەتیف هەڵمەت، بە شاعیری نەتەوەیی کورد ناسراوە، ئەوەند ئەو بۆ خاك و نەتەوە و ئایندە بەرهەمەکانی تەرخان کردووە، هێندە بۆ ڕشتەکانی دیکەی نەخوێندوە. کەواتە ئەمە ڕاستەوخۆ لە شیعری منداڵاندا ڕەنگیداوەتەوە.

لە ئەدەبی جیهانیدا دەستەواژەی دایکی نیشتمان و نیشتمانی دایك ڕایەڵەیەکی بەهێز و تۆکمەیە لە نێو سەرتاسەری نەتەوە و کۆمەڵگایەکاندا، بەڵام بە شێواز وگوزارشتی جیاواز. لەتیف هەڵمەت لە دوو وێنەی هونەریدا، سروشی شیعری خۆی بۆمنداڵەکان لە دەقێکدا نمایش دەکات، دەستپێك و کۆتا وشەی دەقەکە (دایك)ە، واتا بازنەیەکە بە (دایك) دەست پێدەکا و هەر بەویش دایدەخات. ئەم وەستاکارییە، مەغزادارە، سەرەتای هەموو بوونەکان دایکە و کۆتایی ئەویش کۆتایی هەموو بوونەکانە. دەشزانین دایك لە لای منداڵ چەند خۆشەویست و ڕۆحسووکە. دەقنووس دایکی کردۆتە سەنتەری خوشترین شوێن و ناسکترین وشە. لە شوێنەخۆشەکەش مەبەستی نیشتمانە و لە ناسکە وشەکەش مەبەستی دایکە، واتا نیشتمان یەکسانە بە دایك. دەکرێ ئەم دەقەشیعرە وەك دەقێکی گەردوونی ڕاڤەی بۆ بکرێت، چونکە نە نیشتمانەکە و نە دایکەکەی دەست نیشانکردووە. هەردووکیان گەردوونین: هەموو نیشتیمانەکان و هەموو دایکەکان، هیچ شوێنێکیش نییە خاڵی بێ لە منداڵ. منداڵێکی یۆنانی و بەرازیلی و ڤێتنامیش چێژ لەم دەقە وەردەگرن: ئەمەیش دەقەکەیە:

***(دایك و نیشتمان)***

***گەڕام سەرانسەری زەوی***

***پشکنیم زۆر لووتکەو نەوی***

***ئەملی شوێنێ خۆش و جوان***

***دڵگیربێ وەك نیشتیمان***

***گەڕام سەرانسەری جیهان***

***گوێم گرت لەمەلی دارستان***

***لە شنەی نوێی بەیانی***

***لە قوڵەی زیوینی کانی***

***نەمبیست وشەیە ناسك***

***وەك وشەی دەمی دایك*** [٣٦٨]

ئەو دەیەوێ تیشك بخاتە سەر (نیشتمان) و (دایك)، جا لەجیاتی ئەوەی بە بۆیەی سەرنجڕاکێش (Highlight) ڕەنگیان بکات، کێشی جیاوازی بۆ بەکارهێناون تا خۆشتر بێنە سەرزار و بەر گوێ و هەرکاتێکیش ئاوازی بۆ داندرا، ئازادییەك بە ئاوازدانەر ببەخشێ بۆ هاوسەنگی و هارمونی و خۆشئاوازی دەقەکە. بڕوانە کێشی دەقەکە:

٤ + ٤

٤ + ٣ *(ئەملی شوێنێ خۆش و جوان/ دڵگیربێ وەك نیشتیمان)*

٤ + ٤

٤ + ٤

٤ + ٣ *(نەمبیست وشەیە ناسك/ وەك وشەی دەمی دایك )*

شاعیر دەڵێ:

***(ئـاو)***

***بەدیجلەم وت: تۆ خەڵکی کوێی***

---

[٣٦٨]) دیوانی مندالان، لەتیف هەڵمەت، ل ٧٣

*ڕەنگت وا ڕوون و ڕەوانە؟*

*وتی:خەڵکی وڵاتێکم*

*کە تۆش هەر خەڵکی ئەوێی*

*دایکم ناوی چاوگەی وانە*

*وڵاتیشم کوردستانە*

*منیش وەك تۆ هەموو هیواو ئاواتێکم*

*یەکبوونەوەی نیشتمانە*

*منیش وەك تۆ بێزارم*

*لەم سنووره دەسکردانە*

*منیش وەك تۆ بێزارم*

*لە سێبەری بێگانە.* [٣٦٩]

منداڵ هەمیشە حەز لە گفتوگۆکردن و ئاخاوتن و پرسیارکردن دەکات، ئەوانەی شارەزاییان لە دەروناسی منداڵ هەیە پتر لەو نهێنییە ساکارانە تێدەگەن. دەقنووس ئەمەی کردۆتە تەکنیکێکی شیعری تا باشترین گاریگەری لەسەر مێشك و دەروونی منداڵ هەبێ. بەڕاستی دەقنووس لەم دەقەدا مەبەستی خۆی پێکاوە و زۆرترین زانیاری بە پەیامگر دەدات:

- ئاو لەباوەشی خویدا هەمووومان کۆدەکاتەوە (من، تۆ، وڵات، ژیان).
- ڕووباری دیجلە بەشێکە لە وڵاتی خۆمان.
- ئاوی ئەو ڕووبارە ڕوون و سازگارە.
- سەرچاوەی ڕووبارەکە دەریاچەی (وان)ە.
- وڵاتەکەمان ناوی کوردستانە.
- ئاواتەکان هاوبەشن لە نێوان (دیجلە و منداڵە کوردەکەدا).

---

[٣٦٩]) دیوانی منداڵان، لەتیف هەڵمەت، ل ٢٣١

- هەردووکیان بێزار و توڕەن.
- سنووری دەستکرد وڵاتەکەی تەلبەند کردون.
- وڵاتەکەیان داگیرکراوە.
- خەونی مەزنی هەردووکیان (یەکبوونەوەی نیشتمانە). ئەمـــەیش سەرباســی (The Theme) دەقەکەیە. سەرباس ئەو چەند وشەیەیە، کە کرۆکی بابەتێك، دارِشتنێك، بەرهەمێك، هونەرێك، لەخۆیدا چرِدەکاتەوە. یان دەبێتە مۆتیڤی کارێکی ئەدبی یان هونەری.[٣٧٠]

چونکە مندالّی سێ چوار سالاّن زۆر پرسن و فزولّین، دەکرێ چەندان پرسیار لەم دەقەدا هەلّێنجن. برِوانە ئەم هێلکارییە:




هێلکاریی پرسیارەکانی نێو دەقەشیعری (ئـاو)

هونەرمەنــد و شــاعیر و شانۆنووســی ئیســپانی (پــاپلۆ پێکاســۆ ١٨٨١ ـ ١٩٧٣) بــەم شێوەیەپێناسەی واقیع دەکات و دەڵێ:" هەرشتێك خەیاڵ بیهێنێتە بەرچاوت واقیعە." [٣٧١]

لەتیف هەڵمەت دەڵێ:

---

[٣٧٠] http://www.dictionary.com/browse/theme

[٣٧١] https://www.pablopicasso.org/

***(خـۆر)***

***خۆری بەیانی هەڵهات***

***ڕوونی کردەوە وڵات***

***بیری منیش زۆر ڕوونە***

***خۆرێکە پڕگەردوونە***

***دایکم پەروەردەم دەکات***

***تا دڵسۆزبم بۆ وڵات***

***منیش بەبیری چاکم***

***ڕوون دەکەمەوە خاکم***

***هەتاوەکو بمێنم***

***تۆوی چاکە دەچێنم.*** [٣٧٢]

شاعیر ئەو واقیعە خەیاڵاوییەی لە دەقێکدا داڕشتووەتەوە، کەکۆی منداڵانی جیهان دەتوانن چێژ و خۆشی و سوودی لێوەرگرن. دەقنووس ئەمجارەیان (خـۆر) و (دایـك)ی کردۆتـە هـەویری دەقەکـەی و نـانێکی بـەتام و لـەزەتی لـێ دروسـتکردووە و دەکـرێ نـاوی لـێ بنـێین (نـانی خۆشەویستی نیشتمان). وردەکارییەکە بەم شـێوەیە: دەقنـووس لـەجیاتی گـوڵ و بـاغ و ڕەز و دارگوێز و جەنگەڵ و کانی و ڕووبار، وشەی (خۆر)ی کردۆتە بونیاتی دەقەکە، چـونکە خـۆر بـە پێچەوانەی ئەوانی دیکە کە ناوچەیی و توانا سنووردارن، خاوەن ڕوونـاکی و وزە و گـەرمایی و چەندان بەخششی دیکەیە کە بۆ ژیان و بوون و بەردەوامبوون زەرورین. بوون بە خۆر یانی بـوون بە بەخشەری بوون و ژیان بە هەموو شتەکانی هەسارەکەی ئێمە. ئەوە جگەلـەوەی کـە منـداڵ هەمیشە بـە خـەیاڵی فراوانـی بـەرزدەفڕێت و خـەون و خواسـتەکانی گـەورەن. خـاڵی دووەم: دەقنووس چونکە بۆخۆی شاگردە بە ئەمەکەکەی دایکی بووە، ئاڵای ڕابەرایەتی و پێشـەنگی و دەستپێشخەری لە مامۆستا دەسێنێتەوە و ڕادەسـتی (دایـك)ی دەکـات. ئەمـەیش ئەوەنـدەی

[٣٧٢]) دیوانی منداڵان، لەتیف هەڵمەت، ل ٧٢

هاندانی ئەوانە بۆ لاساییکردنەوەی (دایك) هێندە داشکانی نرخ و پایەی ئەوان نییە. ئەوەتا کچە نووسەری ئەمریکی (نورا ك. جێمسن Nora K. Jemisin) لە ڕۆمانی (وەرزی پێنجەم)دا دەڵێ:" لە چاوی منداڵدا، دایك خوداوەندە، هەرچی دەیڵێ و هەرچی دەیکات، بە سۆزداریی و سکاڵایەکانییەوە، بە بەجەرگسۆزی و ڕقەکانییەوە، بەهێزترین هێزی ئەم گەردوونەن، هەمیشە خۆشەویستییان لێ دەچۆڕێتەوە." [٣٧٣]

ئەو خۆرەی کە ئەو منداڵە شێت و شەیدای بووە، خۆری بیرە، سەرچاوە و بەخشەری ئەو بیرەش دایکە، تیشك و گەرمایی و وزەی خۆری بیرەکە بۆ وڵات و هەموو دنیایە، کەواتە هاوکێشەکە بەم شێوەیە:




---

[٣٧٣] (The Fifith Season، Nora k. gemisin، ٢٠١٥ Orbit Books، USA، P. ٤٥ (کتێب)

دەكرێ وشەی (بەیانی) لە دێڕی یەكـەمی دەقەكـەدا وەكـو كـۆدێكی هونـەری وەرگـرین و شفرەكانی بەم شێوەیە بكەینەوە:



( ٣ )

## دایــك و خــەون و شــیعری منداڵان

دەروونناسی پسپۆڕ لە زانستیی خەون ـ ســەرۆکی پێشــووی (کۆمەڵــەی نێودەوڵــەتی بــۆ لێکۆڵینەوەی خەون ISDA)، (ڕۆبێرت وەگون Robert Waggone) لە کتێبی (خــەوبینینی ڕۆشــن Lucid Dreamimg ) ـ ٢٠٠٩ـ، زۆر لەگۆشە تاریکەکانی خەون و خــەوبینین ڕۆنــاك دەکاتەوە. وشەی (Lucid) بە مانای (ڕۆشـــن، ئاشــکرا) دێــت، بــەڵام وەك زاراوەیــەکی زانستی خەون، مەبەست لەو (خەونەیە کە خەوبین تا ڕادەیەك لێی بەئاگایە و هۆشــیارە و لەکاتی خەونبینینەکە جۆرە دەسەڵاتێکی بەسەر ڕووداو وئەکتەرەکانی خەونەکەدا هەیــە). لێکۆڵینــەوەکان جــەخت دەکەنــەوە کــە "خــەون پرۆســەیەکی فیســیۆلۆژی و دەروونــی و ئەقڵییە، سیخناخە بە سۆز و ڕەنگرێژە بە ئەزموون، ناوەرۆکەکانی بیرۆکــە و هەســتەوەری و بیرەوەریی و ژیانوێنەنە، لە بۆتەی ڕوودا و بیجمەکانی جیهانی خەون خۆیــان دەردەبــڕن، ئەم پرۆسەیە ڕۆمانێکی (واقیعێکی) نەبینراو بەرهەمدەهێنێ، کە دەکرێ وەك ئەزموون و ڕایەڵەکانی ژیان مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت." [٣٧٤]

---

[٣٧٤] (Lucid Dreaming: Gateway to the Inner Self، By Robert، Waggoner، Published by Red Wheel/Weiser، USAm 2009 m ،P. 23 (نووسەر (٤٠) ساڵە لێکۆڵینەوە لەبارەی خەون دەنووسێ و چەندان کتێبی دەربارەی خەون چاپکردووە)

ئیمڕۆ شیتەڵکارییەکانی خەون هاوتـەریب لەسـەر دوو ئاسـتدا ئەنجامـدەدرێن: ئاسـتی زانستییانەی دەماری (Neuroscientific) کە پەیوەستە بە پڕۆسەی (جوولەی خێـرای چاو REM) وە ئاستی شـیتەڵکاریی دەروونـی (Psychoanalytic) کـە سـەرقاڵە بـە لێکگرێدانی خەونـەکان بـە کەسـێتی و هـەڵس وکـەوت و مێـژووی ژیـانی خەوبینەکـە. سەرەڕای پێشکەوتنی مەزنی زانست و تەکنەلۆژی سەردەم، هێشتا زۆر لایـەنی شـاراوەی خەون ماوە تێیبگەین، دەگوترێ بۆیە خەون دەبینین تا حەز و ئارەزووەکانمـان لـە جیهـانی بێئاگاییدا وەدیبێنین. تا هێندێ کۆدی ئـاڵۆزی مێشـك بکەینـەوە. تـا ئـەوەی لـە ڕۆژدا بینیومانە لە خـەودا یـادی بکەینـەوە. هـەروەها دەگـوترێ خـەون، وەرزش و ڕاهێنـانی چارەسەرانەی دەروونە (Psychotherapy).[٣٧٥]

ئەوەی لێرەدا پەیوەستە بە لێکۆڵینەوەکەمان ئەوەیە کە:

- خەون بیرەوەری و یادەوەری لە مێشکدا جۆشدەداتەوە.
- خـەون بەئاگاهێنـەرەوەی ڕووداوە بەئاگاییـەکانی مێشـکی مرۆڤـە لـە جیهـانی بێئاگاییدا.
- خەون زۆرجار سەرچاوەیەکی بەخوڕی داهێنان و ئەفرانـدنی هونـەری و ئـەدەبی و زانستییە.
- منداڵ و پیرەکان، پتر خەون دەبیـنن و لـە نێـو ئەوانیشـدا ڕەگـەزی مێینـە پـتر خەونبینە.
- لە خەوندا هەمیشە (٣) ڕەهەندی جێگیر هەیە: ئەزموونـەکانی ئێسـتا، ڕووداوکـانی ڕۆژگاری ڕابردوو، ئامادەکاری بۆ ئایندە.[٣٧٦]

---

[٣٧٥]) دیوانی منداڵان، لەتیف هەڵمەت ، ل ٤٤

[٣٧٦]) سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٤

- خەون یارمەتیمان دەدات باشتر لە هەستەکانی خۆمان تێبگەین و بیروباوەڕ و بەهاکان باشتر هەڵبسەنگێنین و کۆدو شفرەی خەونەکان جوانتر ڕاڤەبکەین لێکدانەوەیان بۆ بکەین، بەتایبەتی کە هەنە بۆ پێشبینی و لێکدانەوەی غەیب باوەڕیان بە خەون هەیە.[٣٧٧]

لەتیف هەڵمەت، لە کۆبەرهەمە شیعرییەکەیدا، مامەڵەی لەگەڵ خەونکردووە و لە دوو سەرەوە سوودی لێوەرگرتووە: وەك مرۆڤە ئاساییەکان و وەك شاعیرێکی هەستەوەر و بەئاگا. چونکە ئەو زۆر خۆی بە جیهانی منداڵەوە سەرقاڵ کردووە، هونەری تەوزیفکردنی خەونی لە دەقەکانی شیعری منداڵان بەرجەستە کردووە. ئەوەشمان لەبیر نەچێ لە نێوان خەون و خەیاڵدا پەردەیەکی تەنك، وەك باڵی مێش هەیە، فازیل شەورۆ لە کتێبی (ڕەهەندەکانی خەون لە شیعری کوردیدا) بەم شێوەیە ئاماژەی بەم خاڵە کردووە و دەڵێ: " ئەگەر چی خەون دەرهاویشتەی پرۆسەیەکی فسۆلۆژی و سایکۆلۆژییە و بەدەر لەئیرادەی مرۆڤە، لە کاتێکدا خەیاڵ بەرهەمی پرۆسەیەکی ڕێك و پێکی مێشکە"[٣٧٨]

ئاوێتەکردنی (٣) جیهانی جیاواز لەیەك جیهانی یەگکرتووی پەیامدار، کە دەقە شیعرەکە، کارێکی ئاسان نییە ئەگەر ئەزمووندار و کارامە و بەهەرمەند نەبی زەحمەتە شاکاری ئەدەبی سەرکەوتووی لێ وەبەرهەم بینی. بە پشتبەستن بەو زانیارییانەی لەسەرەوە ئاماژەمان پێدا، دەبینین چۆن دەقنووس کاری لەسەر ئەم (٣) جیهانە کردووە:

**یەك: جیهانی سەردەمی منداڵی دەقنووس:** لێرەدا بیرەوەری و یادەوەری گرنگ و پێویستن. ئەمەشمان لەبیر نەچێ سەردەمی منداڵی دەقنووس سیخناخە بە حیکایەت و چیرۆك و بابەتی فۆلکلوری، (وەك خۆی باسی دەکات.)

---

[٣٧٧] https://www.psychologytoday.com/basics/dreaming

[٣٧٨] ڕەهەندەکانی خەون لە شیعری کوردیدا، فازیل شەورۆ، ل ٥٤

**دوو: جیهانی خەون:** ئەو جیهانە بەفراوانە بێسنوورەی کە هەموو دەرگاکانی بەڕووی شاعیردا کراوەیە .(گەرچی نازانین ئەم خەونەی لەم دەقە ئاماژەی پێدراوە، ڕاستە یان هەڵبەستراوە!)

**سێ: جیهانی خەون و خەیاڵی منداڵ:** چونکە منداڵ خەوبینێکی چالاکە لە کاتی بەئاگایی و بەخەبەریشدا زۆر خەون دەبینێ، دەقنووس کاری ئەدەبی لەسەر ئەو بنەمایە کردووە. بڕوانن فلیمەکانی کارتۆن هەموویان ڕەنگرێژن بە خەون و خەیاڵی جیهانی منداڵ.

لەم دەقەی خوارەوە پەیامگر بە ئاسانی هەر (٣) جیهانەکەی سەرەوە دەبینێ و درکیش بەوە دەکا کە دەقنووس چەندە خۆی منداڵ کردۆتەوە بۆ ئەوەی بە جوانترین شێوە پەیامەکەی بگەێنێ، هەروەك (لۆرین باکۆڵ Lauren Bacall) دەڵێ:" یا ئەوەتا من خۆم دەخەمەوە باوەشی منداڵیم، یان منداڵی بۆخۆی دێتەوە باوەشم، ئەمەش حەزە خۆشەکەی منە". [٣٧٩]

پێش ئەوەی دوو قسەش لەبارەی (دایك)ەوە بکەین، فەرموو دەقەکە بخوێننەوە:

***(نا..شەڕی سێیەمی جیهانیمان ناوێ)***

***نەنکم گێڕایەوە وتی لەکاتی شەڕی دووەمی گێتیدا***

***منداڵ بووم گوندەکەمان بۆردومان کرا و هەموومان دامان***

***بەکەژ و کێودا و هەریەکەمان لە پەنایەکدا لە ناو***

***ئەشکەوتێکدا خۆمان ماتدا و تەرتەر وەرتە بووین..***

***شەو بوو لەپەنای دار بەڕووێکدا خەوم لێکەوت***

***خەونم دی..لەخەوما پیاوێکی نوورانی ڕیش سپی***

***لە لامدا وەستا...ئەو پێکەنی و منیش پێکەنیم...***

***لێی پرسیم:***

- ***من دەناسی..؟***

---

[٣٧٩] http://www.goodreads.com/quotes/tag/dream

*وتم: نا ناتناسم..*

*وتی: من شای هەموو پەری و فریشتەکانی ئاسمانم*

*وتم: دایکم هەموو جاریٚ باسی پەری و فریشتەکانی*

*ئاسمانی بۆ دەکردم... من پەری و فریشتەکانی*

*ئاسمانم زۆر خۆش دەویٚ...*

*وتی: چی دەکەی بەتەنیا لێرە چی دەکەی..!*

*وتم: فڕۆکە گوندەکەمانی خاپوور کرد و لەو شاخ و*

*داخانەدا دەربەدەر بووین..*

*وتی: وەرە لەگەڵما دەتکەم بەکچی خۆم...دەتکەم بە*

*خانمی هەموو پەری و فریشتەکانی ئاسمان...دوو*

*شاباڵی زێڕینی درێژی مرواری ڕێژت دەدەمیٚ*

*بۆخۆت لە سەرانسەری شینایی ئاسماندا بفڕە و بڕۆڕە ناو*

*ئەو ئەستێرە گەورە و دوورانەوە کە لە زەوییەوە*

*بە چاویش نابینرێن...* [٣٨٠]

بونیاتی ئەم دەقە کۆشکێکی (٦) نهۆمییە، لە هەر نهۆمەی خەونێك دانیشتووە و بە تێکرای (٦) خەونەکە، دەقێکی خەوناوی بۆ منداڵەکە سازدەکەن. دەقێکە گەورەکانیش چێژی لیٚ وەردەگرن:

نهۆمی یەکەم: خەونی دەقنووس: گەڕانەوە بۆ بیرەوەرییەکی سەردەمی منداڵی و تەوزیفکردنی ئەو بیرەوەرییە لە کارێکی ئەدەبی مەبەستدار .*(نەنکم گێڕایەوە وتی لەکاتی شەڕی دووەمی گێتیدا)*.

(٣٨٠) دیوانی منداڵان، لەتیف هەڵمەت، ل ٢٠ ـ ٢٦

نهۆمی دووەم: خەونی نەنك: ئەم خەونەش لە سەردەمی منداڵییەوە لە هزر و زەینی ئەو داپیرە چێگیر بووە و بۆتە کەرەستەی ئەم دەقە شیعرە، (منـاڵ بـووم گوندەکـەمان بۆردومـان کـرا و هەموومان دامان/ بەکەژ و... ).

نهۆمی سێیەم: خەونی خەون: ئەمـە پەخشـانە خەونەکەیـە کـە بەڕاسـتی داپـیرە بینیوویـەتی .(*خەونم دی...لەخەوما پیاوێکی نوورانی ریش سپی...*).

نهۆمی چوارەم: خەونی دایك: لێرەدا دەقنووس، جگە لە بایەخدان بـە پایـە و مـەقامی دایـك، پێمان دەڵێ، نەنکیشی، دایکی خۆی خۆشویستووە و گوێی لێڕاگرتووە، دایکی بەسـتۆتەوە بـە پەری و فریشتەی ئاسمان، کە لە دایکییەوە ئـەو نەنکـە ئـەوانی خۆشویسـتووە. ئـەو دایکـەی دەقنووس باسی دەکات ئەو دایکی خۆیەتی، بەڵام بەمـەجاز ئامـاژەی پێـدەکات، لێـرەدا (٣) ئەلقە هەیە: داپیرە گەورە، نەنە، وە دایکی دەقنووس کە باس نەکراوە.. ئێ خـۆ دەقنـووس لـە ئاسمان نەکەوتۆتە خوارەوە، لە نێوان ئەو و ئەو نەنکەدا، حەتمەن دایـك بـوونی هەیـە .(*دایکـم هەموو جارێ باسی پەری و فریشتەکانی ئاسمانی بۆ دەکردم*).

نهۆمی پێنجەم: خەونی ئێستا: خەونی جیهانی بەئاگا. وا دونیا وێران دەبێ و جەنگی سێیەمی جیهانی بەڕێوەیە. ئەمەش ڕەهەندێکە لەو (٣) ڕەهەندەی لەسەرووەوە ئاماژەمان پێدا .(*فرۆکـە گوندەکەمانی خاپوور کرد و لەو شاخ و..*) جا ئەمە واقیعێکی ئێسـتا کوردسـتانە فرۆکـەکانی تورك و فارس و عەرەب ڕۆژانە بۆردومانمان دەکەن لە (تورکیا و ئێران و سوریا و عیراق).

نهۆمی شەشەم: خەونی منداڵەکان: دەقنووس دەیەوێ ئەو پەپوولانە لـەم دۆزەخـەی سـەر زەوی ڕزگار بکات و ئایندەیەکی خۆشییان بۆ دابین بکات، ئەو تەواو لە مرۆڤـەکان نائومێـدە، بۆیـە ئەو منداڵانە بە خەون بەو ئاسمانە وەك باڵندە بەڕەڵا دەکات .(*بۆخۆت لە سەرانسـەری شـینایی ئاسماندا بفڕە و بڕۆڕە ناو/ ئـەو ئەسـتێرە گـەورە و دوورانـەوە کـە لـە زەوییـەوە/ بـە چـاویش نابینرێن...*)

ئەو تەکنیکەی پتر منداڵەکان بە دەقەکەوە دەبەستێتەوە زمـانی دەقەکەیـە، کـە زمـانی گێڕانەوەی حیکایەتی منداڵانە، شاعیر بەتەواوی منداڵ بۆتەوە و خۆی بەیەکێك لەوان دەزانـێ، ئەوە جگە لەو زنجیرە ڕووداو و کارەکتەرانەی وەك (*شەڕی سێیەمی جیهـانی/ نـەنکم گێڕایـەوە/*

*منالّ بووم/ گوندەکەمان بۆردومان کرا/ ئەشکەوت/ پیاوێکی نووورانی ڕیش سپی/ پەری و فریشتەکانی ئاسمان../ شاباڵی زێڕین/ سەرانسەری شینایی ئاسمان/ بفرە و برۆ/ ئەو ئەستێرە گەورە و دوورانە*). جوانترین وێنەی هونەریش لە دەقەکەدا ئەمەیە (*..دوو شاباڵی زێڕینی درێژی مرواریرێژت دەدەمێ*). ڕەنگ بێ هەموو منداڵێك خۆی وادابنێ ئەوا ئەوە ئەو شاباڵانەی دەدرێتێ.

## ( ٤ )

## دایـك: سروشت و ژینــگە

(ئەلبێرت ئەنیشتاین Albert Einstein ١٨٧٩ - ١٩٥٥) دەڵـێ:" بـەوردی دیقـەت لـە سروشت بدە، دواتر باشتر لەهەموو شتەکان حاڵی دەبی و تێدەگەی."[٣٨١] سروشت و ژینگـە زوو بوونە کەرەستەی شیعری منداڵانی کورد، چونکە ئەو تەرزە شـیعرە هەمیشـە بـەدوای دیمـەن و وێنەی جوان جواندا دەگەڕێ، سروشتی کوردستانیش هـەموو جوانییـەکی لـەخۆ کۆکردۆتـەوە، بایەخدانی ئەم دواییەش بـە ژینگـە و دەوروبـەر، هۆشـیاری ژینگـەیی گەیانـدە نێـو شـیعری منداڵانیش، بەتایبەتی کە مەترسییەکانی لەبارچوون و تێکچـوونی پێکهاتـەکانی ژینگـە پـتر بوونە باسوخواسی لێکۆڵینەوە و توێژینەوەکان. شاعیری کورد، بەگشتی، وەك ڕابەر و مامۆستا لەخەمی هەموو شتەکاندایە، کەواتە ئاساییە بۆ لەتیف هەڵمەتیش، ئەم دوو جیهانە: سروشت و ژینگە، ببنە هەوێنی چەندان دەقە شیعری منداڵانی جوان. ئەمەیش ئاشـنایەتییەکی تۆکمـەتر لەنێوان دەقنووس و منداڵەکان دروست دەکات، چونکە زۆر لەو منداڵانە لە ناوەکانی خۆیانـدا، هەست بە بوونی سروشت دەکەن، گوڵەباغ و نێرگز و شەهلا و بنار و بێخاڵ و کوێستان و کـانی

[٣٨١] http://www.nobelprize.org/nobel_prizes/physics/laureates/١٩٢١/einstein-bio.html

و ڕووبار و ڕێژنه و تەرزه و تاڤگه و ڕەهێڵە و کرێوه و بەهار و هەرمێ و ترێ و چنار و ڕێگـا و دەرباز و شاخەوان و ڕێبوار... تاد. هەمووی بەشێکن لەخۆیان، که گوڵەباغ له دەقێکدا گـوێی له ناوی خۆی دەبێ، جۆره خۆشییەك دایدەگرێ. گوتراوه گوڵ ڕۆحی سروشته و تاڤگه خەمی دڵ و دەروون دەشوواتەوه، کەواته جگه له بەخشینی چێژی جـوانی، جـۆره هـێمنی و ئارامییـەکی دەروونیش به منداڵ دەبەخشێ، خۆ ژیان هەر نان و مەعریفه نییـه، بـۆنی گوڵـەباغ و گـەرمی خۆرەتا و ساردی بەفر و بۆنی خۆشی سرووه و شـەماڵیش پێویسـتن بـۆ ژیـان. "گەڕانـەوه بـۆ سروشت، واتای گەڕانەوەیه بۆبنچینەی ئینسانییەت."[٣٨٢] چونکه مرۆڤ بەشێکه لەم سروشته.

وتاربێـژی پێشـکەوتووخواز (هێنـری ورد بییجـەر Henry Ward Beecher 1813 - ١٨٨٧) دەڵێ:" هونەرمەند فڵچەکەی دەستی لـه نێـو ڕەنگـدانی ڕۆحـی خـۆی وەردەدات، تـا سروشتی خۆی له تابلۆکاندیدا بنەخشێنێ." [٣٨٣] ئەگەر فڵچەکه بکەین به قەڵەم ئەم وەسفه بـۆ شاعیریش شیاوه. لەتیف هەڵمەت دەیان دەقی سروشت ڕەنگ پۆشیی بـۆ منـداڵان نووسـیوه و سروشتی ڕۆحی خۆی تێدا نەخشاندوون. بـا بـزانین (دایـك)، سـەرقافڵه پێشـەنگەکەی لـەتیف هەڵمەت، لەم ڕشتەیەدا چ ڕۆڵ و ئەرکێکی گرۆتۆته ئەستۆ.

له شیتەڵکاریی دەقه هەڵبژاردراوەکانی ئەم بڕگەیه، دەگەینه ئەم ئاکامانه:

- دایـك ئـەرکی خزمـەتکردنی ژینگـه و جـوانکردنی سروشـتی پێـدراوه و ئـەویش جەرگسۆزانه ئەو ئەرکه جێبەجێدەکات. لێرەش هەقمانه بپرسین بـۆ شـاعیر (دایـك)ی کردۆته جیبەجێکاری ئەو ئەرکه؟

---

[٣٨٢] ) د. منصور ثروت، أشنايى با مكتبهاى ادبى، ضاث سوم، تهران: علم، ١٣٩٠، ص٨٠

[٣٨٣] ) https://www.biography.com/people/henry-ward-beecher-٩٢٠٤٦٦٢

- له خۆشی و ناخۆشییدا، له پاڵ سروشت، منداڵەکان دایکیان هەر لەبیرە و زۆرجار هانایان بۆ دەبەن یان بانگیان دەکەن.
- دەقنووس هەوڵدەدات بە حزووری دایك، دیمەن و ناوەرۆك و پەیام و ئاوازی دەقەکان دەوڵەمەندتر و ڕەنگینتر بکات.

بۆ نموونە بڕوانە، لەم دەقەی خوارەوەدا، لە جیاتی مامۆستا و باوك و هاوڕێ، منداڵەکە داوا لە دایکی دەکات، یارمەتی بدات لە چاندنی نەمامێك لە ڕۆژی جەژنی دارودرەختدا. بڕوانن چەند بە وردی دەقنووس گرنگی نەمام و درەخت چاندنی خستۆتە ڕوو و ئەرك و واجیبی منداڵەکەشی لە پەروەردەکردنی ئەو نەمامەدا نیشانداوە: دەقنووس دەڵێ:

***(جەژنی درەخت)***

***دایە جەژنی درەختە***

***بەسەرچوو سەرما و شەختە***

***با چەند نەمامێك بێنین***

***لە حەوشەدا بیچێنین***

***نەمامی هەنار و توو***

***عەرعەر و قۆخ و سەروو***

***من بەیانیان گشت دەمێ***

***تێرتێر ئاویان دەدەمێ***

***کە پەل و پۆ دەردەکەن***

***مەل لانەی لەسەر دەکەن***

***ئاسۆی بەرە بەیانی***

***پڕدەکەن لەگۆرانی***

***دایە جەژنی درەختە***

***بەسەرچوو سەرما و شەختە...!*** [384]

لە دەقێکی دیکەدا، کە لەوێشدا، دایك ئەرکی باغەوانی دراوەتیێ، (٣) جار ناوی (گوڵەباغ) پاتبۆتەوە، جوانی ئەویش شوبهێندراوە بەپێکەنینی منداڵ. جوانترین وێنەی هونەری دەقەکەش لەم سێ وشەدایە (چڵ وڵاتی گوڵە)، دەکرێ ئەو منداڵانە هەر بەو چڵانە بشوبهێندرێن. شاعیر دەڵێ:

***چڵ و وڵاتی گوڵە***
***ڕۆژێ دایکی خەڵات هات***
***گوڵە باخی گەورەی چان***
***بۆن و بەرامەی گوڵە باخ***
***خۆشی دەدا بە دەماغ***
***گوڵە باغی ڕوومەت ئاڵ***
***پێئەکەنی وەك منال...*** [385]

دەمێکە فۆلکلۆری کوردی، دیاردە سروشتییەکانی بە چەندان بار قۆزتۆتەوە و سوودی لێوەرگرتوون، بۆنموونە بەفر بارین، جگە لە ڕاو و بان ماڵینەوەو و خواردنی بەفرودۆشاو و کۆتەڵە و شێرەبەفرینە دروستکردن و چاڵەبەفر، شەڕەبەفریش زۆر باوە. بڕوانن لە گەرمەی ئەم شەڕەبەفرە خۆشەدا، منداڵەکە هاوار دەکاتە دایکی. بێگومان دەقنووس لێرەدا، دەروونناسانە کاری کردووە تا منداڵ یاری بکات و دوور بێ لە گۆشەگیری و تەنیایی و خەمۆکی. ئەو دەڵێ:

***(بەفر بارین)***
***...گورج پیاکێشە پێت ئەڵێم***
***ئای دایە گیان بناگوێم***

---

[384] ) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٧٧

[385] ) دیوانی منداڵان، لەتیف هەڵمەت، ل ٥٤

*ئەها دەستیان لەگۆ چوو*

*دەی هێرش کەن زوو بە زوو*

*ئای لەم بەفرە باریووە*

*زەوی یەك پارچە زیووە* [386]

وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، دەقنووس هێندێ جار خۆی دەکات بە منداڵ و هێندێك جاری سەردەمی منداڵی خۆیمان بۆ نمایش دەکاتەوە، ئەوەتانی، لەم دەقەدا، شاعیر باسی ئەو (زستان)ە دەکات کە کاتی خۆی ئەو دەیبینی، چونکە ئیمڕۆ ئاگردان و گێڕانەوەی چیرۆك و حیکایەتی شەوانەی دەوری ئاگردان باوی نەماوە، لێرەدا، هەست دەکەی ئەوەندەی دەقنووس شیعرەکەی بۆ حەنین و نۆستالۆژیایەکی خۆی نووسیوە هێندە منداڵانی ئەم سەردەمەی لەبیر نییە. دەکرێ ڕۆڵی ئەو (دایك)ە لێرەدا لەلایەن باوان و مامۆستاکان بۆ منداڵەکان ڕوون بکرێتەوە. دەقنووس دەڵێ:

*(زستان)*

*کاتێ من دێم بەفر دێ*

*سپی دەبێ شار و لادێ*

*مناڵ بۆکۆڵان ڕادەکەن*

*شێرەبەفرینەی تیا دەکەن*

*وێنەی لەپاڵدا دەگرن*

*بۆیادگاری هەڵیدەگرن*

*لە دوای نانخواردنی شێوان*

*دایکیان لەگوێ ئاگردان*

*چیرۆکی پێش هەزار ساڵ*

*دەگێڕنەوە بۆ منداڵ* [387]

---

[386]) دیوانی منداڵان، لەتیف هەڵمەت، ل ٣٩

له خوێندنەوەی ئەو دەقانەی سەرەوە، وتەکـەی هونەرمەنـدی ئەمــەریکی (جـەی ســتیڤ وۆندەر J. Stevie Wonder ) مان بەبیر دێتەوە کە دەڵێ:"مەزنترین مامۆستا دایکم بــوو، مامۆستای سۆز و ئەڤین و چاونەترسی. ئەگەر ئەڤین گوڵی جوانی بێ، ئەوە دایکم گوڵی جوانی ئەڤینە." [٣٨٨]

بۆیە لەتیف هەڵمەت هەقیەتی (دایك) بکاتە گوڵی جوانی ئەڤینی سروشت و ژینگە.

---

[٣٨٧]) دیوانی منداڵان، لەتیف هەڵمەت، ل ٢٢٠

[٣٨٨]) https://www.biography.com/people/stevie-wonder-٩٥٣٦٠٧٨

( ٥ )

## خۆشـەویستیی دایـك و بـاوك

نووسـەر و مامۆسـتای ئایرشـی دکتـۆر (مـارك پاتریـك هێـدەرمان Mark Patrick Hederman ١٩٤٤ ـ )، لە کتێبی (ماچکردنی تاریکی)دا دەڵێ:" ئێمە جیـاوازین چـونکە خۆمان جیـاوازین، ئەمـەیش دەرهاویشـتەی ئاوێتـە بـوونی جەمسـەرە ئاڵۆزەکـانی ژینگـە و فیسـیۆلۆژی جەسـتەی کەسـەکانە لەگـەڵ یەکتریـدا، بـە شـێوەیەك کـە گۆڕانکـاری نوێیـان خولقاندووە. جا هێندێ کەس، بە شێوەیەك لە شێوەکان، توانا و وزە و بەهرەی تێکەڵکردنی ئەو گۆڕانکارییانەیان بە خەیاڵ و سروش و سروشتەوە هەیە." [٣٨٩]

جا ئەگەر سەردەمی منداڵی، بە پاشخان و گەنجینەی بەنرخ بۆ فەرهەنگی هزری و دەروونی شاعیر دابنرێت، ئەوا دەبێ لە (٣) گۆشەنیگاوە، سرنج لە ژیاننامەی لـەتیف هەڵمـەت بـدەین، وەك خۆی باسی دەکات:

---

[٣٨٩] (Kissing the Dark، Mark Patrick Hederman، ١٩٩٩ Criterion Press Ltd، Dublin، Ireland، P. ٨٥ (کتێب)

- وەك منداڵ، لە سێبەری ماڵێكدا گەورە بووە، لێوان لێو بووە لە ڕێزگرتن و خۆشەویستی نێوان باوان و منداڵەكانیان، كەش و هەوای دینی و ئەدەبی و كوردەواری، شاعیر زۆر سوودی لەو زانیاریی و مەعریفانە وەرگرتووە.
- كۆچكردنەكەی دایكی، خاڵی وەرچەرخانی ژیانی ئەو بووە، تەنانەت دەستكردنی بە شیعر نووسین، تا ڕادەیەكی زۆر بۆ پڕكردنەوەی كەلێنەگەورەكەی ئەو كۆچە بووە، لە نامۆیی و تەنیایی و نیگەرانیدا.
- سووتانی دایكی و دواتریش مردنی بەو سووتانە، برین و سووتانێكی دەروونی لە ناخی ئەو دروستكرد، وەك لە بەندی یەكەمی ئەم كتێبە ئاماژەمان پێدا، كە ناتوانی هەرگیز ئەو بیرەوەرییە تاڵ و ناخۆشە لەبیر خۆی بباتەوە.

وەك كەسێكی بەهرەداریش، وەك خۆی باس دەكات، زوو خەسڵەت و سیماكانی لەودا بە دیار كەوتن، تا ئەو ڕادەییەی بە ئاشكرا وەك شێت سەیریان دەكرد و باسییان دەكرد .(ئەمانە بە ئاشكرا لە شیعرەكانیدا دەخوێندرێنەوە.) بۆیە هەموو ئەوانە لەتیف هەڵمەتیان كردە شاعیرێكی جیاواز.

یەكێك لە باڵاترین بابەتە گەرمەكانی دەقەكانی ئەم شاعیرە، خۆشەویستییە، نابێ ئەوەش فەرامۆش بكەین، كە دەقنووس وەك باوەڕدارێكی پاك، فەرموودەكانی خوداوەندی بە پیرۆزیی و مەزنی وەرگرتووە. ئەمەیش ڕەنگدانەوەی لە شیعری منداڵانی ئەودا هەیە.

خەسڵەتێكی دەقنووس، هەمیشە هەوڵی داوە منداڵ بكاتە مامۆستا و ڕابەر و چالاكەوان. ئەمەیش تێگەیشتنی دەقنووس نیشاندەدات لە دەروونناسی و زانستی منداڵ پەروەردەكردن.

كورد دەڵێ:" نە پێڵاوی تەنگ، نە خانەی بە جەنگ." بڕوانن چۆن شاعیر ئەم پە ندەی وا داڕێشتۆتەوە، كە منداڵەكان ئەو جەنگە بكەنە باوەشی پڕ لە ماچ و خۆشەویستی و ئارامی. ئەو دەزانێ ناتەبایی نێوان ژن و مێرد چ كاریگەرییەكی نەرێنی لەسەر منداڵ دەبێ و تا هەتایە پێوەی گرفتار دەبن، بۆیە بە زمانی منداڵەوە پەیامێكی جوان دەگەیێنێتە باونیان ـ تەنانەت بۆ مامۆستا و پەروەردەكارانیش ـ عیبرەتە.

شاعیر دەڵێ:

***(بـاوك و دایـك)***

***دایك و باوكم خۆش دەوێ***

***هەر ئەوانن خەم ڕەوێن***

***كە لەیەك تووڕە دەبن***

***تاریك دادێ ژینی من***

***كاتێ كە پێدەكەنن***

***دڵم دەكا شنە شن***

***منی منداڵ حەزدەكەم***

***ڕوویان خۆش بێ هەموو دەم***

***شادی ئەوان بدوێنێ***

***منیش خەمم نامێنێ***

***بابە گیان و دایە گیان***

***هەر دڵشادبن هەردووكتان*** [390]

دەقنووس هاوڕێیەتی بە ئەستونی خیـوەتی ئاسـوودەیی خێـزان و كۆمـەڵ دادەنـێ، ئـەو دەیەوێ خوشك و براكان، دایك و باوكەكان، پێش هەموو شتێك ژن و مێردەكان هاوڕێی یەكتری بن. ئەمەیش مانایەكی فەلسەفی قوول هەڵدەگرێ، كە هەڵبژاردەی ئارەزوومەنانـەی كەسـەكان، ئاشنا بوون و بەردەوام بوونیان خۆشترە، لە شـتە سـەپێنراوەكان. واتـا مامۆسـتایەكی هـاوڕێ

[390]) دیوانی منداڵان، لەتیف هەڵمەت، ل ١٦٥

سەرکەوتووترە لە گەڵ شاگردەکانی لە مامۆستایەکی داربەدەست. لەم دەقەی خوارەوە، ناونیشانی (هاوڕێ) کلیلی کردنەوەی زۆر دەرگای جیهانی منداڵ و خێزانە.

دەقنووس دەڵێ:

***(هاوڕێ)***
***خوشکەکەمم خۆش دەوێ***
***ئەویش بێ من ناسرەوێ***
***پێکەوە پێدەکەنین***
***دیاری بۆیەك دەگرین***
***یارمەتی دایکە دەدەین***
***سوپاسی باوکە دەکەین***
***بە بینینیان دەسرەوێین***
***وەکو یەك خۆشیان دەوێین***
***دوو منداڵی زیرەکین***
***هاوڕێی دڵسۆزی یەکین.*** [٣٩١]

بڕوانن دەقنووس زۆر هەوڵ دەدات پێگەی دایك و باوك بەرز ڕاگرێ و جوان نیشاندا، تا منداڵەکان پتر خۆشییان بووێن: (*یارمەتی دایکە دەدەین/ سوپاسی باوکە دەکەین*).

(*ئەی دایە چەند جوانی ئەی دایە/ بەتۆوە ڕووناکە ئەم هەموو دنیایە*)، ئەمە پەیامێکی جێگری هەمیشە لەسەر زاری دەقنووسە کە تەرازووی ژیان تایەکی (جوانی) و تایەکەی دیکەی (ڕووناکی)یە، ئەو کەسەی ئەو جوانییەی لەخۆ گرتووە و دەیبەخشێتەوە (دایك)ە و ئەو

---

[٣٩١]) دیوانی منداڵان، لەتیف هەڵمەت، ل ٢٢٥

(ڕووناکاییی‌ەی) لەو جوانییەوە دەدرەوشێتەوە هەموو دونیا دەگەشێنێتەوە. بەڕاستی پاتکردنەوی وشەی (دایك، دایە) (١١) جاران لە دەقێکی (٦٥) وشەییدا، نیشانەی بایەخدانی دەقنووسە بە مەزنایەتی و پیرۆزی پەیڤەکە، کە بێگومان ئەو مەبەستی دیکەی لەو ئاماژە پێکردنە زۆرە هەیە، کتومت وەك زیکرکردن و تەسبیحاتەکە وایە، تا زۆرتر زیکری خودا بکەی پتر دەڕژێتە ناخی باوڕدار، کەواتە تا زۆرتر ئەو پەیڤە جوانە لەبن گوێی منداڵ بخوێنی ئەوا پتر ئاشنا و عاشقی دایکی دەبێ، دەقنووس لە (جوانی دایك) دا دەڵێ:

***(جوانیی دایك)***

***ئەی دایە چەند جوانی ئەی دایە***
***بە تۆوە ڕووناکە ئەم هەموو دنیایە***
***بینینت دەروونم پڕ ئەکا لەشادی***
***تەماشات خۆشە وەك هەتاوی ئازادی***
***ئەی دایە دایکی خۆم ئەی دایە***
***بەتۆوە ڕووناکە ئەم هەموو دنیایە***
***ئەی دایە دایە گیان دایکی خۆم***
***بە پێڵوی چاوی تۆ سوێند ئەخۆم***
***بەلەرەی ئاوازی ناوی تۆ سوێند ئەخۆم***
***لە ڕێگای وڵاتم بسوتێنم وەکو مۆم***
***ئەی دایە چەند جوانی ئەی دایە***
***بە تۆوە ڕووناکە ئەم هەموو دنیایە.*** [٣٩٢]

لە شیتەڵکاری ئەم دەقە، چەند سرنجێکمان هەیە، کە دەبێ بگەڕێنەوە سەردەمی منداڵی شاعیر. لەم دەقەدا، شاعیر کێشی (٣ + ٣ + ٣) بەکار هێناوە کە. زۆر کەم لە شیعری منداڵان بەکار هاتووە، دەقەکە خنکاوە لە ئاوازی خۆش و دەنگی (دایك و دایە) و دووبارە بوونەوەی

[٣٩٢]) دیوانی منداڵان، لەتیف هەڵمەت، ل ٥٢

بڕگەکانی دەقەکە، ئەمەیش دەمانگەڕێنتەوە بۆ ئەو کاریگەرییە مەزنەی کە (سەعدیە) خانی دایکی لەتیف هەڵمەت لەسەر کوڕەکەی هەی بووە. لەتیف هەڵمەت بۆخۆی دەڵێ:" دایکم زۆر تەواشوحی دینی و موناجاتی دینی لەبەربوو، لەو کاتەی کە منالەکانی خۆی، ئێمەی دەخەواند لەبری (گوورگانە شەوێ) بەموناجات دەیخەواندین. ئەم شتانەش کاریگەری لەسەر دروست بوونی شاعیریەتی من هەبوو، بۆنموونە دەیوت:

**عەبدولقادر خەرقەی شینە**

**ئۆغر ئەکا بۆ مەدینە**

**لائیلاهە ئیلا (الله)**

**عەبدولقادر خەرقەی سەوزە**

**دەست نوێژ دەشوا ئا لەو حەوزە**

**لائیلاهە ئیلا (الله)."** [393]

بڕوانن لە بری پاتکردنەوەی (لائیلاهە ئیلا الله) ئەو ئەم بڕگانە دووبارە دەکاتەوە: *ئەی دایە چەند جوانی ئەی دایە/ بە تۆوە ڕووناکە ئەم هەموو دنیایە/ ئەی دایە دایکی خۆم ئەی دایە/ بەتۆوە ڕووناکە ئەم هەموو دنیایە/ ئەی دایە دایە گیان دایکی خۆم/ بە پێڵوی چاوی تۆ سوێند ئەخۆم/ بەلەرەی ئاوازی ناوی تۆ سوێند ئەخۆم/ ئەی دایە چەند جوانی ئەی دایە/ بەتۆوە ڕووناکە ئەم هەموو دنیایە).*

چەمکەکانی خۆشەویستی خاك و نەتەوە بە دایك گرێدەداتەوە. دەستەواژەی (*هەتاوی ئازادی و بسوتێنم وەکو مۆم*)، چەندان پرسیار لە مێشکی مندالدا دەوروژێنێ و لە ئێستاوە ئازادیخوازانە پەروەردەیان دەکات کە دەڵێ: (*تەماشات خۆشە وەك هەتاوی ئازادی/ لە ڕێگای وڵاتم بسوتێنم وەکو مۆم*).

---

[393] ) پەیوەندی تەلەفۆنی هاوژین سلێوە لەگەڵ لەتیف هەڵمەت، ٢٠١٧

خۆ ئەگەر چاوێك بە فەرهەنگی زمانی دایکدا بخشێنێنین دەبینی ئەم ڕستەیە هی منداڵ نییە، بەڵکو هی دایکە، دەقنووس بەئەنقەست وایکردووە منداڵەکە لاسایی دایکی بکاتەوە، یان با بڵێین قسە و دەنگ و ئاوازی خۆی پێبفرۆشێتەوە و کە دەڵێ: *(ئەی دایە دایە گیان دایکی خۆم)*، ئێمە هەروامان گوێمان لێ بووەدایکەکان دەڵێن: *(کیژەکەم، گوڵە گیان، کچی خۆم)* *یان (کوڕەکەم، بەرخە گیان، کوڕی خۆم)*. کەواتە شۆڕبوونەوی دەقنووس بۆ ناو هەردوو فەرهەنگی زمانەوانی دایك و منداڵ، لێرەدا جێگەی ستایش کردن و بەرز نرخاندنە.

## ( ٦ )

## دایکی گیـاندار و تـەیروتـواران

دەروونناس دکتۆر (هەڕۆڵد هێرزۆگ Harold Herzog) لـە ( Western Carolina University) دەربارەی پەیوەندی نێوان مرۆڤـ و گیاندارەکان دەڵێ:"من لە ژیانمدا هەمیشـە ئاشنای گیانداران بووم و پەروەردەم کردوون، لەو کەیف و خۆشییە تێدەگەم کە ئەوان بە ئێمەی دەبەخشن، بۆیە فەرزە زانایان لێکۆڵینەوەی ورد لەسەر ئەو پەیوەندییە ئەنجام بدەن و لە سـوود و قازانجەکانی بکۆڵنەوە. ناکرێ دەروونناسان هەر خەریکی ئەو بوارانە بـن کـە پەیوەسـتن بـە مرۆڤـ و مرۆڤـ. ئاشـنابوون بـە ژینگـە و ژیـانی گیانـدارەکان بایـەخ و بـەها و سـوودی بـۆ هەموومان هەیە، گیاندارەکان دڵخۆشمان دەکەن و تەندروستیشمان ساغتر دەکەن. گیانـدارەکان ڕۆڵیـــان لـــە بونیاتنـــانی ژیـــانی کـــەلتووری و دەروونـــی مرۆڤەکانـــدا هەیـــە (HumanPsychological and Cultural Life)، هـەرکاتێ لـە شـێوازی پەیوەنـدیی مرۆڤەکان بە گیاندارەکان تێگەیشتین، ئەوا لە شێوازی پەیوەندییەکانی نێوان مرۆڤـ و مرۆڤـ تێدەگەین. " [٣٩٤]

---

[٣٩٤] )The Impact of Pets on Human Health and Psychological Well-Being by Harold Herzog، Published by Association for Psychological Science، P ٢٠١١
٢٨٥(کتێب)

تەوزیفکردنی ئەو هەموو گیاندار و تەیروتوارەش لە شیعری منداڵاندا لـە لایـەن لـەتیف هەڵمەتەوە، جەختکردنەوەیە لەو بایەخ و بەهای ئەو شیعرانە، کە ئەو لە ڕێی گیاندارەکانـەوە دەیخاتـــە بەرچـــاوی هـــەمووان. ئـــەو زۆر بـــە وردی کـــاری لەســـەر زانســـتی (Anthropomorphism) کردوە، ئەو زانستە تایبەتە بە مرۆڤکردنی ئەو شتانەی کەمرۆڤـ نین، وەك گیاندار و تەیروتوار و دارودرەخت و شـاخ وداخ و ڕووبـار و مـانگ و سـتێرە...تاد) هەردوو پرۆفیسۆر (کاریۆلین ل. برووك و جۆبی ج. کۆپنهێڤیر Carolyn L. Burke Joby G. Copenhaver) لە کتێبی (ئەو گیاندارانەی وەك مرۆڤن لە ئەدەبی منداڵاندا) دەڵێن:" ئـەو زانسـتە لـە بیروبـاوەڕی کۆمەڵایـەتی و مەعریفیـدا ڕەنگدانـەوەی هەیـە، ئـەو گیاندارانـەی قسەدەکەن و بیردەکەنەوە و کار و چالاکی ئەنجام دەدەن خواست و ئارەزوو و حەزەکانی منداڵان زامن دەکەن و پەیامێکی ڕۆشنبیریشیان پێدەگەێنن. ئەگەر ئەدەبی منداڵان بۆ ئەوە بێ ئـەوان ئاسوودە بکات و بە کۆمەڵیان ئاشنا بکات و کۆسپ و تاسـەکانی سـەر ڕێگـەیان بـۆ تـەخت بکات و ڕۆڵی کاریگەریان لە بونیاتی ئایندەدا هەبێ، ئەوا ئاشناکردن و هۆگرکردنی ئەوان بـە گیاندارەکان، دەبێ بکرێنە مراز و ئامراز." [٣٩٥]

لەم برگەیەدا ـ دایکی گیـاندار و تـەیروتـواران ـ، دەبێ زێڕنگەرانە بـە حەببـە و مسـقاڵ مامەڵە لەگەڵ وشەکانی دەقە شـیعرەکاندا بکـەین، جیـا لـە تیشـك خستنەسـەر وەسـتاکاری دەقنووس لە ئیستێتیکا و هونەر و زمان و ڕەوانبێژی و شیعرییەت و پەیامەکانی، دەبێ خاڵـە جیاکەرەکانی (ئـەو)، لـەو ڕشـتەیەدا بخرێنـە ڕوو، تـا بەراوەردکارییـەکی ئـەدەبی و ڕەخنـەی هاوچەرخانە لە نێوان بەرهەمەکانی ئەو شاعیرەکانی دیکەدا بکەین.

---

[٣٩٥] ) Animals as People in Children's Literature by Carolyn L. Burke Joby G. Copenhaver، National Council of Teachers of English، ٢٠٠٤، P. ٢١٠ (کتێب)

بۆ خەستکردنەوەی بابەتەکە ـ کە لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆ هەڵدەگرێ ـ دەڵێین لە نووسینی شیعری منداڵاندا:

- لەتیف هەڵمەت قۆناغی وەسفکردن و ستایشکردن و ناساندنی گیاندارەکانی تێپەڕاندوە و لە جیاتی ئەوەی گیاندارەکان لەباوەش بکەن، ئەوا گیاندارەکانن ئەوان لەباوەش دەکەن، ئەمەیش پۆپەی ئاشت بوونەوەی ئێمەیە لەگەڵ ئەواندا. ترسان لە گیانداران و ترساندنی گیانداران لێرەدا ڕەتکراوەتەوە. کاتێك (بێکەس)لەشیعرێکی دا ئاماژەی بەوە کردووە، کە ڕێوی فێڵەکانی هێندە زۆرن، مەگەر تەڵە دەرەقەتی بێت. ئەمە وادەکات منداڵ دوژمنکاری ڕێوی بکات و هەمیشە بیریش لە فرت و فێڵ و تەفرەدانی ئەو بکاتەوە، خۆ دیمەنی تەقاندنی تەڵەکە و پێوەبوونی قاچەکانی ڕێویەکە بە تەڵەکەوە، ناخی منداڵ ڕاچەڵەکێنی و ئازاری دەدا و فێری ئەشکەنجەدانی گیاندارانی دەکات ـ هەرچەند ئێمە ڕەخنەمان لە (بێکەس) نییە، چونکە لە سەردەمی ئەودا، ئەوەندەی شیعرەکان بۆ گەورەکان نووسراون هێندە بۆ منداڵەکان نەبوون، ئەو (ڕێوی بەرانبەر بە دوژمنی کورد دادەنێ).
- دەقنووس لە زۆربەی دەقەکانیدا، لێرە بۆتە (Anthropomorphist) ـ ئەو کەسەی هونەر بە زانستدەکات ـ، بە واتایەی زمانی وەبەر گیاندارەکان هێناوە وئەوانیش وەك ئێمە قسە دەکەن و پێدەکەنن و پرسیامان لێدەکەن و پرسیارییان لێدەکەین و بە خوشك و برا و هاوڕێی خۆمانییان دەزانین. [٣٩٦] ئەگەر (تێگەیشتن لە پەیوەندی نێوان مرۆڤ و گیاندارەکان، دەروازەیەك بێ بۆ تێگەیشتنی مرۆڤەکان لە یەکدی) وەك دوو پرۆفیسۆرەکە دەڵێن، ئەوا شیعرەکانی لەتیف هەڵمەت، دیوە پراکتیزەکەی ئەو تیۆرییەیە. دەقنووس بۆخۆی دەنووسێ:"بیاجییە- دەڵێ منداڵان تاوەکو تەمەنی سیازدە چواردەساڵی وادەزانن کە هەموو

---

[٣٩٦]) لەتیف هەڵمەت لەم بارەیەوە سوودی لە هونەری حیکایەتەکانی کلیلە و دمنە وەرگرتووە. (نووسەران)

شتەکانی دەوروبەرمان گیاندارە، هەتاو خۆشی دەوێین بۆیە بەسەرماندا هەڵدێ و بەرد ڕقی لێمانە بۆیە بۆ بەرپێمان دەتلێ." [397]

- دەربارەی (دایك) لەم شیعرانەدا ـ کە کرۆکی سەرەکی لێکۆڵینەوەکەمانە ـ گەر بڵێین دایکانەی تەیروتوارەکان و دایکی گیاندارەکانی دیکە، لە سمۆرە و کەروێشك و ئاسك و کەڵەکێوی و هەسپ و ورچ و پڵینگ...تاد، هەموویان (سەعدیە خانی دایکی لەتیف هەڵمەتن)، بەراوەردکردنەکەمان ماقوول و پەسندە، چۆن؟ هەرچی ئەو خۆشەویستی و ئەمەکداری و دڵپاکی و ئەستۆپاکی و خۆنەویستی و مرۆڤدۆستییەی ئەو دایکە بە کوڕەکەی (واتا لەتیف هەڵمەت) بەخشیوو، لێرەدا جارێکی دیکە ئەو کوڕە هەموو ئەو خۆشەویستی و ئەمەکداری و دڵپاکی و ئەستۆپاکی و خۆنەویستی و مرۆڤدۆستییەی بە دایکی ئەو گیاندار و (دایکانە)ی تەیروتوارەکان بەخشیووەتەوە. ئەمەیش ڕاستگۆیی ئەو گوتەیە ساخدەکاتەوە کە دەڵێ: (ئەدەبی باڵا، ئاوێنەبەندی واقیعە.)

لە پراکتیزەکردنی ئەو شیتەڵکارییەی سەرەوە، چەند نموونەیەك دەهێنینەوە، لە دەقی *(بەچکە چۆلەکە)*، دەبینین کە لە نێو وشەکاندا (٣) دایك وجودیان هەیە، ئەوەی دیارە و وەکو خۆمان قسە و ڕەفتاری جوان دەکات، دایکی بێچوە چۆلەکەکەیە، (٢) دایکە نادیارەکەی دیکە، یەکیان دایکی شاعیرە، کە هەمان ڕەفتاری بۆ منداڵەکەی دەکرد، کە تەنیا دەبوو و لە باوەشی دەکرد و مەمکی دەدایە و دەیپاراست. دایکی سێیەمیش، دایکی منداڵەکەیە، کە ئەم شتانە دەبیستێ، باوەشی دایك و نانی دایك و سۆز و لاوانەوەی دایکی خۆی وەبیر دێتەوە و دێتە پێش چاو. لێرەدا جگە لە شاعیر (٣) کارەکتەریش قسە دەکەن: منداڵەکەی ڕووداوەکەی بینییوە و بۆمان دەگێڕێتەوە. بێچووە چۆلەکەیەکە کە دەگری و جووکەجووك دەکا، دایکانەکە کە بە دەوری منداڵەکە دەسوڕێتەوە و سوپاسی دەکات.

---

[397] ) لەتیف هەڵمەت، چۆن و چی بۆمنداڵ بنووسین،چ١، چاپخانەی کارۆ، ٢٠١١، ل ٣٦

داڕشتنی دەقەکە لە شێوەی کۆپلەی (٣) بەندیی (٧) بڕگەییدا، مۆزیك و هارمۆنی و جوولەیەکی جوان بە خوێنەر دەبەخشێ و پتر دەقەکە لە گۆرانی منداڵان دەچێ کە بە زمانی خۆیانن:

*من بەڵێنت دەدەمێ*(٤ + ٣ ) دەمێ

*دەتپارێزم گشت دەمێ* (٤ + ٣ ) دەمێ

*دان و ئاوت* دەدەمێ (٤ + ٣ ) دەمێ

ئەمەیش سەربوردەی ڕووداوە شانۆگەرییەکەیە شاعیر دەڵێ:

***(بەچکە چۆلەکە)***

***دوێنێ دەمەو ئێوارێ***

***بەچکە کێشکەی سەرداری***

***لەلانە کەوتە خوارێ***

***گریا و کەوتە جووکە جووك***

***وتم چۆلەکەی بچووك***

***مەگری ئەی بێ باڵ و تووك***

***من بەڵێنت دەدەمێ***

***دەتپارێزم گشت دەمێ***

***دان و ئاوت دەدەمێ***

***کە دایکەکەی گەڕایەوە***

***منی بینی لەلایەوە***

***بەدەورمدا سووڕایەوە***

***وتی سوپاست دەکەم***

***هەزار سوپاس هاوڕێکەم***

## ***پاراستووته بەچكەكەم*** [398]

بڕوانن لێرەدا هەم منداڵەكە بەرەو بەچكە چۆلەكەكە دەچێ و هەم دایكانەكەش بەرەو منداڵەكە دێ و كەسیان سڵ لە یەكدی ناكەنەوە و ناترسێن. ئەگەرچی وشەی (بەچكە) لە هێندێك ناوچەدا بۆ بێچوی گیاندارە چوار پەلەكان بەكار دێ (وەك بەچكەی سەگ و كەروێشك)، بەڵام لە فەرهەنگی هەمبانە بۆرینەشدا هاتووە: (بەچكە: بێچو، بەچكە باڵدار، جوجكە). [399]

پێشتریش گوتمان، دەقنووس لە شیعری منداڵانیدا، خۆی لە (ئامۆژگاریكردنی ڕاستەوخۆیانە) بەدوور دەگرێ، هەمیشە بیرۆكەكانی بە شیعر دەكات، تا باشتر و خۆشتر بە ناخی دڵ و دەروونی منداڵ دا بچێتە خوارەوە و لە یادەوەرییەكانیاندا جێگیر بێ. لەم دەقەی خوارەوە كە دایەلۆگێكی نێوان منداڵێكە لەگەڵ دایكی. دەروونناسان جەخت دەكەنەوە كە منداڵ بكەنە هاوڕێی خۆتان، ئەگەر زانی دڵی تۆی شكاندووە. زوو پەشێمان دەبێتەوە و بۆخۆی دێتەوە باوەشت. ئەمە لە پرۆسەی فێركردن و پەروەردەكردنیشدا، دروستە، كاتێك شاگرد هەستی كرد مامۆستاكەی، وەك هاوڕێیەك لێی زویر بووە، زوو دەچێ ئاشتی بكاتەوە. دەقنووس هەمان فەلسەفەی بەكار هێناوە و دەڵێ: چۆلەكەكەی سەردارەكە نایێتەوە، چونكە تۆ بەردت تێگرت ئەویش (*دڵی لێت زوویر بوو ڕۆی*). بۆیە زوو منداڵەكە لە كردارەكە لاسارەكەی پەشێمان دەبێتەوە .(*بەڵێن بێ تاكو دەمرم/ بەرد لەچۆلەكە نەگرم*) دەقنووس لە شیعری (*چۆلەكەی سەر دارەكە*) دەڵێ:

***بۆچی پێم ناڵێی دایكە***

***كوا چۆلەكەی سەردارەكە؟***

***جاران دەمەو ئێوارە***

***دەنووست لەسەر ئەم دارە***

***بەرەبەیانیش زوو زوو***

---

[398] ) دیوانی منداڵان، لەتیف هەڵمەت، ل٢٥٣

[399] ) هەنبانە بۆرینە. هەژار، ل ٩٦

***دەیچریکاند چەندێ خۆش بوو؟***

***+ چونکە بەردت هاویشت بۆی***

***دڵی لێت زوویر بوو ڕۆی***

***چۆلەکە لەجێیەك نانوێ***

***منالْ بەردی تێبگرێ***

***- بەڵێن بێ تاکو دەمرم***

***بەرد لەچۆلەکە نەگرم*** [400]

گوتمان، لە شیعری منداڵاندا، جار هەیە لەتیف هەڵمەت منداڵ دەبێتە و جار هەیە منداڵەکە دەبێ بە ئەو. ئەمەش دەقە خۆشئاوازەکەیە کە دەڵێ:

***(فـرِیـن)***

***- فڕی...فڕی کەروێشك فڕی***

***سنووری ئاسمان بڕی***

***+ کەروێشك نافڕێ، نا... نا***

***بازدەدات و رادەکا***

***- فڕی...فڕی گوڵ فڕی***

***بەرەو ئاسمان بەگڕی***

***+ گوڵ بێ باڵە نافڕێ***

***لەسەر لقی دار دەنوێ***

***- بووکەشووشەکەم دەگری***

***دەگری دەگری بۆ دایکی***

***- بووکە شووشە دایکی نییە***

***نازانێ گریان چییە.***

[400]) دیوانی منداڵان، لەتیف هەڵمەت، ل ٣٢٨

*بەدرێژایی ڕۆژ و ساڵ*

*پێدەکەنێ بۆ منداڵ*

*منداڵەکانیش دەبێ*

*ئەویان زۆر زۆر خۆش بوێ* [401]

شاعیر تەکنیکێکی تازەی بەکار هێناوە، جارێـك شـاعیر و منداڵـە و فامناکـات و پـتر خەیاڵاوی شتەکان ڕاڤەدەکات، باش دەمێکی کەم وەك ئاقڵ و بـاڵغ قسـە دەکـات و زیرەکانـە خۆی نیشاندەدات. ئەم دەقە مەتەڵئامێزە، (٢) نیشانە بە تیرێك دەپێکێ. لـە لایـەك دەرگـای خەیاڵ و خـەون بـەڕووی منـداڵان دا دەکاتـەوە و دەیانباتـەوە جیهـانی فلیمـەکانی کـارتۆن و فانتازییا: (*فڕی...فڕی کەروێشك فڕی/ فڕی...فڕی گوڵ فڕی/ بوکـە شووشـەکەم دەگـری*)، لـە لایەکی دیکە مامۆستاکان فێر دەکات، چۆن ئەم تەکنیکە لە پڕۆسەی فێرکردنی منداڵان پەیڕەو بکەن، واتا منداڵەکان بە ئاقڵتر لەخۆیان دابنێن و شتەکان پێچەوانە بکەنەوە، وەك ئەوەی بڵێ: (*٣ + ٣ = ٨*) *وانییە؟* ئەوانیش بە پێکەنینەوە دەڵێن: (*نا، دەکاتە ٦*).

لەم دەقەدا، سێبەرێکی خەماویی شاعیر دیارە، چونکە خۆی هەست بەبێ دایکی دەکات، دەیـەوێ هۆکـاری گریـانی بووکەشـووەکە، بکاتـە هینجـەت، کـە ئـەو بـۆ دایکـی دەگـری! (*بووکەشووشەکەم دەگـری/ دەگـری دەگـری بـۆ دایکـی*)، (٣) جـار دووبارەکردنـەوی فرمـانی (دەگری)، سەختی و دژواری باری دەروونی شاعیر، لە دووری دایکیدا نیشان دەدات. هەرچەندە دەیەوەێ منداڵانیش لەسەر پێکەنین و خۆشەویستی ڕایبێنێ .(*بەدرێژایی ڕۆژ و ساڵ/ پێدەکـەنێ بۆ منداڵ/ منداڵەکانیش دەبێ/ ئەویان زۆر زۆر خۆش بوێ* ).

ناونیشانی دەقەکە، (فـڕیـن)، تونێکی بەهێز و وزەیەکی شاراوەی پڕ لە سیحر و خـەیاڵی تێدایە و زۆر دەرگا و پەنجەرە لە هزر و لێکدانەوەی منداڵ دروست دەکات، لە هەمان کاتیشدا،

---

[401] ) دیوانی منداڵان، لەتیف هەڵمەت، ل ٢٤٤

شاعیر هەست بە ختووکەیەکی خۆشی دەکات، چونکە ئەو پتر خەریکی فڕینــە و دووره لەســەر زەوی قوڕاویی و لیتاویی پیس و گەندەڵ.

## ( ٧ )

## دایـك: گـەمە و یـاری و فۆلكـلۆر

"من هەر بەمندالّی لە كۆڕی شیعردا چـاوم هـەڵهێناوە و گـەورەبووم، لەگـەڵ ئەوەشـا مندالّێتی خۆمم ون نەكردووە، لەگەڵ مندالانی هاوڕێی خۆمدا هەموو جۆرە یارییەكم كـردووە، بەلام من زیاتر حەزم لە كۆلارە بوو، یەكێك بووم لەوانەی كە كۆلارەیەكی زۆر دەگمەنم دروست دەكرد و گەلیّ لە مندالانی هاوڕێم دەهاتن بۆلام و داوایان لیّ دەكردم كە كۆلارەیـان بۆدروست بكـەم، بـەلام ئـەوەی راسـتی بێـت كـۆلارەی هـیچ كەسـێكم وەكـو ئەوانـەی خـۆم دروست نەدەكرد...حەزم دەكرد كۆلارەی خۆم لە هی هەموویان چاكتربێت، وەكو چۆن ئێستا حەزدەكـەم شیعری خۆم لە شیعری هەمووان چاكتربێت، كە ئەوەش حـەقی خۆمـە، ئەوسـاش حـەقی خـۆم بوو..."[٤٠٢]

ئەو (یاری و گەمە)ی لەتیف هەڵمەت لەو دیدەنییەدا ئاماژەی پێكردووە، گەرچی هەزاران كتێبی دەربارە نووسراوە، تاكە پێناسەیەكی كۆدەنگ و یەكگرتووی نییە، كە دایكێك ئانشكی چەپەی خۆی بەرزدەكاتەو دەم و چاوی خۆی پێدادەپۆشـیّ و دەمێـك مـات و بێـدەنگ دەبـیّ و لەنكاوڕا، ئانشكی دادەگرێتـە خـوارەوە و ڕوو لـە مندالـە سـیّ سـالّییەكەی دەكـات و دەلّـیّ (چاوپش)، ئەمە بە یاری دادەندرێت، كە بە دەیان مندالّیش لە گۆڕەپانی مەكتەب بـە تۆپێـك یاری دەكەن و یەكێك دەبێتە ناوبژەوان و فیتـەیان بـۆ لێـدەدا دەبێتـە بانگـە بـانگ و هـەلّلا،

---

[٤٠٢]) ڕووبەڕوو لەگەڵ لەتیف هەڵمەتدا، دیداری: شەمیران سلێمان، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١١ ل ١٢ ـ ١٣

ئەمەیش هەر دەچـێتە فەرهـەنگی یـاریکردنی منداڵانـەوە .(پیتـەر ك. سمـیس Peter K. Smith) لە کتـێبی (زارۆك و یـاریی)دا دەڵـێ: دوو لـە خەسـڵەتەکانی یـاری دەزانـین: (١) چالاکییەکی فیزیکییە لە پێناو ڕابواردن و شۆخی و خۆشییە، (٢) کار و چالاکییەکە جددیـەتی بەڕاستی تێدا نییە." [٤٠٣]

یاریی و گەمە چالاکییەکی سروشـتییە زۆربـەی گیانـدار و تـەیروتوارەکانیش ئـەنجامی دەدەن. نامانەوەێ باسەکەمان بە سوود و قازانجەکانی ئەو چالاکییە بڕازێنینەوە، لێ دوو خـاڵی بایەخدار هەیە کە پەیوەستن بە تیۆرییە نوێیـەکانی پڕۆسـەی فێرکردنـی سـەردەم، کـە یـاری و گەمەکردنیان تێدایە، یەکەمییان تیۆری (هۆشمەندی Mibdfulness) یە، کە پتر لە خواروی ڕۆژئاوای ئاسیادا پەیڕەو دەکرێ، بۆ چالاککردن و بەهێزکردنی هزر و مێشك و خـەیاڵی منـداڵ لە ڕێی نواندنی وەرزشی یۆگاوە. "کە چالاکییەکی جەستەیی و دەروونییە لـەڕێی بیرکردنـەوەی قوول و چەند جوولەیەکی جەستەیی، ناخ و دەروون و دەرەوەی ناخ نمایش دەکات." [٤٠٤]

هەروەها (کـۆڕگرتنی ئـازادانە Brainstorming) کە چەندان خوێندکار لە پۆلێکدا لە ڕێی ئەنجامدانی چالاکی وەرزشی داهێنەرانەی تایبەت بەیەکەوە، فێرە دەرس و دەور دەکـرێن، ئەمە لە باغی ساوایانەوە تا قۆناغی زانکۆکان، دێ لە وڵاتانی ڕۆژئاوادا، پەیڕەوبکرێت. [٤٠٥]

---

[٤٠٣]) Children and Play، Peter K. Smith، Printed in Malysia، ٢٠١٠،P. ٤ (کتێب)

[٤٠٤]) Mindfulness for BeginnersHenry Talbott،CreateSpace Independent Publishing Platform، ٢٠١٦، P. ٧٢ (کتێب)

[٤٠٥])Brainstorming: Techniques for New Ideas، By Timothy R. Cory، Iuniverse، INC، ٢٠٠٣، P.١٣ (کتێب)

جا، ئاسـاییە هێنـدێك لـەو شـیعرانەی منـداڵانی لـەتیف هەڵمـەت، لـە ئاینـدەدا، لـە مەڵبەندەكانی فێركردنی لای خۆشمان، لـەم دوو پرۆسـەیە سـەردەمییانەدا پڕاكتیـزە بكرێن.لـە شیتەڵكاری وشە و چەمكی (دایك) لە شیعری منداڵاندا، دەبینین لەتیف هەڵمـەت پراكتیكانـە بە (٤) تەكنیێك یان گوزارشتی ئەدەبی بەكاری هێناوە:

- لە هێنـدێك یاریـدا دایـك دەبێتـە یـەكێك لـە یاریزانـەكانی یـاریی منداڵەكـە، بۆنموونـە لـە لایەلایەكردندا، ئەو هەر بێژەر نییە، بەڵكو چالاكی جەستەیش دەنوێنێ، كـە زمـانی جەسـتە تێیاندا زۆر ڕەوان و كاریگەرە.
- لە هێندێك یاریدا دایك تەماشاچی و هاندەر و دەستگری منداڵەكەیە.
- لە كایەی سێیەمدا، لـە ڕێـی گوزارشـتە فۆلكلورییـەكان و یارییـەكانی كوردەواریـدا، دایـك حزووری هەیە.
- هەرچی لە كایەی چوارەمە، ئەو منداڵەكەیە دەستی دایك و باوكی دەگرێ و بە چـالاكی هەمـە چەشن لە جوڵە و خەیاڵ و بیركردنەوە، ئەوان ڕادەكێشنە نێو یاری و دەقەكان.

لـە هـەر چـوار كایەكانـدا، دایـك یـاریزان و تەماشاچـی و هانـدەرێكی ڕۆحسـووك و چـالاك و وزەبەخشە.

بڕوانە لەم دەقە شیعرەدا، كە لە زمانی عەرەبییەوە كردوویەتی بە كوردی، دایـك ئەنـدامێكی بەرهەم هێنەرە و لایەلایەكەی تەنیا بۆ منـداڵی نێـو بێشـكە نییـە، پـتر بـۆ ئەوانـە دەدوێ كـە لەدەوری كۆبوونەتەوە. ئاساییە كە دەنگ و ئاواز و ریتمی لایەلایەكە منداڵانی دەوری بێشـكەكە بخاتە جوولەو ورووژاندنی دەروونی. ئەوە نییـە لـەتیف هەڵمـەت ئێسـتاش باسـی لایەلایـەكانی سەردەمی منداڵی خۆیمان بۆدەكات. دەقنووس دەڵێ:

***(لایـە لایـە)***

***ساڵ مانگی تاك تاكی دەبێ***

***هەفتە ڕۆژی تاك كاكی دەبێ***

***دایكان ڕۆڵەی وەك تۆیان***

***تاك تاك دەبێ..***

***ئازا قەلاّی خۆی دەوێ***

***چیا گولاڵەی خۆی دەوێ***

***من رۆڵەکەی خۆمم دەوێ***

***رۆڵەشم رۆڵەی خۆی دەوێ***

***گشت رۆژێك لایلایەت بۆدەکەم***

***تۆ لەسێبەر دای...من لەبەر خۆرەکەم***

***ساڵی یەك قوربانی دەکرێ***

***من گشت رۆژێ خۆم بە قوربانی تۆ دەکەم*** [٤٠٦]

کەچی لە دەقی شیعری (قوتابخانە)دا، کە دایك لە شێوەی دایکانەی چـۆلەکەیەك قسـان دەکات، یاریزان نییە، بەلاّم ژیرانە و پەروەردەکارانە ئامۆژگاری منداڵەکەی دەکات، کە لە پـاڵ یاریکردندا دەبێ فێرە مەعریفە و ئەدەبیش بێ، ئەم شیعرە بۆ ئەو منداڵەیە کە هێشتا نەچـۆتە بەر خوێندن، دەقنووس دەڵێ:

***(قوتابخانە)***

***بەچکە چۆلەکەیەك وتی***

***دایە دەچم بۆ یاری***

***دایکی گوتی تۆ گەورەی***

***هەتاکەی یاری دەکەی***

***بەچکەکە گوتی چیبکەم***

***چۆن کاتم بەسەر ببەم***

***دایکی گوتی رۆڵەکەم***

***رۆڵە نەرم و نۆڵەکەم***

---

[٤٠٦]) دیوانی منداڵان، لەتیف هەڵمەت، (لە زمانی عەرەبییەوە کردوویە بەکوردی.)

***دەتبەم بۆ قوتابخانە***

***لەناو ئەو دارستانە***

***لەویێ فێری زانین بە***

***فێری شیعر و فڕین بە*** [407]

لەم دەقەی خوارەوەدا، یاری فۆلکلۆری کوردی، فێرە منداڵان دەکرێت و دەکرێ مامۆستا لە قوتابخانەدا، یاری (هەیاران و مەیاران)یان بۆ پراکتیزە بکات و کەش و هەوای پۆلیش بگۆڕن، لێرەدا دەقنووس دایکی لەبیرنەکردوە و لەسەر زاری منداڵەکەوە، گوتەیەکی دایك کە (لایە لایە)یە دووبارە دەکرێتەوە. دەقنووس دەڵێ:

***(یـاری)***

***هەیاران و مەیاران***

***سەرانسەری کوردستان***

***پڕبێ لەگوڵی جوان جوان***

***ئەی هەورەکە گیان گیان***

***سەرانسەری نیشتمان***

***پڕکە لە گوڵی نیان***

***قەڵا قەڵا ...خودایە گیان***

***سەرانسەری کوردستان***

***پڕبێ لەخەندەی مناڵان***

***لایە لایە...لایە لایە دایە گیان***

***لە خوام دەوێ نیشتمان***

***پڕبێ لەخەندە و لە نان*** [408]

---

[407]) دیوانی منداڵان، لەتیف هەڵمەت، ل ٣٢٩

[408]) دیوانی منداڵان، لەتیف هەڵمەت، ل ٢٣٥

بڕوانه لەم یارییەدا کە لە شێوەی پرسیار و وەڵامە، باوان یان مامۆستاکان پرسیار ئارستەی منداڵان دەکەن و ئەوانیش بە کۆڕاڵ وەڵامییان دەدەنەوە، مافێکی ڕەوای دایك و باوکان کراوەتە دروشم و داواکاری منداڵەکان. پەروەردەکارانە داڕێژراوە، تێیدا خەمی هەموو منداڵ و گەورەکانی ئەم سەردەمە لە ڕێی (٥) پرسیارەوە نمایش کراون، داوکارەکانیان بریتین لە: (نان و ئاشتی بۆ گشت جیهان/ پارێزگاری باڵندەکان/ قوتابخانە بۆگوندەکان/ ئیش و کار بۆدایك و باوکان/ ئاشتی و سەربەستیمان دەوێ). ئەمەیش تەواوی دەقەکەیە:

***(پرسیار لە منداڵ)***

***چیتان دەوێ منداڵەکان***

***نان و ئاشتی بۆ گشت جیهان***

***چیتان دەوێ زارۆڵەکان***

***پارێزگاری باڵندەکان***

***چیتان دەوێ وردیلەکان***

***قوتابخانە بۆگوندەکان***

***چیتان دەوێ منداڵەکان***

***ئیش و کار بۆدایك و باوکان***

***زارۆڵەکان چیتان دەوێ***

***ئاشتی و سەربەستیمان دەوێ*** [٤٠٩]

---

[٤٠٩]) دیوانی منداڵان، لەتیف هەڵمەت، ل ٣١٢

## ( ٨ )

## دایــك و باوك له شانۆنامەی شیعری منداڵاندا

نووسەر و پەروەردەكاری ئینگلیزیی (كێن ڕۆبنسن Ken Robinson) دەڵێ:"سەدەی بیست و یەك، سەدەی پەروەردەی داهێنەرانەیە، بیركردنەوەی بەهرەدارانە و كارمانەی سبەینێ لەمرۆكەوە دەست پێدەكات، ئەمەیش لەرێی پەروەردەی داهێنەرانە زامن دەكرێت بۆ وەبەرهێنانی بیرمەندی داهێنەر و رەخنەكار لە ئایندەدا. دەبێ پرۆگرام و بەرنامەكانی خوێندن چاویان پێدابخشێندرێتەوە. دەگوترێت پەروەردە و راهێنان كلیلی ئایندەن، بەڵام دەبێ بزانین كە ئەم كلیلە بەكام لای دروستدا بسوڕێنین. ئەو بە دوو لا دەسوڕێ، لایەكییان دەرگاكان قوفڵ دەدات و سەرچاوە و زانیارییەكانت لێ بەند دەكات، بەلایەكەی دیكەیدا بسوڕێنی هەموو دەرگا و پەنجەرەكانی زانیاریت بەڕوودا واڵا دەكات. جا تا بزانینن كامە لا، لایە دروستەكەیە، دەبێ منداڵەكان فێرە پەروەردەیەك بكەین لە ئایندە ببنە داهێنەر." [٤١٠]

شانۆگەریی داهێنەرانە، یەكێكە لە چالاكییە بایەخدارەكانی ئەم تیۆرییەی (كێن ڕۆبنسن Ken Robinson)، لەتیف هەڵمەت وەك ئەدیبێكی باخەبەر و خوێنەرێكی بەسەلیقە، هەوڵی زۆرداوە كە دەقە شیعرەكانی بە شانۆنامەبكات، بەتایبەتی شیعری منداڵان. لەمەشەدا

---

[٤١٠]) Out of Our Mind: Learning to be Creative، Ken Robinson، Published by Capstone، ٢٠١١، P. ١٢٣ (كتێب)

سەرکەوتووانە هەنگاوی ناوە بەوەی شارەزایی لە هەموو پێکهاتە و یەکەکانی دەقی شانۆیی هەیە. بڕوانن لەم دەقە شانۆگەرییەدا، چۆن بنەما و کەرەستە و ناوئاخنە ئەدەبی و هونەرییەکانی ئەم ڕشتەیەی تەزیفکردوە و تیشکیشی خستۆتە سەر کەسێتی (دایك و باوك) بۆ گەیاندنی پەیامەکەی. دەکرێ ڕایەڵەکانی شانۆگەریەکە بەم شێوەیە بخەینە ڕوو:

کارەکتەرکان: منداڵێك، پۆلیسێك .(ئەکتەرەکانی پشتی پەردە: دوکاندار، پیاو، مێرووله، هاوڕێ و کەس، دایك، باوك)

شوێن: سەرشەقامێکی کوردستان.

کات: هەر کاتێك لە ڕۆژدا.

گرێچن (Plot): دروستکردنی خۆرێکی گەورە و باخچەیەکی فراوان.

شاعیر لەو دەقەدا دەڵێ:

***(خۆرێکی گەورە و باخچەیەکی فراوان)***

***منداڵێك ویستی لەشەقامێك بپەڕێتەوە...***

***پۆلیسێك تێی خوڕی***

***کوڕە هۆ چاوت کوێرە..ئەوە خەتەکەیە لەولاتەوە بۆ***

***بە قاچ دەڕۆی...؟ گوایا نازانی لێرەوە پەڕینەوە***

***قەدەغەیە..؟***

***+ ببورە ئاگام لەخۆم نەبوو بیرم دەکردەوە...***

***- بیرت لەچی دەکردەوە...؟***

***+ هەروا بیرم دەکردەوە***

***- ئەها بیرت لەوە دەکردەوە لە دوکانەکەی***

***ئەو بەرەوە چنگێ نوقڵ بدزی..؟***

***- نەوەڵا من قەت دزی ناکەم..دزی***

***کارێکی زۆر ناشیرینە دایکم دەڵێ هەرکەسێ دزی***

***بکا ئیتر کەس خۆشی ناوێ..***

*+ ئا دەزانم بیرت لەوە دەکردەوە چەقۆیەك لەو دوکانە بکڕیت و پیاوێك بکوژی..؟*

*- نەوەڵا من دڵم نایە مێرووڵەیەکیش بکوژم. بەخوا دایکم دەڵێ هەرکەسێ ئازاری هەرکەسێ بدات ئیتر لە بەرچاوی خەڵك دەکەوێ و کەس هاوڕێیەتی ناکا..*

*+ باشە دەپێم بڵێ بیرت لەچی دەکردەوە..؟*

*جا تۆ حەقت چییە..من بیر لەچی دەکەمەوە..!*

*+ پێم نەڵێی دارکاریت دەکەم*

*- ئەزانی چی؟*

*+ من ئەزانی چی و مەزانی چی نازانم..پێم دەڵێی یان..*

*- ئاخر..!.*

*+ ئاخر زوو قسە بکە تا بناگوێتم سوور نەکردۆتەوە..*

*- بیرم لەوە دەکردەوە ئاسمان ببێتە خۆرێکی گەورە و زەویش ببێتە باخچەیەکی فراوان..*

*+ کێ فێری کردی وابیر بکەیتەوە؟*

*- باوکم..*

*+ باوکت..!*

*باوکت تاوانبارە کوا لە کوێیە؟* [411]

دەقە ئاخنراوە بە جولەی شانۆگەرییانە وەك: (پەڕینەوە لە شەقام، تێی خـۆڕی، دوکانێـك بدزی، پیاوێك بکوژی، بیرم لەوە دەکردەوە...)

دایەلۆکی نێـوان منـداڵ و پۆلیسـەکە، کـە چـەفەنگاوییە، دوو شـێوازی زۆر جیـاوازن: منداڵەکە بە زمانێکی پڕ بەرائەت و شیرین و نەرم و ڕستگۆیانە قسە دەکات، پۆلیسەکەش، کە

---

[411]) دیوانی منداڵان، لەتیف هەڵمەت، ل ٢٤

ڕەمزی دەسەڵاتی دیکتاتۆرە، بە گەف و هەڕەشە و کورەشەی زۆر ناشیرینی دوور لە مرۆڤدۆستی دەدوێ.

سیمای داهێنەرانەی ئەم دەقە لە دوو ڕەهەندا دەبیندرێت:

**یەك:** هەموو دایەلۆگەکە، لەسەر بنەمای عەبەسییەت داڕێژراوە و، زۆر لە دایەلۆکی (شانۆگەری لە چاوەڕوانی گۆدۆی سومیل بێکت دەچێ) بڕوانە: (*هەروا بیر دەکەمەوە، جا تۆ حەقت چییە؟ ئەزانی چی؟ ئاخر!*)

**دوو:** گرێچنی شانۆگەرییەکە بیرکردنەوەیە لە داهێنانێکی منداڵانە، کە خۆیان حەزی لێدەکەن، دەقنووس ناڕاستەوخۆیانەش پەیامی خۆ تۆمار دەکات، کە بیرکردنەوەی منداڵەکەیە. لێرەدا دیسان منداڵە دەقنووسەکەیە.

( ٩ )

## دایکە زەبـوون و لانـەوەزەکان

(دایکـە تێریـزا Teresa. Mother ١٩١٠ -١٩٩٧)ی خێرخـواز ومرۆڤدۆسـت دەڵێ: "تەنیایی بوون و هەست کـردن بـەوەی کـە کـەس تـۆی ناوێـت و کـەنارگیر کراویـت، سەختترین و ناخۆشترین هەژارییە." [٤١٢]

بەشێکی بەهرەمەندی لەتیف هەڵمەت لـە نووسـینی شـیعردا، لـە هەڵبـژاردنی بابـەتی قەسیدەکانی دایە، ئەو لە هەرەتی لاوییـەوە هـەر حـەزی لـە لادان و سـەربەخۆیی کردۆتـەوە، سەربەخۆیی بەو مانایەی کە دەبـێ خـۆی بـێ و جیـاواز بـێ. لەڕاسـتیدا ئەمـە پاشـخانێکی سـەردەمی منـداڵی هەیـە خـاتوو (کـاتی ود مـادین Kathryn Wood Madden) زانستییانە بەم شێوەیە ئـەم دیاردەیـە ڕاڤـە دەکـات و دەڵێ:"یـەکێتی واقیعـی ( Unitary Reality) وەك زاراوەیەکی دەروونناسی، ڕاستەوخۆ پەیوەستە بە ئـەزموونی مرۆڤـەوە. بـەو واتایەی کە لە ئاکامی تاکە ڕووداوێکی تایبەتمەندی کەسییەوە، داڕووشـانێکی دەروونـی، یـان گرێیەکی دەروونی لە ناخدا دروست دەبێ، کە بەدرێژایی ڕۆژگار لە جیهانی دەروون و ڕۆحی ئەو کەسەدا چالاکانە دەمینێتە و بوونی هەیە، ئەمەیش زۆر جار دەبێتە هانـدەرێکی داهێنەرانـەی ناوەزە. کە دەستمان دەگرێ بەرەو ئەو خاڵەی لە ناو دەروونـدا هەیـە و سـایکۆلۆژییانە ناویـان

---

[٤١٢] https://www.brainyquote.com/quotes/keywords/poverty.html

لێنــاوه چــاڵی یــان کــونی ڕەش (Black Hole) یــان وەك هێنــدێك نــاوی دەنــێن (هیچــه پیرۆزەکه)". [٤١٣]

شاعیر هەرگیز بە چاوی مەمانان شتەکان نابینێ، ئەسڵەن هەرچی ئەو دەیبینی وەهمــە، ئەو بەخەیاڵ و سروش وێنەی حەقیقی ئەو وەهمە ڕەسمدەکاتەوە و نمایشی دەکات، لــه نووســینی دەقەکانیدا هەمیشە دەیەوێ ڕەچەشکێن بێ. تەنانەت بۆ منــداڵانیش نایــەوێ هــەر لــه قالبــه کلاسیکییەکاندا شیعرییان بۆ بڵێتەوە. بڕوانن چــۆن لــه دیمــەنێکی هاکــەزایی کــه ڕۆژانــه لــه شەقامی شارەکانماندا دەیانبینین، که دەقەکه هی (بیوك ملکی ١٩٦٤ ـ ) شــاعیری فارســییه، هەست و ویژدانی منداڵەکان دەورووژێنێ و بۆ کاری خێرخوازی هانیاندەدات، ئەو نایەوێ ببێته وتاربێژی سەر منبەر و پەنجە ڕاوەشێنێ و ئەرك و واجیبەکان وەبیر خەڵك بێنێتەوە. خوێنەر زوو دەزانی که ئەو دایکه و دوو منداڵەکەی بۆ کەوتونەتە سەر شەقام و چیان دەوێت. بەڵام ئــەوەی که دەقنووس تیشکی خستۆتە سەر کاردانەوە نەرێنییەکان و ویژدانە مردووەکان و خۆپەرستییه کەموێنەکانی مرۆڤەکانی ئەم سەردەمەن. بۆیه ئەوەی ڕۆحی هاریکاریی بــۆ ئــەم ســێ دامــاوه زەبوونه هەیه درەختێکه. وەستاکارییەکی هونــەری دیکــەی دەقنــووس لەوەدایــه کــه کوتــایی دەقەکه دەکاتە کۆلاج لەگەڵ هونەری فلیمی کارتۆن. منداڵان دیمــەنی بــارینی لــیرە زەردەکــانی درەختەکەیان زۆر لــەلا جوانــه و خەیاڵاوییــه، بەتایبــەتی کــه هەســت دەکــەن لــەتاو منداڵــه هەژارەکان و دایکەکە گەڵایەکانی خۆیان هەڵدەوەرێنن بەو ئومێدەی دڵیان خۆشــکەن. هونــەری کۆلاج (Collage) هونەرێکه چــەند تــوخمێکی هونــەری جیــاواز و دژبەیــەك لەگــەڵ یــەکتری ئاوێتەدەکات بەمەبەستی داهێنانی بەرهەمێکی تازە، وەك ئاوێتەکردنی وێنه و فۆتۆ و ڕۆژنامه و ئاوێنه و شیشۆق و خەڵوز... یان تێکهەکێشانی چەند دیمەنێکی ڤیــدیۆیی کونتراســت لەگــەڵ

---

[٤١٣] Dark Light of the Soul By Kathryn Wood Madden، ٢٠٠٨، Lindisfarne Book، P ٢ (کتێب)

یەکتریدا بۆ پێشکێش کردنی بەرهەمێکی نوێ. دەقنووس وەك هەمیشە لە هەڵبژاردنی ئەم دەقەشیدا، خۆی لەبەر و چینی هەژار و نەدارەکان دەبینێتەوەو حەز دەکات لەنزیکەوە پێیان ئاشنابێ، تا شاعیرانەتر خەم و خەونەکانیان دابڕێژێتەوە. فەرموون ئەمە تەواوی دەقەکەیە:

*(یارمەتی)*

***لە سوچێکی شەقامێکدا***

***دایکێکی نەخۆش و گەدا***

***شیر بە کۆرپەکەی دەدا***

***لە پاڵ ئەودا***

***منداڵێکی شەش حەوت ساڵان***

***دەستی درێژکردووە***

***داوای یارمەتی دەکا***

***لە ڕێبواران***

***لەناو هەموو ڕێبواراندا***

***تەنیا درەختێکی پیرپیر***

***یارمەتی منداڵەکە دەدات***

***ئەها ئەو درەختە پیرە***

***هەردوو چنگی منداڵەکە***

***پڕاوپڕ دەکا لەلیرە...***

***لیرە نییە لیرەی لە کوێ***

***گەڵا زەردەکانیەتی***

***بەدەم باوە هەڵدەوێ*** [٤١٤]

---

[٤١٤]) دیوانی لەتیف هەڵمەت، ل ٣٣٨ (شیعرکە هی(بیوك ملکی)یە، بەدەسکارییەوە کردوویە بە کوردی.

ئەگەرچی دەقەکە هی (بیوك ملکی) شاعیرە، بەلاّم لەتیف هەڵمەت بە زمـانی منـدالاّن کوردانییەتی، بڕوانن ئەم بڕگانە چەند لە زمانی چیرۆکی منداڵان نزیکن (*لـێرە نییـە لـێرەی لـە کوێ/ گەڵا زەردەکانیەتی / بەدەم باوە هەڵـدەوێ*). بڕوانـە لـە دەقەکـەدا ئـەو (۷) کارەکتـەر هەموویان لەژێر هەوری هەژاریدا هەڵتروو‌کاون:




## ئەنجـام
## (تایبەت بەم تەوەرەیە)

لە شیتەلکاریی دەقەشیعرەکان و بڕگەکانی ئەم تەوەرە، ئەم قامتە ئامانجانەمان چنییەوە:

- شیعری منداڵان لە ئەدەبی کوردیدا، گەرچی مێژوویەکی دووری نییە، لە دواین چارێگی سەدەی بیستەهەم کەوتۆتە گەشەساندن و خۆی نوێکردنەوە. هاوشێوەی نەتـەوەکانی دراوسـێ، چـەندان قۆناغی ئەدەبی تێپەڕاندوە و لە گۆڕانکارییەکاندا بەردەوامە.
- دەقنووس وەستایەکی دەسترەنگینی پیشەسازیی شیعری منداڵانـە، دەکـرێ وەك قۆتابخانەیـەکی تایبەت لە زمان و زمانەوانی و هونەری شیعری و بونیـاتی دارشـتن و هەڵبـژاردنی بابـەت لـەم بوارانەدا لێکۆڵینەوەی ئەکادیمییانە و هاوچەرخییانەیان بـۆ ئـەنجام بـدرێت، شـیعرەکان بـە زۆر ناونیشانی ئەدەبی و دەروونناسی و پـەروەردەکاری و جوانناسـی و بەهاناسـییەوە دەوڵەمەنـدن، بەراو و گێڵگەی بەپیت و بەرەکەتن بۆ ڕەخنەکار و نووسەران.
- لە دەقە شیعرەکانی منداڵانی ئەم شاعیرە، دەقـی گـەردوونی (Contexts Cosmopolitan) دێنەبەرچاو کە هی ئەوەن بۆ منداڵانی جیهان تەرجەمەی زمانەکان بکرێن.

- له شیتەڵکاری ئاماژە و تەوزیف و گوزارشتکردن لە (دایـك) وەك وشـە و زاراوە و چـەمك، لـە دەقە شیعرەکانی منداڵانی لەتیف هەڵمەتدا، ئەم بانێژە باسانەمان خوێندەوە:

(١) دایــك، قارەمــان و کاریکتــەر و ئەکتــەرێکی زینــدووی فریشتەئاسـا و مرۆڤدۆسـت و خزمەتگوزارە لە پێناو جوانترکردنی جوانییەکان و کاڵکردنەوەی ناشیرینییەکان.

(٢) وێنەی هـەموو دایکـەکانی دەقـە شـیعرەکان، کتومـت کـۆپی وێنـەکانی دایکـی لـەتیف هەڵمـەتن، لـە خۆشەویسـتی و ئەمەکـداری و خۆنەویسـتی و بەهابـەرزی و ڕابەرایـەتی و مرۆڤدۆستیدا. ئەمەیش سدقی ئـەدەبی لـە شـیعرەکانی ئـەودا پشـت ڕاسـت دەکاتـەوە و لاسایکردنە و پاشکۆبەندی و چاولێکەری و مشەخۆری ئەدەبی لە شیعرەکایدا ڕەتدەکاتەوە.

(٣) شاعیر، وەك کوڕی دایکێکی زەبـوون و قەڵەنـدەری دەسـتی قـەدەر، بـە سـێ شـێوە یـان دەمامك لە پشت پەردەی دەقەکاندا، دەبینرێـت: (ا) منـاڵێکی شـاعیر، (ب) شـاعیرێکی منداڵ، (ج) هەم منداڵ و هەم شاعیرێکی بالق لە هەمان کاتدا.

(٤) دایکانــەی تــەیر و توارەکــان و دایکــی گیانـدارەکان، لــە ڕێـی بەهونــەرکردنی زانسـتی (Anthropomorphism)، شاعیر، خەسڵەت و سیما و بەها جوانەکانی دایکی خۆی بـۆ ئــەو تــەیروتوار و گیاندارانــە گواســتۆتەوە، لەوێشــڕا جــارێکی دیکــە بــە منداڵــەکان بەخشراونەتەوە.

(٥) زۆر لەو دەقە شیعرانەی (دایك) تێیاندا قارەمان و ئەکتـەرە، دەکـرێ بکرێنـە کەرەسـتە و ماددەی خاوی پرۆگرامی پەروەردەی داهێنەرانەی سـەردەم، (ئەمــەیش لـە ڕێـی سـروود و شانۆگەری داهێنەرانە و پرۆگرامەکانی (هۆشمەندیی و کـۆڕگرتنی ئـازادانە.

دەکرێ ئەرك و بەرپرسییەتی ڕەخنــە و ڕەخنــەکاری ئــەدەبی بــە ئــەرك و بەرپرســییەتی شوێنەوارناسی بشوبهێنین، بەرهەمە ئەدەبییەکان ـ کە شیعر پشکێکی گــەورەی بەردەکــەوێ ـ شوێنەواراناسەکان کە مێژوو و جوگرافیای (زەمەن و مەکانێکی دیاریکراو دەستنیشان دەکــەن، دەقنووس یان دەقنووسەکان ئەو کەسانانە کە لە ڕۆژگارێکدا هەموو پاشماوە شوێنەوارییەکانیان بەرهەمهێناوەو هەر بەرهەم و دەستکرد و داهێنانێکیان بۆ مەرام و مەبەستێکی تایبەت بووە، کە لە کاتی خۆی پێویستییان پێبووە، یان سوودیان لێوەرگرتووە. پەیامگرەکانی دەقەکان (کــە خوێنەر و بیسەر و بینەران دەگرێتەوە)، ئەو زیارەتکەر و هامووشۆکەر و گەشــتیار و گەڕیدانــە دەگرێتەوە کە سەردانی پاشماوە دێرینەکان دەکەن جا چ لە هوڵکەوتــەی شــوێنوارەکە بــێ، کــە ڕەنگ بێ قەڵا و کۆشك و تەلار و خانووبەرە و شوورە و قشڵە و شار و دێ بێ یان مۆزەخانەکان بێ ـ کە دەکرێ لە جێی کتێبخانەکانیان دانێین ـ.

پاشماوەی شوێنەوارەکان، کە بە میراتی نەتەوەیی و مرۆڤایەتی حیسابدەکرێن، بــەبێ کنــە وپشکنین و گەران و سۆراغی زانستییانەی شوێنەوارناسەکان، هەمیشە یان ئەوەتا لەژێر خــاك و خۆڵ دەمێننەوە، یان وەك کەلاوەی داروبەرد بەرە بەرە لەگەڵ ڕۆژگاردا دادەڕزێن و درزدەبــەن و دەتەپن و دادەڕمێن، جا کاتێك شوێنەوارناسان ئەو پاشماوانە وەك پرتەقاڵێکی پاگژکراو دەخەنە بەر چاو و بەر دەستی گەشتکەر و زیارەتکەران، خزمەتێکی یەکجار گــەورەیانکردوە، لەلایــەك پاشماوەکانییان لە فەوتان ڕزگــارکرد و لەلایــەکی دیکــە جــۆرە زانیــاری و چــێژ و خۆشــییەکی تایبەتمەندیان بەو کەسانە بەخشیوە کە پێشتر وەدەستهێنانیان ئەستەم بووە.

جا کاتێك گەشتکەر و زیارەتکەران بەرامبەر پاشماوەی ئەو شوێنەوارانە ڕادەوەستن یان کــە لە مۆزەخانەکاندا سەرنج لە کەلوپەل و کەرەستە و ئــەنتیك و پارچــە نمایشــکراوەکانیان دەدەن، دەیان پرسیارییان بە مێشکدادێ و هەریەکەی بە گوێرەی ئاستی ڕۆشــنبیری و مــەعریفی خــۆی لێکدانەو و ڕاڤە و ڕاوبۆچوونی خۆی دەردەبڕێ، بۆیە لەزۆر لەو شوێنەوار و مۆزەخانانەی وڵاتــە پێشکەوتووەکان، کەتەلۆکو و نامیلکۆکە بە زمانە زیندووەکان داندراون، یــان بــە ڤیــدۆ و بــە

